# ئەفسانە کوردییەکان

کۆکردنەوەی

م. ب. ڕۆدینکۆ

لە فارسییەوە

کەریمی حیسامی

ستۆکهۆڵم ٢٠٠٠

# ئەفسانە کوردییەکان

کۆ کردنەوەی م.ب. ڕۆدینکۆ

وەر گێڕانی بۆ فارسی : کەریمی کشاورز

کەریمی حسامی کردوویە بە کوردی

ستۆکهۆلم ١٩٩٩

# ئەفسانە کوردییەکان

کۆکردنەوەی م. ب . ڕۆدینکۆ
وەرگێڕانی بۆ فارسی : کەریم کشاورز

کەریمی حسامی کردوویە بە کوردی

مۆنتاژ: ناسری ئیبراهیمی
لە چاپدانەوەی بە ئیجازەی خاوەنیەتی

ISBN 91-630-9217-4

ستۆکهۆڵم ١٩٩٩

## ئەفسانە کوردیيە کان
## پێشەکی وەر گێڕی ڕووسی

کوردی زمانێکی یەکگرتوو نیە، خاوەنی زاراوەی جۆر بە جۆرە کە وا هەیە لە یەکتر تێناگەن. کوردی یەکێ لە زمانە ئێرانیەکانە، کە بە درێژایی ڕۆژگار وای بە سەر هاتوە. هێندێ لە کوردەکان لە ئێران(کوردستان وکرماشان و دەور و بەری قوچان) دەژین کە نیشتمانی سەرەکی خۆیانە. هێندێکي تر لە تورکیا و عیراق و سوریا و ئەرمەنستانی سۆڤێتی دەژین. ئەم پەرش و بڵاوییە بۆتە هۆی ئەوە کە زمان و تەنانەت هێندێ داب و نەریت وکلتوری گشتی یان بکەوێتە ژێر کار تێکردنی کلتورەکانی دیکە.ئەوە خۆی لەم ئەفسانانە دا دەردەکەوێ کە خاتون م.ب.رودینکۆ لەم کتێبە دا کۆی کردوونەوە، یانی دەقی ئەسڵی ئەفسانەکە ئێرانییە لە گەڵ هێندێ پاشکۆ لە کلتورەکانیتر.

ئێستا زۆر جار ئەفسانە کوردییەکان وەک نموونەی زمان بۆ ڕوونکردنەوەی ڕێزمانی کوردی بە کار دێن. چەند کەس لە زمان ناسانی فەرانسەیی و ئەڵمانی و سویدی و ڕووس، وەک : ژاباوا، پریموا ، سوسین ، و زارۆڤ و مکوک و لسکۆ و ویکاندر و برونسل و هیتر لە گەڵ بڵاو کردنەوەی بژاردە کان و کۆکراوەکانی قسەکانی کوردی، چەند ئەفسانەشیان باس کردوون.

چەند زانایەکی کوردیش وەک حاجی جوندی و جەمال نەبەز لە «مونیخ» و هیتر دەستیان بە کۆ کردنەوەی ئەفسانە کوردییەکان کردوە و جەمال نەبەز هێندێ لە ئەفسانەکانی کردوە بە ئەڵمانیش.

خاتون م.ب. ڕۆدینکۆ ئەفسانەکانی بە شێوەی زانستی کۆ کردوونەوە. لە زمانی هێندێ کەسی وەر گرتوون کە زۆربەیان نەخوێندەوار بوون، وەک گەلێک نە خوێندەوار کە شتیان لە بیر دەمێنێ. ئەو کەسانە بریتێن لە :( مامۆ ئیشخان

سادق، سمایل سادق، زاده وەسمان، مەرالی مەهدی یڤ، عەتار شارق، عالیە جانگی، شەمیلە حەمید، شا میرزا موسا رەزا، حامۆ حەسەن، قەراخان شەرەف، خاتۆڤ، دولبەر قوربانۆوا و هیتر) ئەوانە لە ئەسڵدا لە تورکیا و ئێران بوون، کە ئێستا لە تفلیس و ئازەربایجان و ئەرمەنستانی سۆڤیەتی دەژین. هەر یەک لە وانە ئەفسانەی کوردەکانی پێش خۆیان گێراوەتەوە. بۆ نمونە: ئەفسانەی« کەربالایی فەراش» هی کوردەکانی ئێرانە. کۆ کەرەوە دەڵێ ئەم کابرایە لە رابردوو دا لە نیزیک من ژیاوە و زۆر لە پیاوە پیرەکان لە بیریانە. یا ئەفسانەی« شا سمایل و عەرەبی قولە رەش» هی کورد و ئازەربایجانی ئێرانە. خەڵکی ئازەربایجان ئەم ئەفسانەیە بە هەوای بەیت دەگێرنەوە.

نەخشی ژن لە ئەفسانە کوردییەکانی سەر سوڕ هێنەرە. مەلا مەحمودی بایزیدی نووسەری کورد کە لە سەدەی نۆزدەهەم ژیاوە لە بارەی ژنانی کوردەوە دەنووسێ:« ژنی کورد زۆر لە پیاوان ئاقلتر و باشتر و تێگەیشتووتر و ئینسانیترە. فرە روو خۆش و بە گوێ و دەست و پێ گەرمە. لە ماڵدا دەسەڵاتی تەواوی هەیە. لە شەڕدا بەشدارە و یارمەتی پیاو دەکات. ئەو هاو سەر و کار گەر و پاسەوانە و لە خەبات دا یارمەتی دەری پیاوە و لە ماڵدا یارێکی میهرەبانە.»

کوردەکان لە سەر ئەو باوەڕەن کە کامەرانی پیاو لە ژیان و حەسانەوە و لە کۆمەڵدا بەستراوەتەوە بە هاو سەر.

لە ناو ئەم ئەفسانانە دا- بۆ نمونە « ژنی ئاقڵ» و « کیژی ئاقڵ» و « ژن و مێرد» و « بالولی زاناو خەلیفەی بەغدا» و « شا سمایل و عەرەبی قولە رەش » و هێندێکی دیکە - نەخشی ئەم جۆرە ژنانە نیشاندراوە. کوردەکان هەر لەو کاتەشدا لە سەر ئەو باوەڕەن کە ئەگەر ژن خەراب بێ هەر لەم جیهانە دا جەهەندەمی پیاوە وەک ئەفسانەی « ژنی خەراب» ئەفسانە کوردییەکان وەک بەڵگە وان و بەشێکن لە کلتوری گشتی کوردەکان. لە گەڵ ئەوەش هەموویان بۆ منداڵانیش بە کار دێن.

کریم کشاورز

## چاره نووسی ئەم کتێبە

ئەم نووسراوەیەی کە وا ئێستا کەوتۆتە بەر دەستی خوێنەرانی کورد، داستان و سەر بردەیەکی سەیری هەیە.

ساڵی ١٩٧٦کە لە عیراق بووین ئەم کتێبەم بە فارسی کەوتە دەست، کاتێ خوێندمەوە دیتم ئەم ئەفسانانە بەشێکن لە کلتور و کەلەپوری کوردی و سەرنج ڕاکێشن. ئەفسانەی کوردین، زانایەکی روس بە دوایاندا گەڕاوە و کۆی کردوونەوە و ناوی هەمووی ئەو کەسانەشی تۆمار کردوە کە لێی وەر گرتوون و لە چاپی داون. نووسەری ئێرانی ئاغای کەریمی کەشاوەرز کە یەکێ لە نووسەر و وەرگێڕانی ناسراوی فارسە و بە سەر زمانی رووسیش دا زاڵە، کردوونی بە فارسی و سێ جاریش لە ئێران چاپ کراوەتەوە. زۆرم پێ حەیف بوو، ئەفسانە ی کوردی. کلتور و کەلەپوری کورد، بە زمانی بێکانە چاپ و بڵاو بکرێنەوە، بەڵام کورد خۆی نەیبێت و نەیانزانێ. خۆ ڕەنگە لە کوردستانیش ئەم جۆرە حەکایەت و ئەفسانانە پیرێژن و پیرە مێرد باسیان کرد بن، بەڵام بەم شێوەیە کۆ نەکراونەوە و لە چاپ نە دراون.

بڕیارمدا پاش تەواو کردنی وەرگێرانی کتێبی دایک ، ئەم کتێبە ش بکەم بە کوردی، با کورد خۆیشی لە بەشێکی کەلەپوری دیرینەی خۆی ئاکا دار بێت.

دەستم کرد بە وەر گێرانی . بەڵام ڕاپەڕینی گەلانی ئێران و گەڕانەوەمان بۆ نیشتمان پاش ساڵەهای ساڵ دووری و ئاوارەیی بۆم تەواو نە بوو، بە نیوە چڵی لە گەڵ خۆم هێنامەوە مەهاباد. لە مەهاباد لە بەر کاری کۆیا شۆڕشگێڕی و تێکۆشان بۆ ژیانێکی ئازاد و ئاسوودە و دوور لە چەوسانەوە و

ڕاو ڕاوێنی دەزگای سەر کوتکەری ئازادی، تا لە مەهاباد بووم وێرا نە گەیشتم تەواوی بکەم. پاشان کاتێ ئیمام خومەینی بە قەولی مام جەلال:« کارێکی گرنگ و چاکەیەکی گەورەی کرد بۆ چارەی سیاسی کوردەکانی ئێران» و بە قەولی منیش « فتوای خەزای دا دژی میللەتی کوردی موسڵمان و بە تانگ و تۆپ و تەیارە» وە شاخی خستین، لە چیا بە بەر کاری دیکەی پێ سپێردراو، درێژەم بە وەرگێڕانی کتێبە دا و کردم بە کوردی. پاشان ناردم بۆ دۆستی خۆشەویستم کاک ئەحمەدی شەریفی بە لکوو بتوانێ بە چاپی بگەیەنێ. پاش بەینێک بۆی نووسیم کە ئاغای سەیدیان، خاوەنی چاپخانەی سەیدیان لە مەهاباد. گوتوویە ئەگەر ناوی کەریمی حسامی لە سەر بێ، ناوێرێ چاپی بکات. لە وەڵام دا بۆم نووسی: با ناوی منی لە سەر نەبێ و بە هەر ناوێک بێ با چاپ بکرێ . مەبەستم تەنیا ئەوەیە ئەم کتێبە بکەوێتە بەر دەستی خوێنەرانی کورد و گۆشەیەک لە کتێبخانەی کوردی پڕ کاتەوە. ساڵ و زەمان تێپەڕین و کتێب هیچ خەبەری نە بوو. فارسیەکەشم نە ما بوو کە جارێکی دیکەش بیکەمەوە بە کوردی و بڵاوی کەمەوە.

لە ١٩٨٦/٤/٢٤نامەیەکی کاک ئەحمەدی شەریفی - م پێگەیشت نووسیبووی:« بە داخەوە پێتان ڕادەگەیێنم کە شەوی پێنج شەمووی ٨٦/٤/١٧ لە ورمێ مام هێمن کۆچی دوایی کرد و تەرمەکەیان لە مەهابادێ لە گۆڕستانی بوداق سوڵتانی تەسلیم بە خاک کرد و لە ورمێ- مەهاباد- بۆکان - سنە - کرماشان و تارانێ مەجلیسی سەرە خۆشیمان بۆ دانا .

بەڵام سەبارەت بە کتێبەکەت( ئەفسانە کانی کوردی) دەبێ عەرزت بکەم فۆرم بەندی چاپی کراوە و ڕەنگە هەتا هاوینێ یان پایزێ لە چاپ بێتە دەرێ. براتان ئەحمەد شەریفی.»

مزگێنییەکی فرە خۆش بوو، بە تاسەوە چاوە ڕوانبووم کە خەبەری چاپ و بڵاو بوونەوەی کتێبەکەم پێبگات. پشت بەستن بە نامەی کاک ئەحمەدی شەریفی و بڕوا بە چالاکی ئەو لە مەیدانی نووسین و بڵاو کردنەوە دا، منیش لە ڕیزی ئەو کتێبانەی کە کردوومن بە کوردی هەمیشە ناوی « ئەفسانە

کوردییەکان» یشم نووسیوە. گەلێک لە دۆست و برادەرن و کتێبفرۆشی کوردیش لە سوید داوایان لێکردووم کە ئەو کتێبەیان بۆ بنێرم ، بەڵام بە داخەوە ئەوە گەیشتووینە ساڵی ۹۹۹ نەک هەر کتێب، بەڵکوو هەر خەبەرێکیشم لەم بارەوە پێ نەگەیشت. تا ئەسعەدی خوارزام کە دەبێ سوپاسی بکەم، لە ئێرانەوە فارسی ئەو کتێبەی بۆ ناردم . بە ڕاستی گەلێکی پێ شاد بووم و بڕیارمدا جارێکی دیکەش بیکەم بە کوردی ، بەڵکوو توانیبێتم لەم ڕێگایەوە خزمەتێکی بچوکم بە کلتور و کەلەپووری کوردی کرد بێت. بەو هیوایە ببێتە پەسندی هۆگرانی زمان و کلتوری ڕەسەنی کوردی.

کەریمی حسامی

## پێرستی ئەفسانە کان

# ئەفسانەکانی لە مەڕ جانە وەران


١- گورگ و مەڕ
٢- ڕێوی و کۆتر و کەڵە شێر
ئەفسانە گەلی ژیانی ڕۆژانە
٣- مەکری ژنان
٤- کیژۆڵەی ئاقل
٥- مێرد و ژن
٦- ژنی ئاقڵ
٧- ژنی خەراب
٨- ژنی بە مەکر
٩- ژن و مێرد
١٠- دوو مەلا
١١- دوو خوشک
١٢- عادەت ( خو ورەوشت)
١٣- سمایل چاوەش
١٤- کیژی ئاقڵی پاشا
١٥- قچاقچی ساختە
١٦- سێ دۆست
١٧- دوو جیران
١٨- دوو دۆست
١٩- سێ پەند
٢٠- ئاخر پێم نە گوتی

٢١- سێ دۆست
٢٢- داندۆی فێڵه زان
٢٣- چۆن بخوازی ئاوا دەژی
٢٤- بازرگان
٢٥- ئەحمەد و گوڵزار
٢٦- چاکە و خەرابە
٢٧- دوو کوێر
٢٨- محەممەد
٢٩- سێ ئەحمەد
٣٠- نۆکەری ئاقڵ
٣١- ئەحمەد پاشا
٣٢- محەممەد پاشا و وەزیرەکەی
٣٣- بالولی زانا و بازرگان
٣٤- چۆن بالوڵ فێڵی لە حاجی بە تەماع کرد
٣٥- بالوڵی زانا و خەلیفە
٣٦- ستام و لغاوی خەراب
٣٧- دەرمانی موجیزە کەر
٣٨- چۆن دەکرێ عزرائیل بدۆزیەوە
٣٩- کەربەلایی فەراش و دزەکان
٤٠- ئەسیب

**ئەفسانە گەلی سیحر و جادوو**

٤١- ئەحمەد خان و عەلی وەلی
٤٢- بالولی زانا و خەلیفەی بەغدا
٤٣- حەسەنی حەکیم
٤٤- پەندی حەکیمانە
٤٥- ئەقڵ و بەخت

٤٦- وەستا ئوسیپ
٤٧- ماسی بۆ پێکەنی
٤٨- دوو زڕ برا
٤٩- میرزا مەحمود و هەزار بلبل
٥٠- رۆستەمی زاڵ
٥١- شا سمایل و عارەبی رەش
٥٢- تلیِ- هەزار
٥٣- گوڵبرین
٥٤- دەروێش
٥٥- حەوت برا
٥٦- میرزا مەحمود
٥٧- محەممەد و موقەددم
٥٨- کوری ئاسنگەر
٥٩- پاشا و وەزیر
٦٠- هند باد
٦١- ئینسانی روخسار کورک

# ئەفسانەی لە مەڕ جانەوەران

## گورگ و مەڕ ١

ڕۆژێکی پایز مەڕێک لە مێگەل بە جێ ما و لە لێرەوار دا بزر بوو. لە دۆلێکدا پەنایەکی نارامی دیتەوە و لە وێدا دەژیا. لە بەهاردا بەرخێکی بوو. ئیتر بە تەنیا نەبوو لە گەڵ بەرخۆلەکەی دەلەوەڕا. ڕۆژێک لە پڕ گورگێک لە مێشە هاتە دەر و بانگی کرد و گوتی :

– کێ ڕێگای بە ئێوە داوە لە ملکی من بلەوەڕێن؟

مەڕ پاڕاوە و گوتی بۆ خاتری خوا. من هەموو زستانێ لێرە ژیاوم، قەت گورگێکم نەدیوە. ئێستا بۆ ئێرە بوو بە ملکی تۆ.؟

گورگ گوتی : من شایەدم هەیە کە ئێرە ملکی منە.

– **شایەدت کێیە؟**

– ڕێوی

– باشە بیهێنە بزانم شایەدیت بۆ دەدا یان نا؟

گورگ چوو ڕێوی بێنێ، مەڕیش چوو شایەد بدۆزێتەوە. تووشی سەگ هات و تکای لێکرد:

– گورگ تەنگی پێ هەڵچنیوم و دەستم لێ هەڵناگرێ. لە بیانوو دەگەڕێ کە بەرخەکەم بخوات. دەڵێ :« چۆن وێراوتە لە ملکی مندا هاتو چۆ بکەی؟ ڕێویشی بە شایەد گرتوە. دەستم بە داوێنت یارمەتیم بدە. بزانم چیبکەم؟

سەگ گوتی – لە گەڵ من وەرە.

چوونە ئەو مێرگە ی کە گورگی لێ بوو. سەگ گوتی: من لە پشت ئەم دارانە خۆ دەشارمەوە. تۆ بە گورگ بێژە کە بڕوا بە هیچ کامتان ناکەم. مەگەر

سوێند بە وەجاخی من بخوی. بڵێ وەجاخی من لە بن ئەو دارانەیە. کە هاتن و ویستی سوێند بخوا، من دەیانخنکێنم.

گورگ و رێوی هاتنەوە. گورگ گوتی:

- ئەوەتا شاهیدم هێناوە.

رێوی گوتی: بەڵێ ڕاستە و ئێرە ملکی گورکە.

مەڕ گوتی: بڕواتان پێناکەم تا سوێند بە وەجاخی من نەخۆن. وەرە سوێندم بۆ بخۆ، بەرخەکەمت دەدەمێ. لە مێشە نیزیک بوونەوە رێوی تروسکەی چاوی سەگی دێت و گوتی:

- نا. وەجاخی تۆ پیرۆزە. من ناوێرم سوێندی پێ بخۆم. خۆتان رێک کەون.

مەر بە گورگی گوت: « بزانە رێوی سوێندی نەخوارد، کە وابوو ئێرە ملکی تۆ نیە.

گورگ گوتی: رێوی ترسەنۆکە. خۆم دێم سوێند دەخۆم. کە لە مێشە نیزیک بوونەوە، سەگ هاتە دەر و گەروی گورکی گرت.

گورک بە بڵغە بلغ گوتی: راستە وەجاخت پیرۆزە. ئێرە ملکی من نیە. بیانوم پێ دەگرتی تا بەرخەکەت بخۆم.

سەگ بەریدا و گورگ هەڵات. سەگ و مەڕ و بەرخ چوونەوە کن خاوەنەکەیان.

( لە کن کوردان وەجاخی بنە ماڵە پیرۆزە و سوێندی بە درۆ بە وەجاخ گوناحێکی گەورەیە )

# ڕێوی و کۆتر و کەڵە شێر ٢

ڕۆژێکی ڕێوی بە دوای پاروە نانێک دا دەگەڕا چوە نێو گوند و دیتی مامر لە دەوری عەمباری گەنم کۆ بوونەوە و کەڵە شێریش بە دەوریاند دەگەڕێ. کە چاویان بە ڕێوی کەوت هەڵاتن. ڕێوی ڕووی کردە کەڵە شێر و گوتی:

– برا گیان بۆ دەترسی؟ دەزانی زوڵم نەماوە وداد دنیای داگرتوە و منیش وا دەچمە حەجێ.

کەڵە شێر گوتی : کە وایە منیش لە گەڵ تۆ دێمە حەج. ڕۆیشتن و لە جەنگەڵێک دا توشی کۆترێک بوون. کۆتر پێی سەیر بوو گوتی:

– کاکی کەڵە شێر چباسە. تۆو و ڕێوی ؟

– برا. ئەت بیستوە داد دنیای داگرتوە و زوڵم نە ماوە. ئێستا من و ڕێوی دەچینە حەجێ تا لە گوناحان پاک بینەوە .

– کە وایە منیش لە گەڵتان دێم. هەر سێک کەوتنە ڕێ. ڕێوی کەوتە پێشیان و بردنی بۆ کونی خۆی. گوتی : ئەمشۆ لێرە دەحەسێینەوە و بەیانی دەکەوینە ڕێ. هەر سێک چوونە ژوور، ڕێوی دەرگای لێ گرتن و گوتی :

– برایان : ئاگادار بن هەرا هەرایە نەکەن، تا بە ئاسودەیی بخەوین. وەرن قەرارێک دابنێین، هەرچی دەنکە دەنکی کرد بیخۆین.

کەڵە شێر لای بەیانی کاتی بانگ دانی بوو، خۆی پێڕانەگیرا، باڵی لێک دان و خوێندی.

ڕێوی گوتی برا قەرارمان چبوو؟ لە بیرت چۆتەوە. کەڵە شێر خۆی پێ ڕانەگیرا و دیسان قوقلیقوی دەست پێکرد. ڕێوی گرتی و خواردی. تاو هەڵات و کۆتریش دەستی کرد بە بڵغە بڵغ.

ڕێوی گوتی: برا قەراڕەکەت لە بیر چوە. بە چاوی خۆت نەت دی؟ کوتری

بە دەمییەوە گرت و هاتە دەرێ.

کۆتر گوتی: برای بەرێز پێم بێژە لە چ تایفێکی و پاشان بمخۆ.

رێوی گوتی : لە تایفەی محممەدی. لە گەل گوتنی وشەی محممەد، زاری لێک کردەوە و کۆتر دەر پەڕی و لە شەقەی بالانی دا.

رێوی بە داخێکەوە چاوی لێکرد و گوتی :« خۆزیا گوتبام لە تایفەی « جرجیسم» ددانم لێک نە دەبوونەوە و کۆتر نە دەفڕی.

# مەکری ژنان ٣

رۆژێک پاشا لە وەزیری خۆی پرسی:

- پیاو پتر بە مەکر ن یا ژن ؟

وەزیر لە وەڵامدا گوتی: دیارە ژن بە مەکر ترن

پاشا گوتی :

- ئێستا کە تۆ پێت وایە دەبێ بەڵگەم بۆ بێنی. چل رۆژت مۆڵەت بێ، ئەگەر بەڵگە نەهێنی لە سەرت دەدەم.

وەزیر خەمگین بوو. بیری کردەوە چبکا.؟ لە سەری دەدرێ و دەکوژرێ. باشترە سەری خۆی هەڵگرێ و بڕوا. لەم شارە دا ژنێک هەبوو بە ناوی « فدان» هەموو جارێ کە توشی وەزیر دەبوو گاڵتەی لە گەڵ دەکرد و دەیویست بیخە لە تێنێ، وەزیر پەتی نەدەدا .و گوێی نەدەدایە و دەیگوت:

- ئەم قسانە چیە. شتی وا چۆن دەبێ. من و تۆ لە شارێکدا دەژین، خەڵک بزانێ ئابڕومان دەچێ.

وەزیر ویستی بەر لە وەی لە شار دەر بچێ بۆ دوا جار لە جادە و کۆڵانی شار دا بسوڕێتە وە و ما ڵاوایی بکا. لە قەرا غ شار توشی « فدان» بوو.

- جەنابی وەزیر سڵاو. بۆچ وا بێ واز و خەمگینی. چۆنە ببیە میوانی من و لە گەڵم بێی تا خەم و خەفەتت لە بیر بەرمەوە،

وەزیر لە دڵی خۆیدا گوتی : تازە خۆ هیچم نەماوە لە کیسم بچێ. لەم شارەش ناژیم. بۆ چی لە گەڵی نەچم و بزانم چی لە من دەوێ؟ پاشان گوتی بە خۆشیەوە، ئێستا کاتم هەیە و ئازادم.

فدان کەوتە پێش و وەزیر بە دوایدا، گەیشتنە ماڵ. فدان وەزیری لە ژوورێک دانا و لە پەنای دانیشت و دەستیان کرد بە قسان. پاشان فدان هەستا

وکوتی: چرکەیەک دەچمە دەر و دێمەوە. چاوە ڕاونم بە و لێرە مەبزوو.

فدان چوە دەر و دەرگای لە سەر داخست. چوە کن مێردەکەی کە بازرگان بوو لە دوکان کاری دەکرد. گوتی:

– دەزانی چیە؟ خەونێکی ناخۆشم دی. لە خەونمدا تۆ لە سەر دار کەوتبووی هەر تک دەستت شکا بوون. خۆم پێ ڕانەگیرا و بە غار هاتم بزانم بەڵایەکت بە سەر نەهاتبێ.

دە ساڵ بوو مێردی کردبوو، جارێکیش نە چو بوە دوکانی مێردەکەی. مێردەکەی زۆری پێخۆش بوو کە ژنەکەی لە دوکانێ چوە سەری بدا و نەیدەویست بچێتەوە. خزمەتکارەکەی بانگ کرد و گوتی برۆ زوو مریشکێک بکە کەباب و میوە و شەربەت بێنە.

ژن و مێرد دەستیان کرد بە خواردن و فدان گوتی:

– وەرە چۆلە مێشکێن بکەین.

– زۆر باشە. ئەگەر تۆ بردتەوە هەر چی دەڵێی بۆت دەکرم. ژن و مێرد چۆلە مێشکێنیان شکاند و فدان گوتی:

– لە بیرت نەچێ، هەرچی وتمدای بڵێ لە بیرمە. ئێستا دەچمەوە ماڵێ و نانێکی خۆشت بۆ ساز دەکەم و نیو سەعاتی دیکە وەرەوە.

بەڵام وەزیر. وەزیر نیگەران بوو، سەعاتێک پێچوو فدان نەهاتەوە. ئاخرەکەی دەرگا کرایەوە و فدان هاتە ژوور.

وەزیر گوتی: چت بە سەر هات و لە کوێ بووی. چەند سەعاتە چاوە ڕوانتم.

– لە ڕێگا مەحتەلیان کردم. خۆت نارەحەت مەکە. فدان لە پەنا وەزیر دانیشت دەستی کرد بە تاز و نوز و لاواندنەوە. وەزیر وردە وردە وەغیرەت کەوت و ویستی لە ئامێزی بگرێ، لە پڕ لە دەرگایان دا. وەزیر ترسا و پرسی: ئەوە کێیە:

فدان بە هێدی وەڵامی داوە و گوتی:

– مێردەکەمە. ئێستا تۆ لێرە ببینێ دەتکوژێ

- ئەی خودا. چ بەڵایێکت بە سەر هێنام. من کە رێگام بە تۆ نە گرتبوو، تۆ خۆت منت هێنا ئێرە و ئێستا بە کوشتم دەدەی!

لەم ناوە دا پتر لە دەرگایان دا و بازرگان هاواری کرد:

- ئافرەت دەرگا بکەوە، لە گەڵ کێ قسان دەکەی؟

فدان لە سەر خۆ گوتی :« لە گەڵ دڵدارە خۆشە ویستە کەم. تاوێک ڕاوەستە، ئێستا دەرگا دەکەمەوە.

وەزیر لە ترسان ڕەنگی پەڕی و گوتی:

- ئەوە دەڵێی چی.؟ ئاقڵ بە. تکا دەکەم فیکرێکم بۆ بکەوە و نەجاتم دە. تۆ خوشکی منی!

- ئەگەر لە بارەی مندا بیری خەراب نەکەیەوە، رزگارت دەکەم. ڕابە بچۆ نێو ئەم سندوقە.

وەزیری خستە سندوق و دەرگای قفڵ کرد و چوو دەرگای کردەوە. مێرد وەک گورگی هار وەژوور کەوت و فدانی پەلامار دا و گوتی:

- کوا. دڵدارەکەت چی لێهات؟ زوو بە بێژە پێم. فدان بە پێکەنینەوە کلیلی سندوقەکەی بۆ درێژ کرد و گوتی:

لەو سندوقە دایە. هانێ بیکە وە. وەزیر لە ترسان سیس ببوو. بازرگان کلیلی لە فدان وەر گرت و فدان هاواری کرد:

- بردمەوە. دۆڕاندت. ئێستا چم گەرەکە دەبێ بیکری.

- ئاخ. ئەوە چ گاڵتەیەک بوو؟ کەمی مابوو بتکوژم. بۆ بردنەوەی چۆلە میشکێن گاڵتەت پێکردم.

فدان پلاوی لێنا بوو، ویستی بۆی بێنێ، مێردەکەی گوتی :« نا نا درەنگمە. کەس لە دوکانێ نیە. ژنەکەی ماچ کرد و چۆوە دوکانێ.

فدان دەرگای سندوقی کردەوە ، وەزیری بە نێوە گیان هێنا دەرێ. وەزیر خۆی پێ ڕانەدەگیرا . کەمێک دانیشت بێ ئەوەی ماڵاوایی لێبکات، وەدەر کەوت و ڕاست بۆ بارەگای شا. لە دڵدا دەیگوت: ئیتر نابێ لە شار بچمە دەر. بەڵگەی گەورە تر لە مە بۆ مەکری ژنان دەست ناکەوێ. چوە بارەگای پاشا و شا پرسی

- باشه. بەڵگەت بۆ مەکری ژنان هێناوە یان نا؟

وەزیر گوتی بەڵێ، حکایەتی خۆی و فدانی بۆ گێڕایەوە. پاشا گوتی :

- هەقتە، تۆ ڕاست دەکەی. ژن لە پیاو بە مەکر ترە. ئەوەش نەزمی جیهانیە و هیچی لە گەڵ ناکرێ.

# کیژۆڵەی ئاقل ٤

دوو دەستە برا هەبوون بە ناوی « ئافۆ » و « مستۆ » یەکتریان زۆر خۆش دەویست. هەر یەک لە گوندێکی دوور لە یەکتر دەژیان. هەر تکیان زۆر دەوڵەمەند بوون. مستۆ نابوت بوو و هیچی نەما. کێشە و هەرا لە ماڵەکەی سەری هەڵدا. هەر کەسە چی کەوتبا دەست، دەیدزی . وای لێهات بۆ نانی ڕۆژانە موحتاج بوون.

مستۆ بڕیاری دا بچێتە لای دەستە برایەکە و هێندێ گەنمی لێ بستێنێ. ئافۆ بە هاتنی برادەرەکەی شاد بوو، میواندارییەکی شازی ساز کرد و نەیهێشت چەند ڕۆژ بچێتەوە. ئافۆ نەیدەزانی مستۆ نابوت بوە و هیچی نەماوە. بەر لە وەی میوانەکە بەڕێکاتەوە لە گەڵ ژنەکەی تەگبیری کرد ، چ دیارییەکی باش بدا بە برادەرەکەی. گوتی:

– من دەبێ شتێکی وای بدەمێ کە شایانی ئەو بێ. بە تۆش وانیە؟

– ڕاستە. دەبێ شتێکی بدەینێ کە خۆشەویستی من و تۆ بێ.

– دەزانم ئەو کوڕێکی جحێڵی هەیە. با کیژەکەمانی بدەینێ و شیر باییشی لێ نەستێنین. ژنەکە ڕازی بوو.

ئافۆ چوە کن مستۆ و گوتی :« مستۆی خۆشەویست. دەمەوێ کیژەکەم بدەم بە کوڕەکەت. لە گەڵ خۆتی بەرە و هیچیشمان ناوێ.

مستۆ لەم قسانە سەری سور ما . لە گەڵ خۆی گوتی:« ئەوەش بوو بە کار. من هاتم بڕێ گەنم بستێنم تا ژن و منداڵم لە برسان نەمرن. ئەو بوکیش لە من دەکاتە سەر بار. خۆمان ئەوە لە برسان دەمرین، ئەو کیژە چۆن بەختیو کەین.؟

بەیانی ئافۆ و خێزانی جیازی کیژەکەیان ئامادە کرد و کەل و پەلی

سەفەریان ساز کرد و سواری ئەسپیان کرد و لە گەڵ مستۆ خستیانە ڕێ. مستۆ لە گەڵ بوک ڕێگایان گرتە بەر و لە نیوەی ڕێگا ڕا وەستان نەختێ بحەسێنەوە. مستۆ لە دڵی خۆیدا گوتی: « کیژەکەی بە جێ دێڵم ئەسپەکە بلەوەڕێنێ. خۆم دەچمە نێو لێرەوار و تا شەو ناگەڕێمەوە. کاتێ دیتی نە گەڕامەوە، دەچێتەوە ماڵی خۆیان.» بڕیاری دا وا بکات. بە کیژەکەی گوت:

– ڕۆڵە گیان. تۆ ئەسپەکان بلەوەڕێنە تا من لە نێو لێرەوار دێمەوە. مستۆ ڕۆی ، دوای ڕۆژئاوا گەڕایەوە، دیتی کیژەکە هەر وا لە کن ئەسپەکانە. کیژە کە زانی کە خەزوری شتێکی لێ دەشارێتەوە. گوتی:

– بابە، ڕاستیم پێ بڵێ شتێکت لە دڵدایە. ئێستا ئیتر من هەم کچی تۆم و هەم بوکت. هەر چەند نا توانم لە گەڵ تۆ بدوێم.×

بەلام دەبێ ڕاستیم پێ بڵێی.

مستۆ گوتی:« لە خوا بزر نیە لە تۆ چ وەشێرم. من ئەوەندە فەقیرم کە لە ماڵێ هیچمان نیە بیخۆین. هەموو ڕۆژێ کە هەڵدەستم ، بیر لە وە دەکەمەوە کە پاروە نانێک بۆ ژن و منداڵان لە کوێ پەیدا بکەم. تۆش ئەوە دێیە ماڵی من و برسی دەبی. چۆن نیگەران نەبم و بیری لێ نەکەمەوە.

– بابە، ئەگەر نیگەرانیت هەر ئەوەیە ، بیری لێ مەکەوە. منی هیچم لە ژن و منداڵی تۆ زیاتر نیە. هەر ئێستا جیاز و شتەکانی من دەفرۆشین و هەر چۆنێک بێ ژیان دەبەینە سەر. پاشان ئەسپەکانیش دەفرۆشین و تا بزانین چۆن دەبێ.

مستۆ هەناسێکی هەڵکێشا و کەوتنە ڕێگا و گەیشتنەوە. شەو کیژەکە هەموو ژنەکانی ماڵی کۆ کردەوە و گوتی:

– ئێستا شتێکتان پێ دەڵێم. بەڵێن بدەن کە بە گوێم بکەن. هەموو بەڵێن یان دا. پاشان گوتی :

– چوونە هەر شوێنێ، بە دەستی خاڵی مەگەڕێنەوە. هەر چی لە ڕێگا دیتتان. لە تەپاڵە وە بگرە تا کۆنە کەوش و ئاسنەوێڵە و پەڕۆ و شڕە و لە دەرگا کۆی کەنەوە. ڕۆژێک بە کار دێت.

ڕۆژێک بوکی گەورە دەهاتەوە ماڵێ. دەیویست لە نێو گژ و گیا دا گەسکێک کۆ بکاتەوە. لە نێو گژ و گیا دا سندوقێکی ئاسنی دیتەوە، ویستی بە جێی بێڵێ. قسەی کیژەکەی هاتەوە بیر. سندوقەکەی هەڵگرت و گەیشتەوە ماڵێ. سندوق و گەسکی دا بە کیژەکە و گوتی : « ئەوانەم لە مەزرایە هێناونەوە.

دەرگای سندوقیان کردەوە، پڕ بوو لە ئاڵتون و جەواهێرات کیژەکە شاد بوو گوتی : ئەوە بەشی هەموو ژیانمان دەکا و ئیتر لە گەڵ یەک کێشە و هەرا ساز مەکەن.

× لە نێو کوردان رەسمە بوک هەتا منداڵی نەبێ.نابێ لە گەڵ خەزور و پیاوی خزمی مێردی قسان بکات)

## ژن و مێرد ٥

ژن و مێردێکی فەقیر و هەژار هەبوون. ڕۆژێک مێردەکە گوتی :« چبکەین. هیچمان نیە و لە مەو دوا چۆن دەژین؟

ژنەکە گوتی: هیچمان نە ماوە. هەستە جلی بوکێنی من بەرە، لە بازێر بیفرۆشە و بە پارەکەی کاسبی بکە.

مێردەکەی کە ناوی «ئاڤۆ» بوو، جلی ژنەکەی خستە تورەکێک و بە کۆڵی داد و بۆشار. لە ڕێگا دیتی کابرایەک جوتی دەکا. بانگی ئافۆی کرد:

– بۆ کوێ دەچی.؟

– دەچمە شار، تا جلی بۆکێنی ژنەکەم بفرۆشم .

– بێنە بزانم. ئەگەر جوان بن دەیان کڕم. ئافۆ چوو بوخچەی کردەوە. کابرای جوتیار تەماشای کرد و گوتی: دەیان کڕم. ئەوانە بدە بەمن و گایەکانی من بەرە و بڕۆ.

ئافۆ بەو سەودایە ڕازی بوو. جل و لیباسەکانی دایە و گایەکانی وە پێش خۆ دا و بەرە و شار کەوتە ڕێ. لە بەر خۆی دەیگوت:« گایەکان دەفرۆشم و بە پارەکەی کاسبی دەکەم. دیتی کابرایەک لەو لاڕا دێت و دوو مەڕی وە پێش خۆ داون، لە ئافۆی پرسی :

– ئەو گایانە بۆ کوێ دەبەی.؟

– دەچم لە بازاڕ دەیانفرۆشم.

– وەرە بیاندە بە من و مەڕەکانی من بەرە.

– ئەم قسانە چیە. گایەکانی من جوتی دەکەن. چۆن بە مەڕ دەیانگۆڕمەوە. ؟

– مەڕەکانی منیش شیری دەدەن، هەموو ساڵ دەزێن. خوریان بەکار دێت. هەم بەشی نانت دەکەن و هەم پەنیر. هەموو شت.

ئافۆ نەختێ بیری کردەوە و پاشان ڕازی بوو. گایەکانی دا بە کابرا و مەڕەکانی وەپێش خۆ دا بۆ شار. توشی کابرایەک بوو لە شار دەهاتەوە و دوو تاژی پێ بوو. کابرا لە ئافۆی پرسی:

– بۆ کوێ دەچی.؟

– دەچم ئەو مەڕانە دەفرۆشم.

– وەرە تاژیەکانی من وەر گرە و مەڕەکان بدە بەمن.

– ئەو قسانە چیە. تاژی تۆ بە کاری چیم دێن ؟

– کابرایەکی سەیری. تاژی من ڕاوێ دەکەن. کەروێشک و ڕێویت بۆ دەگرن. دەبەی دەیانفرۆشی و دەوڵەمەند دەبی.

ئافۆ ڕازی بوو. مەڕەکانی دا بە کابرا و تاژییەکانی وەر گرت و کەوتە ڕێ. گەیشتە شار. توشی کابرایەک بوو، کەڵە شێرێکی پێ بوو. لە ئافۆی پرسی:

ئەم تاژی یانە بۆ کوێ دەبەی؟

– دەبەم لە بازار دەیانفرۆشم.

– ئەو کەڵە شێرەت دەدەمێ، تاژییەکان بدە بەمن.

– ئەو قسانە چیە. تاژیەکانی من ڕاو دەکەن. کەڵە شێر بە کاری چی من دێت؟

– چۆن بە کار نایە. کەڵە شێری جەنگییە. لە پێش برکێی شەڕە کەڵەباب سەر کەوتوە. من لە بەرانبەر دا پارە و خەڵاتم وەر گرتوە.

ئافۆ دیسان تۆزێ بیری کردەوە وسەوداکەی کرد و کەڵە شێری وەر گرت و بەرە و بازار ڕۆی. لە بازار کابرایەک هاتە لای. کڵاوێکی پێستی تازەی پێ بوو. لە ئافۆی پرسی:

– داخوا کەڵە شێرەکەت بە کڵاو نا گۆڕییەوە؟

– نا. کەڵەبابی من، کەڵە شێرێکی ڕەمەکی نیە. ڕۆژێ دوو سێ کەڵە

بابان دەبەزێنێ. کڵاو بە کاری چی دێت؟

– ئەو قسانە چیە. کڵاوێکی جوانە و لە سەرتی بنێی، ژنەکەت خۆشی دەوێ.

ئافۆ ڕازی بوو. کەڵە شێری دایە و کڵاوی وەر گرت و بەرەو ماڵ کەوتە ڕێ. لە پەنا چۆمێک ڕاوەستا بحەسێتەوە. لە سەر ئاوێ ویستی دەست و چاوی بشوات. داهاتەوە کڵاوەکەی لە سەری کەوتە خوار و ئاو بردی. بە سەری پەتی و دەستی خاڵی مایەوە.

لە پەنا ماڵەکەی دیتی کاروانێک خستوویەتی. بە پەنا کاروانە کە دا تێدەپەڕی، نۆکەرانی بازرگانی خاوەنی کاروان گرتیان و گوتیان هاتووی دزی بکەی. ئافۆ گوتی : دزی چی ؟ ئێرە ماڵی منە و دەچمەوە ماڵی خۆم. نۆکەران گوێیان نەدایە و بردیان بۆ لای بازرگان.

بازرگان پرسی:« بەو شەوەی لە چی دەگەڕێی؟

– بۆ کاسبی چوو بومە شار و ئێستا دەچمەوە ماڵ.

– باشە لە کاسبی چیت پەیدا کردوە.؟ ئافۆ چیرۆکی سە ودا و سە فەردکەی بۆ گێڕایەوە. بازرگان گوتی :

– ئاکات لە خۆت بێ. ژنەکەت باش پێت ڕادەکا.!

– بۆ چی ؟ هەر بیریشی لێ ناکاتەوە.

– وەرە گرێو بکەین. کە گەیشتیە وە ئە گەر دەستێکی باشی لێ نەدای هەرچی هەمە دەیدەم بە تۆ. ئەگەر لێی دای ئەوە ژنە کەت بدە بەمن.

گرەویان کرد و بازرگان دوو کەسی لە نۆکەرانی خۆی لە گەڵ نارد تا لە سەر بان و لە سەر ڕۆژنە سەیریان بکەن.

ئافۆ لە دەرکای دا. ژنەکە دەرکای لێکردە وە و لە خۆشیان خۆی دە ئامێزێ هاویشت و گوتی:

– خۆشە ویستەکەم باش بوو. چەندە شاد بووم بە سلامەتی گەڕایە وە. ئاوی هێنا و لاق و دەستی مێردەکەی شوشت و پرسی:

– کاسبیەکەت چۆن بوو.؟

ئافۆ هەموو رووداوەکەی بۆ گێرایەوە. ژنە کە دڵخۆشی دایە وە و گوتی:

– خۆشە ویستم خەم مەخۆ. کاسبی و بازرگانی بێ زەرەر نابێ. جارێک زەرەر دەکەی و جارێکی تر قازانج دەکەی. نابێ خەم بخۆی.

بازرگان بە بیستنی ئە و قسانە سەری سور ما و هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی:« ئە وەیە ژنی باش». پاشان بە گوێرەی قەرارێکی کرد بوویان، کالا و شتەکانی دا بە ئافۆ. ئافۆ دەوڵەمەند بوو لە گەڵ ژنە کە بە خۆشی ژیانیان بردە سەر.

ئەوان بە ئاواتی خۆیان گەیشتن، ئێوەش بە ئاوات بگەن.

# ژنی ئاقڵ ٦

پیاوێکی پیر هەبوو جگە لە کەرێک هیچی دیکەی شک نە دەبرد. هەموو ڕۆژی دەچوە جەنگەڵ وبارێکی دار دەهێنا. جیرانە دەوڵەمەندەکەی لە پەنجەرەوە تەماشای دەکرد و دەیبینی کە چۆن کابرای فەقیر هەموو ڕۆژێ بارە دارێک دێنێتەوە.

ڕۆژێک لێی پرسی: « من دەبینم هەموو ڕۆژێ تۆ بارە دارێک دێنی. ئەو دارانە بە چەند دەفرۆشی و لە ماڵێدا چەند کەسن.»

– باری بە دە سکە دەدەم و شەش کەسین لە ماڵدا و بەو پارە یە نان و خواردەمەنی دەکرم.

کابرای دەوڵەمەند پارەیەکی دایە و گوتی : « ئەم پارە یە وەر گرە و ئیتر مە چۆ داران. دڵم پێت دەسووتێ.»

کابرا پارەکەی وەر گرت و دای بە ژنەکەی گوتی:

– ئەو سەد سکەیان داومێ کە دە ڕۆژ نەچمە داران. دوو ڕۆژی پێچوو، ڕۆژی سێیەم پیاوە فەقیرەکە لە ژنەکەی پرسی:

– ئیمرۆ بۆ چی هیچت نەکریوە؟

– پارەم نیە.

– چۆن پارەت نیە؟ پێش دوو ڕۆژ سەد سکەم نەدایەی ، نەمگوت دە ڕۆژان ناچمە داران.؟ کابرا چاری نەما. کەری وەپێش خۆ دا و بەرەو جەنگەڵ کەوتە ڕێ. کابرای دەوڵەمەند دیتی کابرای فەقیر دیسان چوە داران. لە کاتێکا کیژەکەی لە پەنا وێستا بوو، بانگی کابرای کرد و گوتی:

– قەرار نە بوو دە ڕۆژ نە چیە جەنگەڵ؟ من سەد سکەم نەدایەی؟

فەقیر لە وەڵام دا گوتی: « پارەم نەماوە »

کیژی کابرای دەوڵەمەند گوتی :« خەتای ئەو نیە. ژنەکەی باش و ماڵدار نیە .

کابرای دەوڵەمەند تێکچوو گوتی:« ئەگەر پیاو تەمبەڵ و بێکارە بێ، ژن دەتوانێ چبکا .؟ پاشان کابرای فەقیری بانگ کرد و گوتی:

– وەرە ئەو کیژەی من لە گەڵ خۆت بەرە بزانە ماڵەکەت چۆن بە ڕێوە دەبات.؟

کچەکە گوتی : « بابە ئێستا کە تۆ وات کرد، کارێکی دەکەم ئاو بە دەستی ئەو پیاوە فەقیرە دابکەی.

کابرای فەقیر کیژە کەی بردە وە و بە دایکی گوت:« ئەوە ژنی منە.»

دایکی گوتی: « تۆ ژنت هەیە ئەوەت بۆ چیە ؟

کابرا ژنەکەی دەر کرد. ژنی تازەی هەم ئاقڵ بوو، هەم کار کەر. دەستی کرد بە درووێن و چنین و شتی دیکە و شەش مانگ ڕابرد، خانووی کابرابوو بە کۆشک. ساڵێک پێچوو ڕۆژێک ژنە کە گوتی: بچوو پیاوە دەوڵەمەندەکە بانگێشتن بکە.

کابرا لیباسی تازەی کردە بەر و چوە ماڵی دەوڵەمەندەکە و گوتی:

– هاتوم داوەت بکەم بە کەرەمی خۆ وەرە ماڵی ئێمە.

کابرا دیتی پیاوێکی وێچو و پۆشتە بانگێشتنی دەکا. خۆی کۆ کردە وە و چوە ماڵی کابرای فەقیر کە زاوای بوو. دیتی ماڵێکە پڕ لە سەروەت و سامان

نانیان خوارد و ویستیان دەستیان بشۆن. کابرای فەقیر ویستی ئاو بە دەستی میوانەکە دابکا، بەڵام ئەو ڕازی نە دەبوو، بە زەحمەت ڕازی کرد. پاشان کابرای دەوڵەمەند گوتی: « نۆرەی منە کە ئاوت بە دەستی دابکەم. چونکە لە من دەوڵەمەند تری.»

ئافتاوەی دەست دایە ئاوی بە دەستی دابکا. لەو کاتە دا کیژەکە هاتە ژوورێ و گوتی:

– بابە چۆنی ؟ پێم نەگوتی وا دەکەم ئاو بە دەستی پیاوی فەقیر دابکەی.؟

بابی دانی پێدا هێنا و گوتی:« ڕاستە کیژم. هەقتە. دەر کەوت تۆ لە من ئاقلتری.

## ژنی خەراب ٧

کابرایەک بوو بە ناوی ئەحمەد خان، ژنێکی فرە خەراب و ڕوو گرژی هەبوو.خەڵک پێیان دەگوت:

– ئەحمەد خان تۆ پیاوێکی باش و ئاقڵی. بەڵام ژنەکەت کەس تخوون ماڵێ ناکا و لە گەڵ هەموو کەس بە شەڕ دێت. تەریق نابیەوە.

ڕۆژێک بە ژنەکەی گوت: « با بچینە مەزرایە.»

ڕۆیشتن. ژنەکەی بردە سەر چاڵاوێک و گوتی:« پارەکە ئێرەم کرد بوە عەنباری کەنم. سەیری کە بزانە هیچی تێدا ماوە.؟

زن چوە سەر چاڵاو و ئەحمەد خان پاڵێکی پێوە نا و بە تەنیا گەڕایەوە. شەو ویژدانی نارەحەت بوو. گوتی « هەر چی بێت ئەو ژنە لە گەڵ من زەحمەتی کێشاوە، بچم نانێکی بۆ بەرم.»

بەیانی هەستا هێندێ خواردنی هەڵگرت و گوریسێکی دەست دایە و چوە سەر چاڵاوەکە. گوتی با بزانم زیندوە یان نا. گوریسی هاویشتە خوار و تاوێک چاوە ڕوان بوو، پاشان هەڵیکێشاوە. هەستی کرد قورسە. وای زانی ژنەکەیەتی. کە هاتە دەر، تەماشای کرد مارێکی گەورە خۆی لێ هاڵاندوە. ویستی بێخاتە وە ناو چاڵاوەکە. مار دەستیکرد بە پاڕانەوە و گوتی :

– پیاوی چاک بە مەم خەرەوە چاڵاو. من بە زەحمەت لە دەست ژنێک نەجاتم بوە کە دوێشەو کەوتە ئەم چاڵاوە. لە گەڵ خۆت هەڵمکرە، بە کارت دێم.

ئەحمەد خان ماری بردەوە ماڵێ. ماوەیەک پێچوو، ڕۆژێک مار پێی گوت:

– ئەی ئەحمەد خان من دەچم لە ملی کچی پاشا دە هاڵێم. هیچ کەس ناتوانێ نەجاتی بدا. کاتێ جارچی جار دە کێشێ و دەڵێ: « کێ دەتوانێ کیژی پاشا نەجات بدا». تۆ بێژە من دەتوانم نەجاتی بدەم.» ئەو دەم وەرە و لە ملی

کیژەکەم بکەوە تا پاشا ئاڵتونێکی زۆرت بداتێ و دەوڵەمەند دەبی. سزای ئەو چاکەیە کە لە گەڵ منت کردوە.

مار چوە ژووری کیژی پاشا و خۆی لە ملی هاڵاند. پاشا دوکتۆر و چاوبەست و زانای بانگ کردن، کەس چاری پێ نەکرا. پاشا گوتی :« لە شار جار بکێشن کە :

– هەر کەس بتوانێ کیژی پاشا نەجات بدا، پاشا کیژە کەی دەداتێ.

ئەحمەد خان گوتی :« من دەتوانم نەجاتی بدەم.» ئەحمەد خانیان بردە بارەگای شا و بردیانە ژووری کیژەکە. دیتی کیژ کەوتوە و مار لە ملی هاڵاوە. مارە کە چاوی بە ئەحمەد خان کەوت، کیژەکەی بەردا و گوتی:« ئەگەر جارێکی دیکە لە ملی کیژی پاشا هاڵام، ئەکەی بێی نەجاتی بدەی. ئەگەر بێی دەتخنکێنم»

ئەحمەد خان کیژی پاشای مارە کرد و حەوت شەو و رۆژ زەماوەندی گرد.

پاشە ئەوان لە خۆشی و شادی دا ڕادەگرین و دەچین بزانین مار چدەکا.

مارە دیسان چوە ژووری کیژی پاشای وڵاتی دراوسێی ئەوان . هەموو خەڵکی کۆشکی پاشا کۆ بوونەوە و هیچیان بۆ نەکرا. یەک لە خزمەتکاران گوتی:« لە وڵاتی دراوسێمان ئەحمەد خانێک هەیە تەنیا ئەو دەتوانێ چاری بکات. بە دوای ئەحمەد خانیان دا نارد. ئەو ترسا و لە دڵی خۆیدا گوتی:« ئێستا چبکەم.؟ ئەگەر نەچم پاشا دەمکوژێ. بچم مار دەم خنکێنێ.!»

ئاخرەکەی بریاری دا بچێ. چوە ژووری کیژی پاشا و دیتی مار لە ملی کیژەکە هاڵاوە و هاتوە بیخنکێنێ. مار کە چاوی بە ئەحمەد خان کەوت، ویستی خۆی باوێتێ و بیخنکێنێ. ئەحمەد خان گوتی:

– ڕاوەستە. من نەهاتووم کیژی پاشا نەجات بدەم. هاتم ئاگادارت بکەم کە ژنەکەم لە چاڵاو هاتۆتەوە دەر و بە دوات دا دەگەڕێ.

مار کە ئەوەی بیست، کیژی پاشای بەردا و رایکرد.

کە وابوو پیاوان سەر کۆنە مەکەن کە بە ژنەکانیان ناوێرن. ژن ئەگەر خەراب وبێحەیا بوو کەس پێی ناوێرێت.

## ژنی بە مەکر ٨

ڕۆژێک مێرد بە ژنەکەی گوت: « قەت ناتوانی فریوم بدەی.»
ژن لە قاقای پێکەنینی دا و گوتی :
- دەبڕۆ. هەر کاتێ بخوازم بەڵایێکت بە سەر دێنم هەر باسی مەکە.
- تۆ! ژنی بێ ئاقل چۆن دەتوانی لە بەرانبەر ئاقڵی پیاو دا خۆ بنوێنی.؟
ئاخـــرەکـــەی ڕۆژێک پیـــاوەکـــە چوە مـــەزرایە جـوتـی بکا. ژن بڕیاری دا گاڵتـەیەکی لە گەڵ بکا. چوە بازار و ماسی تازەی کڕی و بۆ مێـردەکەی بردە مەزرا و گوتی: « تا تۆ نانەکەت دەخۆی، من دەچم بزانم جوتت چاک کردوە یان نا.؟
- ژن بە خـەتی جوتیدا دەچوو، لە چەند شـەقاوێکدا ماسـیەکی دەخستـە خـەتی جوتی و دایدەپۆشی. هەموو خـەتەکان گەڕا و گەڕایەوە پەنا مێردەکەی دانیشت و نازی کرد و بە زمانێکی شیرین و گاڵتە دەستی بە قسان کرد.
نیو سەعاتی پێچوو، مێردە کە گوتی:
- باشە. هەستە تۆ بڕۆ تا من زەویەکەم بکێڵم.
ژنەکە وەڵامی دایەوە :
- ڕاوەستە جارێکی تر با لە گەڵ تۆ بە خەتی جوت دا بێم، پاشان دەڕۆم. مـێرد دەسـتـی کـرد بە کـێـڵان و ژنەکـەش لـە گـەڵ ئەو دەڕۆیشت. دوو هـەنگاو ڕۆیشتبوون کە ماسی لە ژێر گاسن هاتە دەر.
ژنەکە گوتی : « بزانە هاتنی من چەندی خێر پێوە بوو. داخوا قەت خـودا نیعمەتێکی ئاوای بە نسیب کرد بووی.؟
بڕێکی دیکە ڕۆیشـتن مـاسـیـیـەکی دیکەش لە ژێر گـاسـن هاتە دەر. ژن مـاسـیەکـانی هەڵگرت و بردنـیـەوە مـاڵێ و سـووری کردنەوە. سـۆوسـیـشـی پێدا

کرد. ئێواریّ مێردەکەی هاتەوە و بانگی کرد:« ئافرەت ماسی بێنە !

- ماسی چی ؟

- چۆن ماسی چی؟ کام ماسی ؟ ئەو ماسیانەی کە لە زەوی دەرم هێنان.

ژن هاواری کرد و گوتی :

- ئەی هاوار! خەڵکینە بگەنە هاوارم. مێردەکەم شێت بوە! کەس دیتوویە کە ماسی لە زەوی بگیرێ؟

دراوسێکان بە غار هاتن و پیاوەکەیان گرت و لە کۆڵەکەیان بەست. شەو کە خەڵک بڵاوەی کرد، پیاوەکە پاڕاوە و گوتی :

- من لەو کۆڵەکە بکەوە. بێگومان خەونم دیبوو کە ماسیم لە زەوی گرتوە.- نا. ئەگەر بێکەمەوە لێم دەدەی.

- بە وەجاخ و بە گیانی منداڵەکان دەستت لێنادەم. ژنەکە لە کۆڵەکەی کردەوە و دەوری سۆسی لە پێش دانا و سەری ماسی لە ژێر سۆس هاتە دەر. مێردەکە بە ترسەوە گوتی:« ئەی هاوار دیسان خەون دەبینم. شتی سەیرم دێنە بەر چاو.

- چ دەبینی ؟ چیت دێتە بەر چاو؟ دیسان ماسی دەبینی ؟

- بەڵێ !

- چما تۆ نەتگوت کە ناتوانی فریوم بدەی ؟ ئێستا بینیت کە ئاقڵی پیاوان هیچ ناهێنێ. ئەوەی گوت و لە قاقای پێکەنینی دا.

## ژن و مێرد ٩

پیاوێک بوو ژنێکی جوان و میهرەبانی هەبوو. بەڵام منداڵیان نە بوو. پیاوەکە کاری دەکرد و بەردی قورسی هەڵدەگرت. بە بوونی ئەو ژنە باشە ئەوەندە دڵخۆش بوو کە بەردی قورسی بە هاسانی هەڵدەگرت. ڕۆژێک پاشا و وەزیر بە کن ئە و دا تێدەپەڕین.

پاشا بە وەزیری گوت:« سەیری کە ئەم پیاوە چەندە بە توانایە.»

وەزیر گوتی:« لێرەدا هێز لە گۆڕێدا نیە، تەنیا دڵی خۆشە.»

- نا .. مەسەلەی هێزە. لە نێوان پاشا و وەزیر دا باس دەستی پێکرد. وەزیر گوتی :

- وەرە گرێو بکەین. من دەڵێم ئەم پیاوە یا دڵی خۆشە، یا ژنی جوانە، یا زۆر دەوڵەمەندە، یا منداڵی باشی هەن. یەک لەوانەیە.

پیرێژنێکیان نارده ماڵی کابرا . گوتیان برۆ بزانە چی لە ماڵێدا هەیە. پیرێژن چوو دیتی هیچی نیە. منداڵیشی نیە. بەڵام ژنەکەی جوانە. پیرێژن هاتەوە و گوتی : « تەنیا ژنە کەی جوانە .»

پاشا فیکری کردەوە : کە چیکەم ژنە کەی لێ بستێنم.» بە پیرێژنی گوت :

- پارەیەکی زۆرت دەدەمێ، هەوڵ بدە فریوی بدەی. پیرێژن چوە لای ژنە کە و گوتی:

- تۆ کە منداڵت نیە، سەروەت و سامانت نیە. مێردی کرێکارت بۆ چیە. ئەم هەموو جوانیە لە گەڵ کێ دەبەیە سەر.

- چی بکەم ؟

- بەرەڵای کە ، وەرە مێرد بە پاشا بکە.

- باشە وا دەکەم. مێرد لە کار هاتە وە دیتی رەفتاری ژنە کەی گۆڕاوە.

بەر لەوە کە مێردەکەی دەهاتەوە، ژن پێڵاوی لە پێ دەر دەهێنا، لاقی دەشوشت، نان و چای بۆ ساز دەکرد. لە سەر جێدا سەری دە خستە سەر سینگی مێردەکە و خەوی لێدەکەوت. ئێستا پیرێژن فریوی دابوو. تەنانەت سەیری مێردەکەشی نە دەکرد. مێرد نازاری دەکێشا و دەیگوت:« چقەوماوە کە ژنم سەیرم ناکا ؟ هەر چۆنێک بێ چوە سەر کار و ویستی بەردێک هەڵگرێ، نەیتوانی.

وەستا لێی پرسی :« چیە.. چت لێقەوماوە.؟

– نازانم ،هەر دەڵێی بارێکی قورس لە سەر دڵم دانراوە.

– چیت لێ قەوماوە ؟

– ژنەکەم نایەوێ سەیرم بکا .

وەستا گوتی برۆ مەسینەکەت بشکێنە و پاشان دەست بە گریان و هاوار بکە. ژنەکەت دەپرسێ بۆ وا دەکەی.؟ بڵێ : مەسینەکەم شکاوە» دەڵێ: « باشە. شکاوە یەکی دیکە بکڕە.» لە وەڵام دا بڵێ : « نا بە مەسینەی خۆم ڕاهاتبووم. دەسکی خۆش بوو، ئاوی باش لێ دەهاتە دەر. یەکی تازە بکڕم . چوزانم باشە یا خەراب»

مێرد قسەی وەستای گرتە گوێ و بە کاری هێنا. ژن کە دیتی مێردەکەی بۆ مەسسینە دەگری و ناتوانێ لە گەڵ هی تازە ڕابێ. لە دڵی خۆیدا گوتی: « ئاخر منیش بە مێردەکەی خۆم ڕاهاتووم. ئەگەر ببمە ژنی پاشا دیسان دەبێ بەویش ڕابێم. باشترە هەر لە گەڵ مێردی خۆم ژیان بەرمە سەر و بمێنمەوە.» جارێکی تر لە گەڵ مێردەکەی رێک کەوتەوە.

## دوو مەلا ١٠

مەلایەک دوو ژنی هەبوون و مەلایکی تر کە رەفیقی بوو، ژنێکی هەبوو. ئەوەی دوو ژنی هەبوو هەمیشە بەیانی زوو لە خەو هەڵدەستا و دە چوو لە سەر منارە بانگی دەدا، ئەوەی ژنێکی هەبوو وەدرەنگی دەکەوت و نەیدەتوانی زوو لە خەو هەستێ و بکاتە رەفیقەکەی. رۆژێک مەلای یەک ژنە بە مەلای دوو ژنەی گوت:

- بێگومان تۆ دەچیە بەهەشت. هەر چەندی دەکەم ناتوانم بەیانیان زوو لە خەو هەستم.

- بەڵێ وایە فەقێر! تۆ ژنێکت هەیە هەتا دەگەرێ گۆرە وی و کەوشەکانت دەدۆزێتەوە و نانت بۆ ساز دەکا، دەبێتە رۆژ و درنگ دەبێ. بەڵام وەزعی من فەرقی هەیە. ژنەکانم یەکیان کەوش و گۆرەویم بۆ دێنێ، یەکیان نان ئامادە دەکا و مێزەرم بۆ دێنێ و زوو دەگەمە سەر منارە.

مەلای یەک ژنە بیری کردەوە و هەر ئەو رۆژە چوو ژنێکی دیکەشی هێنا. لای رۆژ ئاوا کە هاتەوە ماڵێ، دیتی شەرە ژنە و یەک دەڵێ :

- ئەی خاک بە سەری مەلا!

ئەویتر دەڵێ: ئەی تف لە ریشی مەلا!

- ئەی تف بە گۆری بابی مەلا

- ئەی تف بە گۆری دایکی مەلا!

شەو داهات و جنێو و شەر نە برایەوە. مەلا ناچار هەستا لە ماڵێ دەر کەوت و چو لە سەر منارە خۆی مات کرد. دیتی کەسی لێ نیە و دانیشت. تاوێکی پێچوو دیتی مەلای رەفیقی هات و گوتی:

- پێم نه گوتی که پیاوی دوو ژنه هه‌میشه زووتر ده گاته سه‌ر مناره.
- خـودا بتگری ! ئه‌م ئاگره‌ی ده مـاڵی تۆ بەر ببـوو، ده مـاڵی منیـشت بەردا !.

## دوو خوشک ١١

کابرایه‌ک دوو کیـژی هه‌بوون، هه‌ر تکی به مێرد دان و رۆیشـتن. ماویه‌کی پێچوو له حاڵیان بێخـه‌بەر بوو. نه‌یده‌زانی ژیانیان چۆنه. خـێزانی پێی گوت:« ماومیه‌کی له کچه‌کانمان بێخه‌به‌رین. بچوو بزانه چۆنن.

کابرا دیاری بۆ کیژه‌کانی کڕی و که‌وته ڕێ. چوه مـاڵی کـچه گه‌وره‌که‌ی دیتی به ته‌نیا له ماڵێ دانیشتوه. باب و کچ یه‌کتریان له ئامێز گرت و یه‌کتریان ماچ کرد و دانیشتن و ده‌ستیان به قسان کرد. باب پرسی :

- باشه کیژم بلێ بزانم وه‌زع و حاڵت چۆنه.؟

کچـه‌که گوتی: « با بـچینه بەر دەرگا پێت ده‌ڵێم. چوونه بەر دەرگا و کچ گوتی:

- ئه‌و مـه‌زرایه ده‌بینی هه‌مووی زه‌وی ئێمـه‌یه و کردوومـانه‌ته گه‌نم. ئه‌گه‌ر خوا بکا و باران بباری، گه‌نمێکی زۆرمان ده‌بێ و به‌شی ئازوقه‌ی چه‌ند ساڵمان ده‌کا و بۆ فرۆشتنیش ده‌مێنێته‌وه.

زاوای کـابرا ئێواری هاته‌وه. نانیـان ساز کـرد و شێویان خوارد و پاشـان خـوا حافیـزی کرد و کـابرا چوه مـاڵی کیـژی دووهه‌مـی. ته‌مـاشـای کرد به ته‌نیـا دانیشـتوه. کچ به دیتنی بابی شاد بوو، یه‌کتریان ماچ کرد و بابی پرسی :

- باشه کچم وه‌زع و حاڵتان چۆنه. ژیان چۆن به سـه‌ر ده‌به‌ن.؟
- بابه ! با بچینه حه‌ساری جا پێت ده‌ڵێم.

## ژنی ئاقڵ ٦

پیاوێکی پیر هەبوو جگە لە کەرێک هیچی دیکەی شک نە دەبرد. هەموو رۆژی دەچوە جەنگەڵ وبارێکی دار دەهێنا. جیرانە دەوڵەمەندەکەی لە پەنجەرەوە تەماشای دەکرد و دەیبینی کە چۆن کابرای فەقیر هەموو رۆژێ بارە دارێک دێنێتەوە.

رۆژێک لێی پرسی: « من دەبینم هەموو رۆژێ تۆ بارە دارێک دێنی. ئەو دارانە بە چەند دەفرۆشی و لە ماڵێدا چەند کەسن.»

– باری بە دە سکە دەدەم و شەش کەسین لە ماڵدا و بەو پارە یە نان و خواردەمەنی دەکڕم.

کابرای دەوڵەمەند پارەیەکی دایە و گوتی : « ئەم پارە یە وەر گرە و ئیتر مە چۆ داران. دڵم پێت دەسووتێ.»

کابرا پارەکەی وەر گرت و دای بە ژنەکەی گوتی:

– ئەو سەد سکەیان داومێ کە دە رۆژ نەچمە داران. دوو رۆژی پێچوو، رۆژی سێیەم پیاوە فەقیرەکە لە ژنەکەی پرسی:

– ئیمڕۆ بۆ چی هیچت نەکرێوە؟

– پارەم نیە.

– چۆن پارەت نیە؟ پێش دوو رۆژ سەد سکەم نەدایەی ، نەمگوت دە رۆژان ناچمە داران.؟ کابرا چاری نەما . کەری وەپێش خۆ دا و بەرەو جەنگەڵ کەوتە رێ. کابرای دەوڵەمەند دیتی کابرای فەقیر دیسان چوە داران. لە کاتێکا کیژەکەی لە پەنا وێستا بوو، بانگی کابرای کرد و گوتی:

– قەرار نە بوو دە رۆژ نە چیە جەنگەڵ؟ من سەد سکەم نەدایەی؟

فەقیر لە وەڵام دا گوتی: « پارەم نەماوە »

کیژی کابرای دەوڵەمەند گوتی :« خەتای ئەو نیە. ژنەکەی باش و ماڵدار نیە .

کابرای دەوڵەمەند تێکچوو گوتی:« ئەگەر پیاو تەمبەڵ و بێکارە بێ، ژن دەتوانێ چبکا .؟ پاشان کابرای فەقیری بانگ کرد و گوتی:

– وەرە ئەو کیژەی من لە گەڵ خۆت بەرە بزانە ماڵەکەت چۆن بە ڕێوە دەبات.؟

کچەکە گوتی : « بابە ئێستا کە تۆ وات کرد، کارێکی دەکەم ئاو بە دەستی ئەو پیاوە فەقیرە دابکەی.

کابرای فەقیر کیژە کەی بردە وە و بە دایکی گوت:« ئەوە ژنی منە.»

دایکی گوتی: « تۆ ژنت هەیە ئەوەت بۆ چیە ؟

کابرا ژنەگەی دەر کرد. ژنی تازەی هەم ئاقڵ بوو، هەم کار کەر. دەستی کرد بە درووِن و چنین و شتی دیکە و شەش مانگ ڕابرد، خانووی کابرابوو بە کۆشک. ساڵێک پێچوو ڕۆژێک ژنە کە گوتی: بچوو پیاوە دەوڵەمەندەکە بانگێشتن بکە،

کابرا لیباسی تازەی کردە بەر و چوە ماڵی دەوڵەمەندەکە و گوتی:

– هاتوم داوەتت بکەم بە کەرەمی خۆ وەرە ماڵی ئێمە.

کابرا دیتی پیاوێکی وێچو و پۆشتە بانگێشتنی دەکا. خۆی کۆ کردە وە و چوە ماڵی کابرای فەقیر کە زاوای بوو. دیتی ماڵێکە پڕ لە سەروەت و سامان

نانیان خوارد و ویستیان دەستیان بشۆن. کابرای فەقیر ویستی ئاو بە دەستی میوانەکە دابکا، بەڵام ئەو ڕازی نە دەبوو، بە زەحمەت ڕازی کرد. پاشان کابرای دەوڵەمەند گوتی: « نۆرەی منە کە ئاوت بە دەستی دابکەم. چونکە لە من دەوڵەمەند تری.»

ئافتاوەی دەست دایە ئاوی بە دەستی دابکا. لەو کاتە دا کیژەکە هاتە ژوورێ و گوتی:

– بابە چۆنی ؟ پێم نەگوتی وا دەکەم ئاو بە دەستی پیاوی فەقیر دابکەی.؟

بابی دانی پێدا هێنا و گوتی:« ڕاستە کیژم. هەقتە. دەر کەوت تۆ لە من ئاقلتری.

## ژنی خەراب ٧

کابرایەک بوو بە ناوی ئەحمەد خان، ژنێکی فرە خەراب و ڕوو گرژی هەبوو.خەڵک پێیان دەگوت:

– ئەحمەد خان تۆ پیاوێکی باش و ئاقڵی. بەڵام ژنەکەت کەس تخونماڵێ ناکا و لە گەڵ هەموو کەس بە شەڕ دێت. تەریق نابیەوە.

ڕۆژێک بە ژنەکەی گوت: « با بچینە مەزرایە.»

ڕۆیشتن. ژنەکەی بردە سەر چالاوێک و گوتی:« پارەکە ئێرەم کرد بوە عەنباری کەنم. سەیری کە بزانە هیچی تێدا ماوە.؟

زن چوە سەر چالاو و ئەحمەد خان پاڵێکی پێوە نا و بە تەنیا گەڕایەوە. شەو ویژدانی نارەحەت بوو. گوتی « هەر چی بێت ئەو ژنە لە گەڵ من زەحمەتی کێشاوە، بچم نانێکی بۆ بەرم.»

بەیانی هەستا هێندێ خواردنی هەڵگرت و گوریسێکی دەست دایە و چوە سەر چالاوەکە. گوتی با بزانم زیندوە یان نا. گوریسی هاویشتە خوار و تاوێک چاوە ڕوان بوو، پاشان هەڵیکێشاوە. هەستی کرد قورسە. وای زانی ژنەکەیەتی. کە هاتە دەر، تەماشای کرد مارێکی گەورە خۆی لێ هاڵاندوە. ویستی بێخاتە وە ناو چالاوەکە. مار دەستیکرد بە پاڕانەوە و گوتی :

– پیاوی چاک بە مەم خەرەوە چالاو. من بە زەحمەت لە دەست ژنێک نەجاتم بوە کە دوێنشەو کەوتە ئەم چالاوە. لە گەڵ خۆت هەڵمکرە، بە کارت دێم.

ئەحمەد خان ماری بردەوە ماڵێ. ماوەیەک پێچوو، ڕۆژێک مار پێی گوت:

– ئەی ئەحمەد خان من دەچم لە ملی کچی پاشا دە هاڵێم. هیچ کەس ناتوانێ نەجاتی بدا. کاتێ جارچی جار دە کێشێ و دەڵێ: « کێ دەتوانێ کیژی پاشا نەجات بدا». تۆ بێژە من دەتوانم نەجاتی بدەم.» ئەو دەم وەرە و لە ملی

کیژەکەم بکەوە تا پاشا ئاڵتونێکی زۆرت بداتێ و دەوڵەمەند دەبی. سزای ئەو چاکەیە کە لە گەڵ منت کردوە.

مار چوە ژووری کیژی پاشا و خۆی لە ملی هاڵاند. پاشا دوکتور و چاوبەست و زانای بانگ کردن، کەس چاری پێ نەکرا. پاشا گوتی :« لە شار جار بکێشن کە :

– هەر کەس بتوانێ کیژی پاشا نەجات بدا، پاشا کیژە کەی دەداتێ.

ئەحمەد خان گوتی :« من دەتوانم نەجاتی بدەم.» ئەحمەد خانیان بردە بارەگای شا و بردیانە ژووری کیژەکە. دیتی کیژ کەوتوە و مار لە ملی هالاوە. مارە کە چاوی بە ئەحمەد خان کەوت، کیژەکەی بەردا و گوتی:« ئەگەر جارێکی دیکە لە ملی کیژی پاشا هالام، نەکەی بێی نەجاتی بدەی. ئەگەر بێی دەتخنکێنم»

ئەحمەد خان کیژی پاشای مارە کرد و حەوت شەو و رۆژ زەماوەندی کرد.

پاشە ئەوان لە خۆشی و شادی دا رادەگرین و دەچین بزانین مار چدەکا.

مارە دیسان چوە ژووری کیژی پاشای وڵاتی دراوسێی ئەوان . هەموو خەڵکی کۆشکی پاشا کۆ بوونەوە و هیچیان بۆ نەکرا. یەک لە خزمەتکاران گوتی:« لە وڵاتی دراوسێمان ئەحمەد خانێک هەیە تەنیا ئەو دەتوانێ چاری بکات. بە دوای ئەحمەد خانیان دا نارد. ئەو ترسا و لە دڵی خۆیدا گوتی:« ئێستا چبکەم.؟ ئەگەر نەچم پاشا دەمکوژێ. بچم مار دەم خنکێنێ.!»

ئاخرەکەی بریاری دا بچێ. چوە ژووری کیژی پاشا و دیتی مار لە ملی کیژەکە هالاوە و هاتوە بیخنکێنێ. مار کە چاوی بە ئەحمەد خان کەوت، ویستی خۆی باوێتێ و بیخنکێنێ. ئەحمەد خان گوتی:

– راوەستە. من نەهاتووم کیژی پاشا نەجات بدەم. هاتم ئاگادارت بکەم کە ژنەکەم لە چالاو هاتۆتەوە دەر و بە دوات دا دەگەرێ.

مار کە ئەوەی بیست، کیژی پاشای بەردا و رایکرد.

کە وابوو پیاوان سەر کۆنە مەکەن کە بە ژنەکانیان ناوترن. ژن ئەگەر خەراب وبێحەیا بوو کەس پێی ناوێرێت.

# ژنی بە مەکر ٨

ڕۆژێک مێرد بە ژنەکەی گوت: « قەت ناتوانی فریوم بدەی.»

ژن لە قاقای پێکەنینی دا و گوتی :

- دەبڕۆ. هەر کاتێ بخوازم بەلایێکت بە سەر دێنم هەر باسی مەکە.

- تۆ! ژنی بێ ئاقل چۆن دەتوانی لە بەرانبەر ئاقڵی پیاو دا خۆ بنوێنی.؟

ئاخـــرەکـــەی ڕۆژێک پیـــاوەکـــە چوە مـــەزرایە جـــوتـی بکا. ژن بریاری دا گاڵتـەیەکی لە گەڵ بکا. چوە بازار و ماسی تازەی کڕی و بۆ مێـردەکەی بردە مەزرا و گوتی: « تا تۆ نانەکەت دەخۆی، من دەچم بزانم جوتت چاک کردوە یان نا.؟

- ژن بە خـەتی جوتیدا دەچوو، لە چەند شـەقاوێکدا مـاسـیـەکی دەخسـتـە خـەتی جوتی و دایدەپۆشی. هەموو خـەتەکان گەڕا و گەڕایەوە پەنا مێردەکەی دانیشت و نازی کرد و بە زمانێکی شیرین و گاڵتە دەستی بە قسان کرد.

نیو سەعاتی پێچوو، مێردە کە گوتی:

- باشە. هەستە تۆ بڕۆ تا من زەویەکەم بکێڵم.

ژنەکە وەلامی دایەوە :

- ڕاوەستە جارێکی تر با لە گەڵ تۆ بە خەتی جوت دا بێم، پاشان دەڕۆم. مـێـرد دەسـتـی کـرد بە کـێـلان و ژنەکـەش لـە گـەڵ ئەو دەڕۆیشت. دوو هـەنگاو ڕۆیشتبوون کە ماسی لە ژێر گاسن هاتە دەر.

ژنەکە گوتی : « بزانە هاتنی من چەندی خێر پێوە بوو. داخـوا قەت خـودا نیعمەتێکی ئاوای بە نسیب کرد بووی.؟

برێکـی دیکە ڕۆیشـتن مـاسـیـیـەکی دیـکەش لە ژێر گـاسـن هـاتە دەر. ژن مـاسـیـەکـانی هەڵگرت و بردنـیـەوە مـاڵێ و سـووری کردنەوە. سـۆوسـیـشی پێدا

کرد. ئێوارێ مێردەکەی هاتەوە و بانگی کرد:« نافرەت ماسی بێنە !
- ماسی چی ؟
- چۆن ماسی چی؟ کام ماسی ؟ ئەو ماسیانەی کە لە زەوی دەرم هێنان.
ژن هاواری کرد و گوتی :
- ئەی هاوار! خەڵکینە بگەنە هاوارم. مێردەکەم شێت بوە! کەس دیتوویە کە ماسی لە زەوی بگیرێ؟
دراوسێکان بە غار هاتن و پیاوەکەیان گرت و لە کۆڵەکەیان بەست. شەو کە خەڵک بڵاوەی کرد، پیاوەکە پاڕاوە و گوتی :
- من لەو کۆڵەکە بکەوە. بێگومان خەونم دیبوو کە ماسیم لە زەوی گرتوە.- نا. ئەگەر بێکەمەوە لێم دەدەی.
- بە وەجاخ و بە گیانی منداڵەکان دەستت لێنادەم. ژنەکە لە کۆڵەکەی کردەوە و دەوری سۆسی لە پێش دانا و سەری ماسی لە ژێر سۆس هاتە دەر. مێردەکە بە ترسە وە گوتی:« ئەی هاوار دیسان خەون دەبینم. شتی سەیرم دێنە بەر چاو.
- چ دەبینی ؟ چیت دێتە بەر چاو؟ دیسان ماسی دەبینی ؟
- بەڵێ !
- چما تۆ نەتگوت کە ناتوانی فریوم بدەی ؟ ئێستا بینیت کە ئاقڵی پیاوان هیچ ناهێنێ. ئەوەی گوت و لە قاقای پێکەنینی دا.

# ژن و مێرد ٩

پیاوێک بوو ژنێکی جوان و میهرەبانی هەبوو. بەڵام منداڵیان نە بوو. پیاوەکە کاری دەکرد و بەردی قورسی هەڵدەگرت. بە بوونی ئەو ژنە باشە ئەوەندە دڵخۆش بوو کە بەردی قورسی بە هاسانی هەڵدەگرت. ڕۆژێک پاشا و وەزیر بە کن ئە و دا تێدەپەڕین.

پاشا بە وەزیری گوت:« سەیری کە ئەم پیاوە چەندە بە توانایە.»

وەزیر گوتی:« لێرەدا هێز لە گۆڕێدا نیە، تەنیا دڵی خۆشە.»

– نا .. مەسەلەی هێزە. لە نێوان پاشا و وەزیر دا باس دەستی پێکرد. وەزیر گوتی :

– وەرە گرێو بکەین. من دەڵێم ئەم پیاوە یا دڵی خۆشە، یا ژنی جوانە، یا زۆر دەوڵەمەندە، یا منداڵی باشی هەن. یەک لەوانەیە.

پیرێژنێکیان نارده ماڵی کابرا . گوتیان برۆ بزانە چی لە ماڵێدا هەیە. پیرێژن چوو دیتی هیچی نیە. منداڵیشی نیە. بەڵام ژنەکەی جوانە. پیرێژن هاتەوە و گوتی : « تەنیا ژنە کەی جوانە .»

پاشا فیکری کردەوە : کە چیکەم ژنە کەی لێ بستێنم.» بە پیرێژنی گوت :

– پارەیەکی زۆرت دەدەمێ، هەوڵ بدە فریوی بدەی. پیرێژن چوە لای ژنە کە و گوتی:

– تۆ کە منداڵت نیە، سەروەت و سامانت نیە. مێردی کرێکارت بۆ چیە. ئەم هەموو جوانیە لە گەڵ کێ دەبەیە سەر.

– چی بکەم ؟

– بەرەڵای کە ، وەرە مێرد بە پاشا بکە.

– باشە وا دەکەم. مێرد لە کار هاتە وە دیتی رەفتاری ژنە کەی گۆڕاوە.

بەر لەوە کە مێردەکەی دەهاتەوە، ژن پێڵاوی لە پێ دەر دەهێنا، لاقی دەشوشت، نان و چای بۆ ساز دەکرد. لە سەر جێدا سەری دە خستە سەر سینگی مێردەکە و خەوی لێدەکەوت. ئێستا پیرێژن فریوی دابوو. تەنانەت سەیری مێردەکەشی نە دەکرد. مێرد نازاری دەکێشا و دەیگوت:« چقەوماوە کە ژنم سەیرم ناکا ؟ هەر چۆنێک بێ چوە سەر کار و ویستی بەردێک هەڵگرێ، نەیتوانی.

وەستا لێی پرسی :« چیە.. چت لێقەوماوە.؟

– نازانم ،هەر دەڵێی بارێکی قورس لە سەر دڵم دانراوە.

– چیت لێ قەوماوە ؟

– ژنەکەم نایەوێ سەیرم بکا .

وەستا گوتی برۆ مەسینەکەت بشکێنە و پاشان دەست بە گریان و هاوار بکە. ژنەکەت دەپرسێ بۆ وا دەکەی.؟ بڵێ : مەسینەکەم شکاوە» دەڵێ: « باشە. شکاوە یەکی دیکە بکڕە.» لە وەڵام دا بڵێ : « نا بە مەسینەی خۆم ڕاهاتبووم. دەسکی خۆش بوو، ئاوی باش لێ دەهاتە دەر. یەکی تازە بکڕم . چوزانم باشە یا خەراب»

مێرد قسەی وەستای گرتە گوێ و بە کاری هێنا . ژن کە دیتی مێردەکەی بۆ مەسسینە دەگری و ناتوانێ لە گەڵ هی تازە ڕابێ. لە دڵی خۆیدا گوتی: « ئاخر منیش بە مێردەکەی خۆم ڕاهاتووم. ئەگەر ببمە ژنی پاشا دیسان دەبێ بەویش ڕابێم. باشترە هەر لە گەڵ مێردی خۆم ژیان بەرمە سەر و بمێنمەوە.» جارێکی تر لە گەڵ مێردەکەی ڕێک کەوتەوە.

## دوو مەلا ١٠

مەلایەک دوو ژنی هەبوون و مەلایکی تر کە ڕەفیقی بوو، ژنێکی هەبوو. ئەوەی دوو ژنی هەبوو هەمیشە بەیانی زوو لە خەو هەڵدەستا و دە چوو لە سەر منارە بانگی دەدا، ئەوەی ژنێکی هەبوو وەدرەنگی دەکەوت و نەیدەتوانی زوو لە خەو هەستێ و بکاتە ڕەفیقەکەی. ڕۆژێک مەلای یەک ژنە بە مەلای دوو ژنەی گوت:

- بێگومان تۆ دەچیە بەهەشت. هەر چەندی دەکەم ناتوانم بەیانیان زوو لە خەو هەستم.

- بەڵێ وایە فەقێ! تۆ ژنێکت هەیە هەتا دەگەڕێ گۆرە وی و کەوشەکانت دەدۆزێتەوە و نانت بۆ ساز دەکا، دەبێتە ڕۆژ و درنگ دەبێ. بەڵام وەزعی من فەرقی هەیە. ژنەکانم یەکیان کەوش و گۆرەویم بۆ دێنێ، یەکیان نان ئامادە دەکا و مێزەرم بۆ دێنێ و زوو دەگەمە سەر منارە.

مەلای یەک ژنە بیری کردەوە و هەر ئەو ڕۆژە چوو ژنێکی دیکەشی هێنا. لای ڕۆژ ئاوا کە هاتەوە ماڵێ، دیتی شەڕە ژنە و یەک دەڵێ :

- ئەی خاک بە سەری مەلا!

ئەویتر دەڵێ: ئەی تف لە ڕیشی مەلا!

- ئەی تف بە گۆڕی بابی مەلا

- ئەی تف بە گۆڕی دایکی مەلا!

شەو داهات و جنێو و شەڕ نە بڕایەوە. مەلا ناچار هەستا لە ماڵێ دەر کەوت و چو لە سەر منارە خۆی مات کرد. دیتی کەسی لێ نیە و دانیشت. تاوێکی پێچوو دیتی مەلای ڕەفیقی هات و گوتی:

– پێم نە گوتی کە پیاوی دوو ژنە هەمیشە زووتر دە گاتە سەر منارە.

– خـودا بتگریٚ ! ئەم ئاگرەی دە مـاڵی تۆ بەر ببـوو، دە مـاڵی منیـشت بەردا .!

## دوو خوشک ١١

کابرایەک دوو کیـژی هەبوون، هەر تکی بە مێرد دان و رۆیشـتن. مـاویەکی پێچوو لە حاڵیان بێخـەبەر بوو. نەیدەزانـی ژیانیـان چۆنە. خـێزانـی پێی گـوت:« ماومیەکی لە کچەکانمان بێخەبەرین. بچوو بزانە چۆنن.

کابرا دیاری بۆ کیژەکانی کڕی و کەوتە ڕێ. چوە مـاڵی کـچە گەورەکەی دیتی بە تەنیا لە ماڵێ دانیشتوە. باب و کچ یەکتریان لە ئامێز گرت و یەکتریان ماچ کرد و دانیشتن و دەستیان بە قسان کرد. باب پرسـی :

– باشە کیژم بڵێ بزانم وەزع و حاڵت چۆنە.؟

کـچـەکە گـوتی: « با بـچینە بەر دەرگـا پێت دەڵێم. چـوونە بەر دەرگـا و کچ گوتی:

– ئەو مـەزرایە دەبینی هەمووی زەوی ئێـمـەیە و کردوومـانەتە گەنم. ئەگەر خوا بکا و باران بباریٚ، گەنمێکی زۆرمان دەبێ و بەشـی ئازوقەی چەند ساڵمان دەکا و بۆ فرۆشتنیش دەمێنێتەوە.

زاوای کـابرا ئێواریٚ هاتەوە. نانیـان سـاز کـرد و شێـویان خوارد و پاشـان خـوا حافـیزی کرد و کـابرا چوە مـاڵی کـیژی دووهـەمی. تەمـاشـای کرد بە تەنیـا دانیشـتوە. کچ بە دیتنی بابی شاد بوو، یەکتریان مـاچ کرد و بابی پرسـی :

– باشە کچم وەزع و حاڵتان چۆنە. ژیان چۆن بە سـەر دەبەن.؟

– بابە ! با بچینە حەساری جا پێت دەڵێم.

چوونە حەسارێ، بابی دیتی حەسار پڕە لە دیزە و گۆزە و لولێنە و هەوری گڵ، کیژە کە گوتی :

– بابە دەبینی. ئەگەر خوا بکا باران نەبارێ و هەوا هەور و شەدار نەبێ، ئەوانە وشک بنەوە، دەیان فرۆشین و پارەیەکی باشمان دەست دەکەوێ و بەشی چەند ساڵمان دەکا.

باب لە ماڵی ئەو کیژەش نانی خوارد و گەڕایەوە ماڵی خۆیان. ژنەکەی لێی پرسی:

– باشە کچەکان چۆنن و ژیانیان چۆن دەبەنە سەر .؟

باوک هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی: « بڵێم چی. بێگومان حاڵی یەکی لە کچەکانمان زۆر خەراب دەبێ. ئەگەر باران بباری کیژە بچوکەکەمان فەقیر و نابوت دەبێ. ئەگەر باران نەبارێ، کچە گەورەکەمان هەموو شتێکی لە کیس دەچێ.!

# عادەت ( ڕاهاتن) ١٢

گەنجێکی دەوڵەمەندی بێ دایک و باب هەبوو. ویستی ژنێک بێنێ کە بە تەنیا هەموو کارەکانی ماڵێ بکات. گەڕا گەڕا، هیچ کیژێک بەوە ڕازی نەبوو. بەڵام ڕۆژێک کچێکی جوان پەیدا بوو گوتی :

– من ئامادەم هەموو کاری ماڵێ بە تەنیا بکەم. تەنیا عادەتێکم هەیە کە گوێم لە دەنگی دەهۆڵ و زوڕنا ی بوکێ بوو، واز لە هەموو کارێک دێنم و دەچمە شایی. ئەگەر بەم عادەتەی من ڕازی شوت پێدەکەم.

گەنجە کە گوتی : موافقم. بەڵام منیش عادەتێکم هەیە. سەودایان سەری گرت و بوکی هێنا ماڵێ. ماوەیەکی زۆر بە خۆشی ڕایان بوارد و ژن هەموو کارەکانی دەکرد و پیاویش ڕازی بوو، وەرزی دروێنە هات و کابرا چەند کرێکاری گرت و لە گەڵیان چوە مەزرایە. کاتی نیوەڕۆ کەس نانی بۆ نەهێنان. پیاوەکە لە بیری چوو بوو کە ئەو ڕۆژە لە گوندی زەماوەندە. بە کرێکارەکانی گوت؛

– من دەچمەوە و ئێوەش سەعاتێکی تر وەرنەوە.

سواری ئەسپ بوو کەوتە ڕێ. کە گەیشتەوە گوندی دەنگی دەهۆڵ و زوڕنای بیست، وەبیری هاتەوە کە دەبێ ژنەکەی چوو بێتە شایی. هاتەوە ماڵێ. دیتی مەڕ و بەرخ پێکەوە کۆ بوونەوە، هەموو شت تێکدراوە. چەند کەسی لە جیرانەکان بانگ کرد، یەک مەڕەکانی بردە ئاغەڵ و یەک ئاگری کردەوە و یەک خەریکی نان ساز کردن بوو. پاش سەعاتێک نان ئامادە بوو، کرێکار هاتنەوە، نانیان خوارد و ڕۆیشتن. لاو دۆشەکی ڕاخست و دارێکیشی لە ژێر دۆشەکدا شاردەوە، لیباسی کردە بەر و چوە کۆڕی شایی. دیتی ژنەکە هەڵدەپەڕێ و ئەوەندەش جوانە کە پیرە مێردیش ڕووی لێ وەر ناگێڕن.

چوه کن زورنا ژەن و پارەیەکی دایە و دەستی ژنەکەی گرت و لە گەڵ ژنەکە دەستی کرد بە هەڵپەڕین. ئەوەندە هەڵپەڕین تا هیلاک بوون. ژنەکەی ویستی بچنەوە ماڵێ. چوونەوە، نانیان خوارد و چوونە سەر جێ. نیوە شە و کابرا داری لە بن دۆشەگ هێنا دەر و کەوتە گیانی ژنە کە و دار کارییەکی باشی کرد و لێی نوست. بەیانی کە هەستا دیتی هەموو سەر و چاوی ژنەکەی رەش و شین هەڵگەڕاوە. هاواری کرد:

– ئاخ خوایە ئەوە چبوە، چیت بە سەر هاتوە ؟ بۆچ وات لێهاتوە؟

– بێگومان شەوی رابردوو عادەتەکەت گوڵی کرد بوو، نەت دەزانی چەدەکەی و منت دار کاری کرد و ئەوەت بە سەر هێنام، گیانەکەم وەرە قەرار دابنێین کە من ئیتر نەچمە شایی و تۆش ئەو عادەتە تەرک بکە .

# سمایل چاوەش ١٣

ڕۆژێک پاشا بە وەزیری گوت:« بڵێ بزانم کام خۆراکە ناخورێ، کام ئەسپە ناگرێ بە ئەسپی ناو بەری، کام ئینسانە نا توانی ناوی ئینسانی لێ بنێی. چل ڕۆژت مۆڵەت بێ، ئەگەر وەلامی ئەم مەتەلانە نە دەیەوە، سەرت دادەنێی.!

وەزیر مانگێک هەولی دا تا وەلامێک بدۆزێتەوە و هیچی بۆ نەکرا. تەنیا دە ڕۆژی مابوو کە سەری تێدا بچێ.

ڕۆژێ سەر گەردان لە کۆلان دەسوڕاوە. دیتی کەچەلێک دانیشتوە پیس پۆخل، چلمی هاتۆتە خوار. وەزیر تفێکی لێکرد و تێپەڕی. کەچەڵ بانگی کرد و گوتی:

– ڕاوەستە. بۆ وا توند تێدەپەڕی؟ پێت وایە لە من ئاقڵتری؟ دەزانم پاشا مەتەلۆکی پێگوتوی و ناتوانی وەلامی بدیەوە. بەم زوانە لە سەرت دەدا.

وەزیر واقی وڕ ما. گەڕاوە و چوە کن کەچەڵ و گوتی: « تۆ لە کوێ دەزانی. ؟

کەچەڵ گوتی: « لە کوێ دەزانم ! لە وتوە دەزانم. ئەوەش دەزانم کە دە ڕۆژ زیاتر تەمەنت نەماوە.»

وەزیر بە تکا و پاڕانەوە گوتی :« کەچەڵ گیان، گوێ بدەیە. تۆ وەلامی مەتەلی پاشا نازانی کە پێم بڵێی.؟»

کەچەڵ گوتی :

– ئەوە زانینی ناوێ. گوێ بگرە. ئەم خۆراکەی کە ناتوانی بیخۆی، خەیارێکە لە سێبەر دا پێدەگا و هەتاوی وێ نە کەوتبێ. تاڵ دەبێ. هەر چەندە خواردەمەنییە، بەلام ناخورێ. بەلام ئەم ئەسپەی کە بە ئەسپ ناو نابرێ،

ئەسپێکە لاقی چەپە و دەستی ڕاستەی سپیە و قەشانە ، جگە لەوە ئەسپی ئاوا بەد فەڕە، هەر چەند ئەسپە، بەڵام ناکرێ بە ئەسپی ناو بەری. ئەمما کەسێکی کە نا توانی بە پیاوی بزانی ، کەسێکە ژن دێنێ و بە زاوا دەچێتەوە سەر ماڵی خەزوری.

وەزیر فرە شاد بوو، سوپاسی کەچەڵی کرد و بە تاڵوکە ڕووی کردە کۆشکی پاشا و وەڵامەکانی بە پاشا گوت. پاشا گوتی :

– ئەی وەزیر، ئەگەر بە ئاقڵی خۆت وەڵامی مەتەڵەکانی زانیوە، بۆچی ڕۆژی هەوەڵ نەت گوت. بڵێ بزانم کێ فێری کردووی ؟

وەزیر گوتی : کەچەڵ فێری کردووم.

پاشا گوتی: بچوو کەچەڵی بێنە ئێرە.

وەزیر بە ناچاری چوو کەچەڵی هێنا کۆشکی پاشا.

شا سەیرێکی کەچەڵی کرد و دەستی بە ریشی خۆیدا هێنا و هیچی نە گوت. کەچەلیش دەستیکی بە لاجانگییەوە نا. پاشا پێکەنی و گوتی :« کەچەڵ بۆ دەستت بە لاجانگەوە نا.؟

– قیبلەی عالەم ، تۆ بۆ چی دەستت بە ریشت دا هێنا؟ دەت ویست بڵێی کە « تەماشا کە، شتی چەند سەیر لەم دنیایە پەیدا دەبێ.؟» من دەستم بە لاجانگمەوە ناو لە وەڵامدا گوتم:« ئاقڵی ئینسان لە سەری دایە، نەک لە ریشی دا.»

کەچەڵ لە بەرانبەر پاشا دانیشت و شا پرسی :

– ناوت چیە .؟

– سمایل چاوەشم پێ دەڵێن.

کەچەڵ و پاشا لە ئاخاڤتن دابوون. لەو کاتە دا تەتەرێک لە لایەن شای ئێرانەوە گەیشتە خزمەت پاشا و گوتی :

– پاشا سلامەت بێ. شا بە منی گوتوە کە بێمە لات و پێت بڵێم کە خێرا کیژی خۆتی بدەیەی.

پاشا بێدەنگ بوو، وەزیر هیچی نەگوت. دەور و بەری بارەگای پاشاش بە

جارێ بێدەنگ بوون. بەڵام سمایل چاوەش گوتی:

– نایدەم. کاتێ سمایل چاوەش ئەوەی گوت، تەتەر جەغزێکی لە سەر عەرز کێشا. سمایل چاوەشیش دوو جگی لە گیرفان هێنا دەر و هاویشتیە نێو جەغزەکە. تەتەر هیچی نە گوت و بێدەنگ لە کۆشکی پاشا وەدەر کەوت. پاشا لە کەچەڵی پرسی :

– مانای ئەوانە چی بوون ؟

– ئاخ، قیبلەی عالەم؟ تۆ کە سەرت لەم شتانە دەر ناچێ، چۆن وڵات بە رێوە دەبەی.؟ ئەو جەغزەی کە لە سەر عەرز کێشای مانای ئەوە بوو کە شار گەمارۆ دەدەن. ئەو جگانەی من هاویشتمە نێو جەغزەکە، تێمگەیاند کە ئێمە شەڕ دەکەین.

پاش چەند رۆژ شای ئێران سێ شێری بۆپاشا نارد کە هەر سێکیان وەک یەک بوون و ویستی بڵێن کە کامەیان هی شەخسی شایە و کامیان هی وەزیرە و کامە یان هی وەکیلە. هەموو سەیری یەکیان کرد و هیچیان نە دۆزیەوە، چونکە هەر سێکیان وەک یەک بوون. سمایل چاوەش گوتی :

– من دەتوانم خاوە نی شێرەکان بناسم. ئاگر بێنن، شێری یەکەمی لە ناو ئاگر نا. تیغەکەی نە گۆڕا بوو. ڕەنگی هەر وەک خۆی بوو.

سمایل لەو لای دانا و گوتی :« ئەوە هی پاشایە.

پاشان شێری دووەمی خستە ناو ئاگر. نوکی رەش ببوو. گوتی :« ئەمەیان هی وەزیرە.

بەڵام کاتێ شێری سێیەم لە ئاگر وەنیزیک کەوت، هەمووی رەش هەڵگەڕا. گوتی: « ئەمەیان هی وەکیلە.

مەسەلەکەیان بە پاشای ئێران ڕاگەیاند. لە ئاقڵ و وریایی پاشا سەری سوڕ ما. دوو ماینی هاو ڕەنگ و هاو قەدی نارد و دەیویست بزانن کامیان دایکە و کامیان جوانوە. هەموو بیریان کردەوە ، بەڵام وەڵامی راستیان نەبوو.ماینەکان وەک یەک بوون.

سمایل چاوەش گوتی:

– من دەتوانم لێکیان جیا بکەمەوە. هەر تکیان بخەنە تەویلەیەکی تاریکەوە. دەرگایان لە سەر دابخرێ. هەر چەندی خواردیان تفاقیان بدەنێ، بەڵام ئاویان نەدەنێ. سێ ڕۆژ لە تەویلە ڕایان بکرن و ڕۆژی سێیەم بەریان بدەن. دایکەکە پێش دەکەوێ و جوانوەکە بە دوایدا.

ئەو کارەیان کرد. هەر یەکە دارێکیان دە ملی کردن و ناوی دایک و جوانویان لێ نووسین و بۆ شای ئێرانیان ناردنەوە.

پاشای ئێران ویستی جارێکی دیکەش ئاقڵ و بیری پاشا تاقی بکاتەوە. لولەیەکی ماربێچی چل گەزی بۆ پاشا نارد و گوتی: « داوە دەزوێکی بە ناو دا بەرن و هەر دوک سەری پێکەوە گرێ بدەن.

هەموو دەور و بەری بارەگا کۆ بوونەوە و بیریان کردەوە کەس ئاقڵی پێ نەشکا.

سمایل چاوەش گوتی: « داوە دەزوێک بێنن تۆزێ هەنگوین و نەختێک مێو بێنن. کاتێ هەموو شتەکانیان هێناسمایل چاوەش سەری دەزوکەی بە هەنگوین کرد و نەختێک مێوی پێوە نووساند و خستیە پێش کونە مێروو. میرولەیەک مێوەکە گرت و دەزووی بە دوای خۆدا کێشا، مێرولە کەیان خستە کونی لولە کە و مێروو ڕۆیشت و لەو سەری هاتە دەر و سەرەکانیان لێک گرێدا و بۆ پاشای ئێرانیان نارد. پاشای ئێران کە وای دیت تەتەرێکی دیکەی نارد و داوای کرد کە: « چونکە ئەسپەکانی ئێمە لێرە دەحیلێنن، ماینەکانی ئێوە ئاوس دەبن. جوانوەکانیان هەموو هی ئێمەن. دەبێ جوانوەکان بدەنەوە بە ئێمە.»

پاشا سەری سوڕ ما و نەیدەزانی چی وەڵام بداتەوە. سمایل چاوەش گوتی:

– پاشا سڵامەت بێ. دە پازدە زەلامی ئازام بدەیە تا بچمە کن پاشا وەڵامی بدەمەوە.

پاشا گورج دوازدە کەسی لە ئازاترین شەرکەرەکانی دایە. سوار بوون ڕەوانەی ئێران بوون. کە گەیشتنە سنووری ئێران هەر سەگێکی دیتیان کوشتیان. خەبەری سەگ قڕانیان بە پاشا گەیاند. شا پیاوەکانی خۆی نارد.

سمایل چاوەش هەموو پیاوەکانی شای گرت و لە گەڵ خۆی بردنی بۆ کۆشکی شا.

پاشا لە سمایل چاوەشی پرسی : « ئەو سەگانەت بۆ کوشتوە.؟»

سمایل چاوەش وەڵامی داوە: « سەگەکانی تۆ بە کاری هیچ نایەن. »

– ئەم قسانە چیە؟ بەڵگەت چیە بۆ ئەم قسانەت.؟

– من لە گوندی خۆمان شوانم. لە پڕ گورگێک میگەلی پەلامار دا. هەر چەندی بانگی سەگەکانی تۆم کرد، هیچیان نەهاتن، گورگ مەڕەکانی منیان خوارد.

شا نەڕاندی و گوتی : « ئەوە شێت بووی. گوندی تۆ تا ئێرە ڕێگای مانگێکە. سەگی من چۆن دەنگی تۆ دەبیسن.؟

سمایل چاوەش گوتی: « ئەدی چۆن ئەسبی تۆ بحیلێنن، ماینەکانی ئێمە ئاوس دەبن. شتی وا چۆن دەبێ .؟

شا قاقا پێکەنی و گوتی : تۆ بردتەوە. دیاری دایە و خەڵاتی کرد و بە ڕێی کردەوە و ئیتر وازی لە پاشا هێنا.

پاشا کە ئەو هەمو دیاری و شتە باشانەی دیت کە دراون بە سمایل چاوەش، کیژەکەی خۆی لێ مارە کرد. حەوت شەو و ڕۆژ شایی و زەماوەندی بۆ ساز کرد و ئەوان بە ئاوات گەیشتن و ئێوەش بە ئاوات بگەن.

# کیژی ئاقڵی پاشا ١٤

پاشایەک بوو کچێکی هەبوو. ڕۆژێ لە ڕاوێ گەرایەوە و کیژە کەی بانگ کرد. هێلکەیەکی لە سەر سەری دانا و تیرێکی هاویشتێ و هێلکەی بەرداوە، لە کچەکەی پرسی: « کیژم ، ئەنگێودیەکی باشم یان نا ؟.»

کیژەکە گوتی :

– بابە فیز لێ مەدە، هونەرێکت نە نواندوە، کار کاری ڕاهاتنە.

شا تورە بوو بە وەزیری گوت: « ببیە بیکوژە.»

وەزیر کیژەکەی برد لە جەنگەڵ بەرەڵای کرد و هاتەوە گوتی؛ کوشتم

کیژ لە جەنگەڵ دەسوڕاوە توشی شوانێک بوو. شوان پرسی:« فەقیرۆکە دەچیە کوێ.»

– تەنیا و بێکەسم . بمکە بە کیژی خۆت. شوان ڕازی بوو ، گوتی: « منداڵم نیە، تۆ دەبیە منداڵی من. شوان و کچ کەوتنە ڕێ و چوونەوە ماڵێ. نانیان خوارد و خەوتن. بەیانی کیژەکە مروارییەکی لە پرچانی کردەوە و دای بە شوان و گوتی :

– بابە ئیتر مە چۆ بەر مەڕی. ئەم مرواریە بەرە بفرۆشە. دەوڵەمەند دەبی و چیت دەوێ بکڕە.

شوان بردی و فرۆشتی. ڕۆژی دوایە کیژەکە گوتی: « با بچین هێندێ بگەڕێین. ڕۆیشتن گەیشتنە بناری کێوێک. شوێنێکی جوان بوو. کانیەک لە زەوی هەڵدەقوڵی. کچ گوتی:« بچۆ کن پاشا و تکای لێبکە ئەم زەویەت پێ بفرۆشێ.»

شوان چوە کن پاشا و داوای لێکرد کە ئەو پارچە زەویەی بناری کێوی

پێ بفرۆشێ. پاشا کە دیتی شوان هاتوە داوا دەکا زەوی بکڕێ، سەری سور ما: شوان پارەی زەوی کڕینی لە کوێ بوە،؟ پێی گوت:« زەویەکە بۆ تۆ و پارەشم نە گەرەکە.

شوان گەڕاوە و گوتی: « پاشا ئەم زەویەی پێ بەخشین،

کچەکە مرواریەکی دیکەی دایە و گوتی بڕۆ بە تاجرێکی بفرۆشە و بڵێ لە جیاتی پارە، کۆشکێکی چل تەبەقە لەو جێگایە دروست بکا. لە گەڵ بازرگانێک رێک کەوت و کۆشکی چل تەبەقە ئامادە بوو. کچ بە شوانی گوت:

- بابە، بچۆ بازار مانگایەکم بۆ بکڕە کە تازە زابێت و گوێلکی نێری هەبێت. شوان چوە بازار ومانگاو گوێلەکەی کڕی و هێنانیەوە. کیژەکە گوێلەکەی بردە قاتی چلە و هەموو رۆژێ سێ جار لە ئامێزی دەگرت و دەیهێناوە خوارێ، مانگاکەی دەدۆشی و گوێلک دەیمژت و دەیبردەوە سەرێ.

پێنج ساڵی تەواو ئەم کیژە گوێلکی دە بردە سەر و دەیهێناوە خوارێ. گوێلک گەورە ببوو. رۆژێ پاشا لەو جەنگەڵە ڕاوی دەکرد. کیژەکە بە شوانی گوت:« بچوو پاشای بۆ شەو بانگێشتن کە.»

شوان چوە کن پاشا و گوتی :

- ئەی سولتانی میهرەبان ئەمشەو میوانی من بە .

پاشا قبوڵی کرد و ئێوارە چوە کۆشکی شوان. کیژەکە نانی ساز کرد و خۆی بۆ مانگا دۆشین و هێنانە خواری گوێلک چوە سەر و مانگای دۆشی و گوێلکی بردەود سەر. پاشا کە ئەوەی دیت سەری سوڕ ماو دەستی لە خواردن هەڵگرت و بانگی کرد:

- ئەی شوان! شتێکی سەیر دەبینم. وە موجیزە دەچێ. باسی کچکەتم بۆ بکە.

کچ گوێی لێ بوو هات بە پاشای گوت:

- ئەی قیبلەی عالەم! نە سەیرە و نە موجیزەیە، کار کاری ڕاهاتنە. پاشا بە بیستنی ئەم قسەیە گریا و قسەی کیژەکەی وەبیر هاتەوە کە کاتی خۆی وای پێگوتبوو.

کیژەکە پرسی : « بۆ دەگری.؟»

پاشا باسەکەی بۆ گێڕاوە و گوتی : « کچەکەم بێ تاوان کوشت.»

کیژەکە پرسی :« ئەی پاشا ئەو کەسەی کچەکەتی کوشتوە زیندوە ؟»

– بەڵێ زیندوە.

– بیهێنە ئێرە،

پاشا خزمەتکارەکەی نارد و وەزیری هێنا. شا لێی پرسی:

– گوێ بگرە. داخوا ئەو ڕۆژە تۆ کیژەکەی منت گوشت.؟

– ئەی قیبلەی عالەم ئەمانم بدەیە تا ڕاستی بڵێم. شا گوتی: « ئەمانم دایەی »

– ئەو ڕۆژە کیژەکەم نە کوشت.

کچەکە گوتی: « ئەی پاشا ئەگەر ئێستا کیژەکەت بێنمە کن تۆ، سزای نادەی .؟

– بەڵێن دەدەم

کچ چارشێوی لە سەر خۆی لادا و پاشا ناسیەوە و لە شادیدا نوقم بوو گوتی:

– هەقتە. دەر کەوت تۆ لە من ئاقڵتری. کیژەکەی دا بە وەزیر و شوانی بردە کۆشکی خۆی. شایی و زەماوەندیان کرد.

## قچاقی ساختەچی ١٥
### ( قچاق کەسێکی روحانیە کە یەزیدی لایان وایە شتی غەیبی دەزانێ)

ژن و پیاوێکی پیر و فەقیر هەبوون و هیچیان نەبوو. رۆژێ پیرەمێرد گوتی :

چبکەین ؟ چۆن بژین و نانێک لە کوێ پەید کەین ؟

ژنەکەی گوتی : « لیباسی روحانیەک پەیدا کە ، کتێبێکی دەست دەیە و برۆ لە نێو شار خەڵک فریو بدە. خۆ دەبێ بەجۆرێک نان پەیدا کەین.»

هەر وەک ژن گوتبووی، ئاوای کرد. بە نێو شار دا کەوتە رێ. دیتی کوڕی پاشا لە گەڵ منداڵان جگێن دەکا. جگی کوڕی پاشا کەوتە قەڵشتێکەوە. منداڵان هەوڵیاندا و نەیان دیتەوە. قەڵشتەکەیان داپۆشی. کوڕی پاشا بە گریان چۆوە کن دایکی. قچاقی ساختە چی دەیزانی کەوتۆتە کوێ. ژنی پاشا چوە ئەو شوێنە کە منداڵ جگێنیان لێدەکرد. دیتی غەیبگۆی فاڵگرەوە لە وێ دانیشتوە. پێی گوت :

– ئەگەر بە راستی لە غەیب دەزانی، بزانە جگی کوڕەکەم کەوتۆتە کوێ، بیدۆزەوە.

قچاق گوتی: « بچۆوە ماڵێ. سەعاتێکی دیکە دێم و دەیهێنمەوە.»

ژنی پاشا رۆیی. قچاق جگی لە قەڵشتێ هێنا دەر و بۆ ژنی پاشای بردەوە. ئەویش سکە ئالتونێکی دایە. غەیبگۆ چۆوە ماڵ و بە ژنەکەی گوت:

– گوڵێ! بۆ ئیمرۆ شتێکم پەیدا کرد و بزانین بەیانی چۆن دەبێ.

رۆژی دوایی قچاقی ساختەچی، چوە باغچەی پاشا. تەماشای کرد کچی پاشا لە گەڵ کیژی وەزیر بە مرواری یاری دەکات. مرواری لە دەست کیژی پاشا کەوتە خوار. کچی وەزیر هەڵیگرتەوە و لە باخەڵی دا شاردیەوە. قچاق

چاوی لێ بوو. بە ژنی پاشایان گوت : کیژەکەت مرواری ون کردوە. ژنی پاشا بە دوای قچاقی دا نارد و گوتی :

– مرواری کیژەکەم بزر بوە. تکایە بیدۆزەوە.

غەیبگۆ گوتی: بچۆوە. من دەیدۆزمەوە و بۆت دێنمەوە. شاژن ڕۆی. غەیبگۆش چوە ماڵی وەزیر و لە پشت دەرگا دانیشت. دیتی کیژی وەزیر دێتەوە. غەیبگۆ بانگی کرد و گوتی :« کیژم! بۆ چی مرواری کچی پاشات لە باخەڵت دا شاردەوە. ئەگەر ڕاستی نەڵێی، ئابڕوت دەچێ. کیژی وەزیر ترسا و مرواریەکەی هێنا دەر ودایەوە بە قچاقی ساختە. ئەویش مرواری هەڵگرت و بردیەوە بۆ ژنی شا. ئەویش چەند سکە ئالتونی دایە. غەیبگۆ چۆوە ماڵ و بە ژنەکەی گوت:

گوڵێ ! ئیمڕۆش چەند ئالتونێکم پەیدا کردوە. ئیتر خۆمان پێ بەڕێدەچێ. بەڵام دەترسم کە لێمان ئاشکرا بێ و بەلایێکم بە سەر بێنن. غەیبگۆی ساختەچی کەم کەم ناو بانگی دەر کرد. شەوێک حەوت دز خەزێنەی پاشایان لێدا وتەواوی ئاڵتون و جەواهراتیان برد. پاشا بە دوای ساختەچی دا نارد و گوتی :

– بیست و چوار سەعاتت مۆڵەت بێ بچی خەزێنەی من بدۆزییەوە. دەنا لە سەرت دەدەم. غەیبگۆ بە نارەحەتی گەڕاوە ماڵ و بە ژنەکەی گوت : « گوڵێ تێدا چووم. »

بەڵام دزەکان ئاگایان لە غەیبگۆ هەبوو نیوە شەو دوو لە دزەکان چوونە پشت دەرگای قچاق، تا بزانن کابرا باسی چدەکا. کونێک لە چوار چێوەی دەرگای قچاق دا هەبوو، غەیبگۆ حەوت جوجەڵەی هەبوون بە کونەکە دا هاتنە وە ژوور. غەیبگۆ بە ژنەکەی گوت:« دوویان هاتوونەوە، پێنجیان ماون.»

دوو دزەکان گەڕانەوە و چوونە کن هەڤاڵەکانیان و گوتیان :« لەعنەت لە زاتی. هەر کە چووینە سەربان، گوتی:« دوویان هاتوون و پێنجیان ماون.» دزەکان ترسان و هەموویان چوونە سەر بان و لە کولانەوە گوێیان دا بزانن دەڵێ چی. لەو کاتە دا جوجەڵەکانی دیکەش هاتنەوە. قچاق بە ژنەکەی گوت:

- باشە. هەر حەوتیان هاتوونەوە.

دزەکان ترسان ، هاتنە خوار و چوونە کن غەیبگۆ. گوتیان : « ئێمە خەزێنەی پاشامان لێداوە. تکا دەکەین کارێکی وابکەی پاشا ئێمە نە کوژێ.»

قچاق گوتی: « بزانن من دوێنێش دەمتوانی لێتان لە هەرا بدەم. بەلام سەبارەت بە ژن و منداڵتان دڵم نەهات. بڕۆن هەرچی بردووتانە بیهێننە لای من و ئیتر بڕۆن و باستان ناکەم.»

دزەکان ئاڵتون و جەواهراتیان بۆ قچاق هێنا، ئەویش هەر یەکە چەند ئاڵتونێکی دانێ. گوتیان ئابڕومان نەبەی .

ڕۆژی دوایی پاشا ناردی کە غەیبگۆ بەرنە کن پاشا. غەیبگۆی ساختە چی گوتی :

- بڕۆن بە پاشا بڵێن، کاروانێک بنێرێ خەزێنەکەی بەرێتەوە.

پاشا کاروانی نارد و خۆشی هاتە ماڵی غەیبگۆ و گوتی :

- دەبێ ناوی دزەکانم پێ بڵێی.

- قیبلەی عالەم ناتوانم پێت بڵێم. چونکە پیرم ڕێگا نادا ناویان ئاشکرا بکەم.

پاشا خەزێنەی بردەوە و پیاڵەیەکی پڕ لە زێڕیشی دا بە قچاق.

ڕۆژێک قچاق لە ئاشی دەهاتەوە. بە پێش کۆشکی پاشادا تێدەپەڕی، پاشا لە گەڵ ژن و منداڵی لە هەیوانی کۆشک وێستا بوون و سەیری جادەیان دەکرد. کاتێ غەیبگۆیان دیت، پاشا گوتی :

تەماشا کەن ئەوە غەیبگۆی خۆمانە لە ئاشی دێتەوە. غەیبگۆ ڕیشی بە ئارد ببوو، دەستی هەڵێنا کە ئاردەکەی لە ڕیشی بکاتەوە. بەلام پاشا و ژنەکەی لایان وابوو کە ئەوان بانگ دەکا. لە هەیوان هاتنە خوارێ و چوونە کن غەیبگۆ. لە گەڵکو ئەوان هاتنە خوارێ، هەیوان ڕووخا. پاشا و ژنەکەی بە سەر سور مانەوە هاواریان کرد ئافەرین قچاق. چۆنت زانی هەیوان دەڕووخێ.؟ تۆ ژیانی ئێمەت نەجات دا. پاشا دوو پیاڵە زێڕی دا بە قچاق.

قچاق ناوبانگی دەر کرد. لە دنیا دەنگی دایەوە. ڕۆژێک پاشای وڵاتی

جیرانیان هێندێ خۆڵی کردە سندوقێک و هێندێ گوڵی لە سەر دانا و بۆ پاشای وڵاتی قجاقی نارد. پیاوەکانی سندوقیان هێنا کن پاشای غەیبگۆ و گوتیان با غەیبگۆ بێت و بڵێ؛ ئەم سندوقە چی تێدایە.؟ پاشا ناردی غەیبگۆیان هێنا. گوتی :

- ئێستا بڵێ بزانم ئەم سندوقە چی تێدایە. نەیزانی لە سەرت دەدەم.

قجاق لە ترسان و لە ناهومێدی ناڵاندی و گوتی :

- ئاخ گوڵێ، ئاخ گوڵێ. سەری سندوقیان هەڵگرت و دیتیان خۆڵ و گوڵە.

پاشا ئافەرینی لێکرد و ئەمری کرد بە قورسایی خۆی زێڕی بدەنێ. ڕۆژی دوایی قجاق هاتە لای پاشا و گوتی :

- قیبلەی عالەم نیتر نامەوێ غەیبگۆیی بکەم پیر بووم. پیرەکەم هەڕەشەی لێکردووم ئەگەر درێژەی پێبدەم، چاوم کوێر دەکات. ئایا بەزەییت بە من دانایە.؟

پاشا مەرەخەستی کرد و قجاق لە گەڵ خێزانی تا ئاخری تەمەنی بە خۆشی ژیانیان بردە سەر.

## سێ برادەر ١٦

سێ برادەری کورد و ئەرمەنی و جولەکە پێکەوە بەرەو شار کەوتنە ڕێ. لە سەر ڕێگا گەیشتنە میوانخانەیەک، ژوورێکیان گرت و ویستیان شەولە وێ بمێننە وە. ئێواری ویستیان بچن نان بخۆن. پارەکانیان بژارد، دیتیان بە هەرسێکان بەشی جەمە کەبابێکیان پێیە. کەبابیان کڕی و چوونە ژوورەکەیان.

هەرمەنی گوتی: « دەبێ من ئەو کەبابە بخۆم »

– بۆ دە بێ تۆ بیخۆی .؟

– چونکە خۆتان دەزانن لە هەر شارێک دەبێ هەرمەنیەک هەبێ. لەم شارەش دا هەر مەنی تەنیا منم. ئەگەر بمرم شارەکە بێ هەرمەنی دەبێ.

جولەکە گوتی: « ئەگەر بە هەق بێ دەبێ من بیخۆم. چونکە خۆتان دەزانن جولەکە قەومێکی بچوکن. ئەگەر بمرم یەکی تریش لە قەومی جوو کەم دەبێتەوە. ئەوەش باش نیە.

کوردەکو گوتی:« ئەگەر وایە با بخەوین. هەر کەس لە ئێمە شەو خەوتی خۆشتری دیت، کەبابە کە بخوا.»

پێشنیاری کوردەیان پەسند کرد و خەوتن. بەیانی کە هەستان هەرمەنی گوتی: خەونێکی سەیرم دیوە، عیسا پێغەمبەر هاتە لام و گوتی هەستە با بڕۆین. سواری ئەسبێکی کردم و بەرەو عاسمان فڕین. ڕۆیشتین تا گەیشتینە کۆشکێک پڕ بوو لە خواردن و شەڕاب و شیرینی. منیش تا توانیم خواردم و خواردمەوە.»

جولەکە گوتی : « ئەو خەونە هیچ نیە. لە خەومدا موسا پێغەمبەر هات هەموو جۆرە خواردن و خواردنەوەیەکی بۆ هێنام. هێندێ کیژی جوانی وەک

حزریشی له گەڵ خۆی هێنا بوو. هێندێ لەو کیژانە خواردنیان دەدامێ و هێندێ خواردنەوە. پاشان سەمایان دەکرد و منیش بە کەیفی خۆم دەمخوارد و دەمخواردەوە و کەیفم دەکرد.. هیچکامتان خەونی وا خۆشتان نەدیوە. کەباب وەبەر من دەکەوێ بیخۆم.»

کوردە گوتی : « گوێ بدەنێ. خەوم لێکەوت، هەستم کرد یەک رامدەوەشێنەێ. چاوم کردنەوە دیتم محەممەد پێغەمبەر لە سەر سەرم وێستاوە و دەڵێ : هەستە. مەگەر نازانی برادەرانی هەرمەنی و جولەکەت چۆن وا لە کەف و خۆشی و رابواردن دان. من هیچم بۆ تۆ نە هێناوە، ئێستا کە برادەرەکانت خواردوویانە و تێر و پڕن. لانی کەم کە هیچم بۆ نەهێناوی تۆ هەستە ئەو کەبابەی بخۆ. منیش هەستام و کەبابم خوارد.

هەرمەنی و جوو سەری قاپەکەیا لابرد، دیتیان کەباب نەماوە.

## دوو دراوسێ ١٧

دوو دراوسێ بوون و بیستانیان لە کن یەک بوو. یەکیان دوو کەری هەبوو. ڕۆژێکی کەرەکانی بردبوونە بیستان، یەکی بەستبۆوە و ئەویتریان بەرەڵا بوو. جیرانەکەی هات دیتی دوو کەر لە وێن. یەکیان بەستراوەتەوە و ئەوی دیکەیان چۆتە نێو بیستان و هەموو سەوزی و شتەکانی خواردوە و پێشێلی کردوون. کەرەکەی دەر کرد و چوە کن جیرانەکەی و سکاڵای کرد و گوتی:

– وەرە تەماشاکە. ئەو کەرەت بۆ نەبەستۆتەوە و هیچی لە بێستانەکەمدا نە هێشتوە.

– ڕاوەستە. ئێستا دێم و تۆڵەی لێدەکەمەوە. دارێکی دەست دایە و بۆ لای کەرەکان چوون. تەماشای کرد بە ڕاستی هیچی نەهێشتوە. چوە سەر کەری بەستراوە و وەریگەڕایە و جا وەرە لێیدە.

جیرانەکەی گوتی: « ئەو فەقیرە هیچی نەکردوە، بەستراوەتەوە، بۆ لێی دەدەی ؟

– تۆ نازانی، ئەوە ئەگەر نە بەسترا باوە بەجارێ وێرانی دەکرد.!

## دوو دۆست ١٨

دوو برادەر لە گوندێکەوە دەچوونە گوندێکی دیکە. یەکیان عەبایەکی بە شانی دادا بوو، باران دەستی پێکرد و هەرتکیان چوونە بن عەباکە. باران خۆش دەباری. پاش تاوێک لێی کردەوە. خاوەن عەبا بە رفیقەکەی گوت :

– ئەگەر عەبای من نە بایە ، دەزانی چیت بە سەر دەهات.؟ چەند جاران ئەوەی دوو پات کردەوە، لەو کاتە دا بە لێواری روبارێکدا دەرۆیشتن. کابرای بێ عەبا خۆی دە چۆمی هاویشت و گوتی: هەر ئەوەم بەسەر دەهات کە دەمبینی.

## سێ پەند ١٩

حەمباڵێک لە بن دیوارێک راوەستابوو، چاوەڕێ بوو کەسێک پەیدا بێ و کارێکی پێبکا. پیاوێکی وێچوو هاتە لای و گوتی:

– کارت دەوێ ؟

– دیارە لە کار دەگەڕێم.

– کارت دەدەمێ، بەڵام پارەت نادەمێ، لە جیاتی پارە سێ پەندت پێ دەڵێم بە کارت دێ. تۆش سندوقە شوشەیەکم بۆ بەرە ئەو شوێنەی کە پێت دەڵێم.

عەمبال فیکری کردەوە و گوتی : « من کە ئێستا بێکارم. با سندوقی بۆ هەڵگرم، سێ پەندەکەش شتێکە، لەوانەیە بەکارم بێت،

کابرا سندوقی پێ هەڵگرت و ڕۆیشتن. کەمێک ڕۆیبوون، عەمباڵ گوتی:

– باشه، پەندەکەت بێژە بزانم.

خاوەن سندوق گوتی : « یەکەم ئەوەیە ئەگەر کەسێک گوتی. برسی لە تێر بە هێز ترە، بڕوای پێ مەکە.»

عەمباڵ لە دڵی خۆیدا گوتی:« خۆم پێشتریش ئەوەم دەزانی.» بەلاّم قەی ناکا. ڕەنگە پەندەکانی دیکەی بە کار بێ.

کەمێکی تر ڕۆیشتن، عەمباڵ گوتی:« ئەرباب، پەندەکەی تر چیبوو.؟»

کابرا گوتی : « ئەگەر کەسێک گوتی: پیادە لە سوار خۆشتر دەڕوا، باوەڕ مەکە.»

عەمباڵ تووڕە بوو لە دڵدا گوتی: قسەی قۆڕ، خۆشم ئەوەم دەزانی. بەلاّم قەی ناکا، لەوانەیە پەندی سێیەم بەکار بێ.

گەیشتنە سەر لێوی کەنداڵێکی گەورە. خاوەن سندوق گوتی:

– پەندی سێیەمی من بۆ تۆ ئەوەیە ئەگەر کەسێک پێت بڵێ کە ئەم سندوقە بێ کرێ و بە لاش دەبەی، باوەڕ مەکە.

عەمباڵ کە ئەوەی بیست. سندوقی لە سەر ڕا دە کەنداڵی هاویشت و گوتی:

– ئەرباب ! منیش بۆ تۆ پەندێکم هەیە. ئەگەر کەسێک بە تۆی گوت کە لەم سندوقە شوشە تەنانەت یەکیش ساغ ماوە، بڕوا مەکە.!

## ئاخر پێم نە گوتی ! ٢٠

ڕۆژێک دوو برادەریان داوەت کرد بوو. لە میوانداری دا هەر تک شەڕابی زۆریان خواردەوە و پاشان بەرەو ماڵ گەڕانەوە.

یەکیان ئەوەندەی خوارد بۆوە کە نەیدەتوانی بە ڕێگا دا بڕوا. لە سەر جادە کەوت و هەڵنەستاوە. برادەرەکەی تەماشای کرد جگە لەوەی لە کۆڵی بکا و بیباتەوە، چارەی تری نیە. کابرای سەر خۆشی لە کۆڵ کرد و کەوتە ڕێ. چۆمێکیان لە سەر ڕێگا بوو، لە کاتی پەڕینەوە دا کابرای رفیقەکەی بە کۆڵەوە

بوو، هەڵەنگوت. ئەوی لەپشتی بوو، تۆزێ وەخۆ هاتبۆوە. گوتی:
- ئەوە چیە وا بە لا دادێی. ئاخر پێم نەگوتی دوو پیاڵە کەمتر بخۆوە.!؟

## سێ برادەر ٢١

سێ برادەر بە ڕێگادا دەڕۆیشتن، گەیشتنە گوندێک و میوانی کابرایەک بوون. هەر سێکیان پیاوی ڕێچوو. بە ئەدەب و بە ڕێز دەدوان. خاوەن ماڵ تەماشای دەکردن و لە دڵی خۆیدا گوتی:
- دەبێ تەجروبەیان بکەم. بزانم لە ناخەوەش وەک ڕوکار جوان و بە ڕێزن «؟.
لەم کاتە دا یەک لە وان چوە دەرێ. خاوەن ماڵ لە دو کەسەکەی پرسی:
- ئەم هەڤاڵەی ئێوە چ پیاوێکە؟
- کەر و ئەحمەقێکە تای نیە.
پاش تاوێک دوو کەسەکەی تر پێکەوە چوونە دەر. خاوەن ماڵ لە وەی تری پرسی:
- ئەم هەڤالانەی تۆ چۆنن ؟
- ئەوەی کڵاو ڕەش سەگێکی تەواوە. ئەوی دیکەیان کەر لەو باشترە.
شەو هەر سێک لە سەر سفرەیەک دانیشتن. خاوەن ماڵ قاپێکی جۆ لە پێش ئەوەیان دانا کە گوتبوویان کەرە، دەسکە وێنجەشی لە پێش ئەوەیان دانا کە گوتبوویان کەر لەو چاکترە، هێندێ وردە ئێسکیشی لە پێش ئەوەیان دانا کە گوتبوویان سەگە. بە سەر سوڕ مانەوە تێکڕامان و تەماشای خاوەن ماڵیان دەکرد، خاوەن ماڵ گوتی:
- بۆ تەماشام دەکەن، خۆتان نەتانگوت: یەکتان کەرە و یەکتان سەگە و یەکتان لە کەر خەرابترە. منیش خواردنی خۆتانم بۆ هێناون..

# داندۆی فیڵباز ٢٢

کابرایەک بە ناوی مامۆ لە گەڵ ژنەکەی دەژیا. جوتی دەکرد، درونەی دەکرد، خەرمانی هەڵدەکرت، گەنمی دێناوە و دەیبردە ئاش و ئاردی دێناوە ماڵ. بەڵام ژنەکەی کە ناوی ئایش بوو، نانی جۆی دەدایە.

مامۆ سەری سور ما بوو. لە ژنەکەی پرسی:

- ئایشێ ئەوە چیــە ؟ بۆ چی نانی جــۆم دەدەی ـ ئەو ئاردە گــەنمەی هێناومەتەوە چی لێهات.؟

ئایشێ گوتی :

- تۆ خــوشکێکت هەیە جــادوگــەرە. لە بــەغـدا دانیــشــتــوە و لە وێوە گەنمەکەی ئێمە دەکاتە جۆ.

مامۆ قینی هەستا و گوتی کە وابێ دەچم دەیکوژم.

ئایشێ گوتی :

- دەبێ ئاگـات لە خـۆ بێت، ئەگینا بە جـادو تۆش لە بەین دەبات، بچـو چەند ماری ژار بگرە و بیانخە ناو تورەکە و بڵێ: دیاریم بۆ هێناوی، کە زاری کیسەت کردەوە، مارەکان دێنە دەر و پێیەوە دەدەن و لە چنگانی خەلاس دەبین.

مامۆ بە قسەی ژنەکەی کرد و چوە کن خوشکی. خوشک بە دیتنی برای شاد بوو، خواردنی بۆ هێنا و لە حاڵی ژنەکەی پرسی و گوتی:

- ئەوە چیە بۆت هێناوم.؟»

- نازانم. ژنم بۆی ناردووی. زاری کیس بکەوە بزانە چیە.

خوشکی زاری کیسەی کردەوە و دیتی چەند دەسماڵی ئاوریشمی ڕەنگاو ڕەنگی تێدایە. لە خۆشیان هاواری کرد و گوتی:

تۆ فەقیری ئەو دیارییە بە نرخەت بۆ هێناوە؟

- ئەگەر دیاری بۆ تۆ نەهێنم ئەدی بۆ کێی بێنم. بەلام ئەوەش بزانە لە جیاتی ئەو دەسرانە ژنەکەم ماری تێنابوون.

- مار ؟ مار بۆ چی ؟

- بۆ کوشتنی تۆ. پاشان هەموو شتێ رک و ڕاست پێگوت، خوشکی گوتی:

- برام، ژنی تۆ فاسقی هەیە.

مامۆ بە جارێ تێکچوو گوتی:

- ئێستا دەبێ چبکەم؟

ئێستا پێت دەڵێم دەبێ چبکەی. داندۆی کوڕم لە گەڵ خۆت بەرە تا فاسقی ژنەکەت دەگیر خات،

مامۆ خوارزای هەڵگرت و خوا حافیزی لە خوشکی کرد و کەوتە ڕێ. گەیشتنەوە مال و هیچی بە ژنەکەی نە گوت، رۆژی دوایی مامۆ و داندۆ چوونە مەزرایە جوتی بکەن. داندۆ لە نیوەی ڕێگا گەڕایەوە، گوتی شتێکم لە بیر چوە، تۆ برۆ، دەتگەمێ.

داندۆ گەڕاوە و لە نیزیک ماڵێ خۆی شاردەوە. دیتی کابرایەک دێ. گوتی ڕەنگە ئەوە فاسقی نایشێ بێت. کابرا چوە ژوورێ و بە نایشێی گوت:

- دەچمە جوتی. نانم بۆ بێنە مەزرایە.

نایشێ گوتی: گایەکانت ڕەنگیان چۆنە؟

- یەکێک ڕەشە و یەکیان بەڵەکە.

نایشێ گوتی باشبوو لە گەڵ گای خۆمان لێم ناگۆڕێن. گایەکانی ئێمە سپین. پاشان دوو مریشکی سورەوە کرا و نانی گەنمی خستە دەسماڵێک و رووی کردە مەزرا.

داندۆ لە دوور دیتی. عەبایەکی ڕەشی بە سەر گایەکی خۆیان دادا و هێندێ پەڕۆی رەنگاو ڕەنگیشی بە سەر ئەوی تریان دادا و دەستی بە کێڵان کرد.

ئایشێ لە دوور دیتی یەکێک جوتی دەکا، گایەکی ڕەشە و یەکی بەڵەکە. گوتی ڕاست بۆ خۆیەتی. کە چوە پێش دیتی ئەوە مێردەکەیەتی. ویستی بە پەلە بگەڕێتەوە، داندۆ هاواری کرد:

– پورێ.. پورێ، خۆماتین. چۆن ئامان ناسی. چاکت کرد نانت بۆ هێناین، برسیمان ببوو.

ئایشێ دیتی چاری نیە. ناچار هات و نانەکەی دانا، داندۆ و مێردەکەی مریشک و نانی گەنمیان خوار و ئایشیش بە گرژی و شەرمەزاری گەڕایەوە.

جارێکی تر مریشکی سوور کردەوە و نانی ساز کرد و چۆوە مەزرا و کابرای فاسقی دیتەوە. کابرا جنێوی دایە و گوتی بۆچ وادرەنگ هاتووی. لە کوێ بووی ؟

ئایشێ گوتی؛ « ئامان لە دەست داندۆ. حکایەتی بۆ گێڕاوە.

ڕۆژێکی دیکەش داندۆ لە نیوەی ڕێگا گەڕایەوە و گوتی : « کڵاوم لە بیر چوە، تۆ برۆ من دەتگەمێ. ئەمجاریش خۆی لە نیزیک ماڵێ شاردەوە. دیتی فاسقی ئایشێ هات. ئایشێ دەستی کرد بە سکاڵا لە داندۆ. فاسق پێی گوت:

– بچۆ زیارەت و دوعایە بکە چاوی داندۆی کوێر بن. ئایشێ نانی گەنم و پلاوی ساز کرد و چوە زیارەت. داندۆ بە غار لە پێش ئەو دا خۆی گەیاندە ئەم ئەشکەوتە کە زیارەتگا بوو.

ئایشێ گەیشتە زیارەتگا و بە دەنگی بەرز دوعای کرد و گوتی : « ئەی حەزرەت !

داندۆ لە ناو ئەشکەوت دا بە دەنگێک گوتی : « مم..مم. مم..» ئایشێ کەیف خۆش بوو گوتی: « حەزرەت قسەی لەگەڵ کردم. جارێکی تر گوتی : « ئەی حەزرەت. وابکە داندۆ چاوی کوێر بن » ئەمجارەش « مم. مم. مم » ی گوێ لێبوو، پلاو و نانەکەی لە قەراخ ئەشکەوت دانا و گەڕایەوە.

داندۆ نان و پلاوەکەی بردەوە کن خاڵی و پێکەوە خواردیان. چوونەوە ماڵێ داندۆ بە ئایشێی گوت :

– پورێ چاوەکانم دێشن، تاریک بوون، پەڕۆیەکم لە چاوان ببەستە.

ئایشێ خۆشحاڵ بوو، چاوەکانی بەست. رۆژی دوایی مامۆ بە ئایشێی گوت:

– گەنمی هەڵخە وشک بێتەوە، ئێواریێ کە هاتمەوە دەیبەمە ئاشی.

ئایشێ گوتی : « من بە تەنیام کەس نیە ئاگای لە گەنم بێ.»

داندۆ وەدەنگ هات و گوتی:

– پورێ گەنمەکە لە بەر دەرگا هەڵخە. چەکوچێکم بدە دەست و لە عەرزی دەدەم کە مریشک و داعبا نەیەن بیخۆن.

ئایشێ دەستی داندۆی گرت و لە بەر دەرگا داینا. چەکوچێکی دایە. داندۆ چەکوچەکەی لە عەرزی دەدا کە مریشک و داعبایانی پێ دەر کات. لە پڕ دیتی ئەوە فاسقی ئایشێ دێت، چەکوچێکی لە تەپڵی سەری داو کوشتی. ئایشێ هاواری کرد: – ئەیرۆ ئەوە چیت کرد، زەلامێکت کوشت. داندۆ ترسی وەبەر خۆ نا و هاواری کرد:

– ئێستا چبکەم ؟

ئایشێ گوتی تا کەس نەیزانیوە یارمەتیم بکە بیخەینە ناو چۆم. یارمەتی بکە لە کۆڵمی نێم. داندۆ گوتی: تەنافێک بێنە.

تەنافی هێنا، مردویی لە پشتی ئایشێ قایم کرد و رۆیشتن بۆ لای چۆم. گەیشتنە قەراخ رویار و ئایشێ گوتی:

– داندۆ تەنافەکەی بکەوە،

– وەرە سەر قەراغ چۆمی تا بیکەمەوە،

ئایشێ چوە سەرلێوی رووبار و داندۆ پاڵێکی پێوە ناو ئایشێ بە کۆڵەوە دە چومیدا نوقم بوو. داندۆ هاتەوە ماڵ و بە خاڵی گوت

– دەچۆمیدا نوقم بوو نەجاتم دای. پاشان ژنێکی باشی بۆ خاڵی دیتەوە و زەماوەندی ساز کرد و حەوت شەو و رۆژ کردیانە شایی و ئەوان بە ئارەزوی خۆیان گەیشتن و ئێوەش پێدەگەن

## پیاوی دوو ژنەی بە مەکر ٢٣

پیاوێک بوو دوو ژنی هەبوون و دەیویست وابکا هەر تک ژن خۆشیان بوێت. چوە بازار و دوو سێوی کرین و هەر یەکەی سێوێکی دانێ، بێ ئەوەی ژنەکان ئاگایان لە یەکتر بێ. شەو گەڕاوە ماڵێ و لە سەر دۆشک دانیشت و گوتی :

– ئەو ژنەی زیاتر خۆش دەوێ کە سێوی سوری شاردۆتەوە. ژنەکان هەر تکیان لە خۆشییان نە دەحاوانەوە، هیچیان نەیان دەزانی کە مێردەکەیان وەک نانی سێڵێ دوو ڕوو و منافیقە.

## چۆن ئیرادە بکەی ئاوا دەژی ٢٤

ڕۆژێک پاشاو وەزیر لیباسیان گۆڕی و لە نێو شار دەگەڕان. چوونە بازاڕی شوتی فرۆشان. زستان بوو. کاتی جێژی خدر پێغەمبەر. قیمەتی شوتییان پرسی. دوکاندار قیمەتێکی گرانی گوت. پاشا و وەزیر نەیانکڕی. پێیان حەیف بوو شوتی وا گران بکڕن. پاشا بە وەزیری گوت:

– گوێ بدەیە. ئێمە پاشا و وەزیرین. ئەگەر من وتۆ ئەو میوە گرانە نەکڕین، ئەدی کێ دەیکڕێ. وەرە با لە قوژبنێک راوەستین، بزانین کێ شوتی دەکڕێ.

هێندێ راوەستان دیتیان لاوێک هات و قیمەتی شوتی پرسی.

دوکاندار گوتی: سێ سکەیە.

لاوەکە بێ ئەوەی قسەی لێ بکات، پارەی دا بە کابرا و شوتی هەڵگرت و ڕۆی. پاشا گوتی :

– تەماشا کە، من و تۆ نەمانکرێ، بەڵام ئەم لاوە هات کرێ. تۆ بڵێی لە ئێمە دەوڵەمەند تر بێ.؟

وەزیر لە وەڵامدا گوتی :

– نا ئەو لە ئێمە دەوڵەمەند تر نیە. بێگومان خۆشەویستەکەی نەخۆشە و ئیشتیای لە شوتییە.

پاشا گوتی : « با وەدوای کەوین، بزانین چدەکا .»

وەدوای کەوتن دیتیان لاوەکە شوێنێکی چۆلی دیتەوە، چەقۆی لە گیرفانی دەرهێنا و شوتی لەت کرد و ملی دەبەر خواردن نا، نیوەی خوارد و ئەوی دیکەشی فرێدا و چەقۆ کەشی لە بیر چوو.. کە لاوەکە ڕۆی. پاشاو وەزیر دانیشتن و لە تە شوتییەکەیان خوارد. پاشا چاوی بە چەقۆیەکە کەوت، کاغەزێکی هێنا دەر و لێی نووسی:« چۆن نیرادە بکەی ناوا دەژی.» ئەم نووسراوەی لە پەنا چەقۆکە دانا و لە گەڵ وەزیر گەڕانەوە ماڵ.

ئێستا بزانین لاو چدەکا. دەستی دەگیرفانی ڕاکرد، دیتی چەقۆکەی پێ نەماوە. گەڕایەوە دیتی لە جێی خۆیەتی و نوسراودیەکیشی لە پەنایە. خوێندیوە، دە گیرفانی نا و چۆوە ماڵێ. ئەم لاوە نە کاری دەکرد و نە دزی. ژیانێکی بێ خەمی دەبردە سەر.

ڕۆژێک چوە کن جیرانەکانی و داوای پارەی بە قەرزی لێکردن. چوو بەو پارەیە ئەسبێکی باش و لیباسێکی جوان و چەکێکی کڕی و سوار بوو چوە کن پاشای جیرانی وڵاتەکەیان. کاتێ پاشا چاوی پێ کەوت، وایزانی کوڕی پاشا و یا کوڕی ئەمیرێکە. وەک میوانێکی بە ڕێز پێشوازی لێکرد و لە دڵی خۆشیدا گوتی:

– دەبێ چ دیارییەکی بدەمێ.؟ ئەو کە پێویستی بە پارە و ماڵی دنیا نیە. باشترە کیژی خۆمی بدەمێ.

پاشا لێی پرسی:« کوڕی کێی ؟»

– لە وەڵامدا گوتی:« کوڕی پاشای وڵاتی دراوسێی تۆم.»

– باشە تۆ کوڕی پاشای، و ئێستاش دەبیە زاوای پاشا. کیژی خۆی دایە

و زەماوەندی بۆ ساز کرد. دوو سێ ساڵ تێپەڕی، پاشا دیتی زاوای جارێکیش نە چۆوە وڵاتی خۆی. لەوە سەری سوڕ ما و لە بەر خۆیەوە گوتی:
- خۆ ئەوە بێ ماڵ و حاڵ نیە. بۆ چی جارێکیش سەر لە ماڵ و نیشتمانی خۆی ناداتەوە؟

ڕۆژێک نامەی بۆ پاشای وڵاتی دراوسێ نووسی:
- کوڕی تۆ بۆتە زاوای من. زیندو وسلامەتە. نیگەرانی مەبە.!»
**پاشا نامەکەی خوێندەوە و واقی وڕ ما.**
- ئاخر من کوڕم نیە. کێ ئەو بێ ئەدەبیەی کردوە، خۆی کردۆتە کوڕی من؟ دەبێ ئەم کەسە زۆر سەیر بێ. چەندە بە غیرەتە ؟»
**پاشان وەلامی نامەکەی نووسییەوە و داوای کرد:» بوک و زاوای بۆ بنێرێتەوە. »**

لاویان بە زۆري هێناوە کن پاشا. پاشا پێي گوت:
- بە چ غیرەتێک خۆت کردە کوڕی من و بووی بە زاوای پاشا.
- پاشا سلامەت بێ» چۆن ئیرادە بکەی ئاواش دەژی. تۆ خۆت ئەم وشانەت بۆ من نووسی؟» پاشان نووسراوەکەی خەتی خۆی پێ نیشاندا. پاشا هیچی نە گوت. بە کوڕی خۆی قبوڵ کرد و دیسان شایی و زەماوەندی بۆ ساز کردەوە.

## بازرگان ٢٥

بازرگانێک بوو بە ناوی کەریم. ڕۆژێک بە کاروانێک کالا و شتومەکەوە ڕووی کردە وڵاتێکی دوور. لە ڕێگادا لە پەنا کانیەک کاروانی خست. لە نیزیک کانی شوانێک مەڕی دەلەوەڕاند. بازرگان لە شوانی پرسی:

– کەست پێشک دێت کە لیباسەکانم بۆ بشوا.؟

– ژنی من لیباست بۆ دەشوا. شوان کە ناوی ئەحمەد بوو، لیباسەکانی بازرگانی هەڵگرت و دای بە ژنەکە و گوتی:

– ئەم لیباسانە بشۆ و بیانهێنە و خۆم بۆ بازرگانیان دەبەمەوە.

ژني ئەحمەد بە ناوی زلێخا لیباسەکانی شوشت و چومکن کانی. تەماشای کرد ئەحمەد مەڕی بردۆتە چیا و لە وێ نیە. بازرگان کە چاوی بە زلەخا کەوت، ئاشقی بوو. نۆکەرێکی بانگ کرد و گوتی:

– زلەخا بێنە ئێرە.

نۆکەر ی زلەخای بردە خێوەتی بازرگان، کابرا دەستی کرد بە قسان و سەری گەرم کرد. لەم بەینە دا نۆکەران کاروانیان بۆ ڕۆیشتن ئامادە دەکرد. ژنی شوانی بە زۆر سواری وشتر کرد و لە گەڵ خۆی برد.

ئەحمەد لە چیا گەڕایەوە دیتی نە ژنەکەی ماوە و نە بازرگان و کاروان. لە جیرانەکانی پرسی، ئەوان گوتیان:

– ژنەکەت لیباسی بازرگانی بردوونەوە و نەهاتۆتەوە. بێگومان بازرگان بردوویەتی.

ئەحمەد دوو کوڕی هەڵگرت و بە دوای بازرگاندا کەوتە ڕێ. توشی ڕوبارێکی قوڵ و پان بوو. ئەحمەد یەک لە کوڕەکانی لە قەراخ چۆم دانا و

ویستی یەکیان بپەڕێنێتەوە و دوایە بێ ئەوی دیکەش بەرێت. لە ناو چۆمی دیتی گورگێک منداڵەکەی پەلامار دا ویە دان گرتی. ئەحمەد گەڕایەوە گەیشتە قەراغ و لاقی خلیسکا ومنداڵەکەی ئاو بردی.

گورگ کە منداڵەکەی ڕفاند، توشی شوانێک بوو چەند سەگی پێ بوون. سەگەکان گورگیان پەلامار دا. گورگ منداڵەکەی فڕێدا و هەڵات. شوان هەڵیگرتەوە و گەورەی کرد.

منداڵەکەی کەوتە چۆم. ئاو بردی تا گەیشتە ئاشێک. ئاشەوان دیتی و گرتیەوە و کردی بە کوڕی خۆی. کوڕ گەورە بوو گوتی:

– بابە ڕێگا بدە بچم کارێک پەیدا بکەم. دەمەوێ پارمەتیت بدەم و تۆ بحەسێیەوە.

ئاشەوان ڕێگای دا. ئەو کوڕەی کە شوان گەورەی کرد بوو، ئەویش هەر ئەو کارەی کرد.

با بزنین ئەحمەد چدەکا. دەستی کرد بە گریان و هاوار و سەر لێ شێواو ڕێگای داگرت. گەیشتە ولاتێک کە پێش ڕۆژێک پاشای ئەم ولاتە مرد بوو. خەڵکی ئەم شارە بە گوێرەی داب و نەریت« بازی بەخت» یان هەڵدەفراند تا لە سەر هەر کەسێک بنیشێ، دەبێتە پاشای ئەم ولاتە. باز لە سەر ئەحمەدی نیشت. خەڵک پێیان سەیر بوو:

– کابرای ئاوا رەش و ڕوت چۆن دەبێتە پاشا. دیارە باز بە هەڵە چوە.

ئەحمەدیان بردە ماڵێک و دەرگایان لە سەر داخست. جارێکی دیکەش بازیان هەڵفڕاند. باز شوشەی پەنجەرەی شکاند و چوو لە سەر سەری ئەحمەدی نیشت.

خەڵک گوتیان هیچ ناکرێ، ئەو هەر چەند بێگانەیە، بلا ببێتە شا. بەمجۆرە ئەحمەد بوو بە پاشا.

ڕۆژێک دوو لاو بۆ کار هاتنە ئەم شارە. هەر تکیان هاتنە کن پاشا. یەکیان بوو بە بەرخەوان و یەکیش گوێلکەوانی پاشا.

واز لەوان دێنین با بەرخ و گوێلکان بلەوەڕێنن. بزانین کەریمی بازرگان

چدەکات ؟

کەریم بە کاروانەوە گەیشتە شارێک کە ئەحمەد پاشای ئەم شارە بوو. دیاری گەورەی بۆ شا برد و گوتی:

– رێگام بدە لە شاری تۆ بازرگانی بکەم.

ئەحمەد گوتی : « برۆ بازرگانیی خۆت بکە و چۆنی دەتەوێ شتی خۆت بفرۆشە. ئەمشۆش میوانی من بە.

شەو بازرگان هاتە کۆشکی پاشا و دەستیان بە قسان کرد، بەڵام کەریم هەر لە فیکری ژنەکەی دابوو. چونکە هەمیشە لە گەڵ خۆی دەبردە هەموو شوێنێ. لەماڵی پاشا زۆر گیر نە بوو، ویستی بڕوا. ئەحمەد پرسی:

– بۆ وا زوو دەڕۆی؟ دانیشە قسان بکەین

پاشا سلامەت بێ: خیزانم لە گەڵمە و تەنیایە و دەترسم بترسێ.

پاشا گوتی: شوانەکانم بانگ کن. کە هاتن گوتی:

– برۆن لە خێودتی بازرگانی کە ژنەکەی لەوێدا نوستوە، کێشک بکێشن.

ڕۆیشتن و کێشکیان دەکێشا. یەکیان پرسی :

– تۆ کوڕی کێی؟

– بە کوڕی ئاشەوانم دەزانن. بەڵام باوکی ڕاستیم شوان بوە و ناوی ئەحمەد بوە. پێم بڵێ تۆ کوڕی کێی ؟

– منیش کوڕی شوانێکم. بەڵام دەڵێن باوکم ناوی ئەحمەد بوە و ئەیش شوان بوە.

– دایکت ناوی چبوە.؟

– ناوی زلەخا بوە.

– دایکی منیش ناوی زلەخا بوە.

بەڵام زلێخا لە خێودت دا ئەم قسانەی گوێ لێدەبوو.

پاشان یەکیان لە ویتری پرسی:

کوندەکەت ناوی چ بوە؟

– حەیدەر بەگ.

– ناوی گوندەکەی منیش حەیدەر بەگ بوە.

– جیرانەکەتان ناوی چبوو؟

– ئاسۆیان پێدەگوت.؟

– کە وابوو ئێمە براین.

ژنی بازرگـان کـە ئەو قسـانەی بیـست، هەر تکی بانگ کـرد و پرسـی : چیرۆکی خۆتان بۆ من بگێڕنەوە.

ئەوان گـوتیـان : چۆن باوکیـان وەدوای بازرگان کـە وتو و چۆن یەکیـان گورگ بردوویە و یەکیان ئاو بردوویە، شوان و ئاشەوان گرتوویاننەوە.

زلێخا دەستی بە گریان کرد و گوتی :

– من دایکی ئێوەم و ئێوەش کوڕی منن.! پاشان چیرۆکی ڕفاندنی خۆی بۆکورەکانی گێڕاوە.

هەر سێک یەکتریان لە ئامێز گرت و یەکتریان مـاچ کرد و دەستیان بە قسان کرد و لای بەیانی خەویان لێکەوت.

بازرگان گـەڕاوە و دیتی دوو لاو لە ئامـێزی ژنەکـەیدا نوسـتـوون. بە غار گەڕاوە بۆ کن پاشا و گوتی :

– ئەوانە کێن کە ناردووتن کێشک لە خێوەتی من بکێشن. ئەوانە لە ڕێگر خەرابترن.

پاشا بە سەر سور مانەوە پرسی :

– چبوە، چقەوماوە؟ بۆ هاوار دەکەی.!

کەریم گوتی: وەرە خۆت بیان بینە و بزانە چۆنە.

چوون پـاشـا دیتی: هـەر تک کـێـشکـچی دە ئامـێـزی ژنی بـازرگـاندا نوستوون. پاشا تورە بوو، جنێوی پێدان.

زلێخا گوتی:

– ئەی پاشـا، جنێو مـەدە. من ئێـسـتـا بۆت دەگـێـڕمـەوە، ئەم دوو لاوە کـوڕی خۆمن. من ژنی شـوانێک بووم، ناوی ئەحمەد بوو، ئەم بازرگانە منی ڕفاند و لە گەڵ خۆی برد.

پاشا گوتی:

– كه وايه هه‌موو وه‌رنه كۆشكی من تا مه‌سه‌له‌كه ڕوون بێته‌وه و هه‌موان دادگایی بكه‌م.

چوونه كۆشكی پاشا و به جیا پرسیاریان له لاوه‌كان كرد، قسه‌كانیان وه‌ك یه‌ك بوون.

پاشا گوتی:

– كۆنه لیباسه‌كانی منیش بێنن ئه‌وانه‌ی كه هه‌وه‌ڵ ڕۆژ هاتمه ئێره و له به‌رم دابوون.

لیباسه‌كانیان هێنا. زلێخا كه دیتنی، ده‌ستی كرد به گریان و گوتی:

– ئه‌وانه لیباسی ئه‌حمه‌دی مێردی منن.

پاشا گوتی:

– ڕاسته. ئه‌وانه لیباسی منن و منیش ئه‌حمه‌دی مێردی تۆم.

هه‌ر له‌وێ بازرگانیان كوشت . ئه‌حمه‌د پاشا و ژن و كوڕه‌كانی پێك شاد و شوكر بوون.

## ئەحمەد و گولیزار ٢٦

ئەحمەد بوو بە دوکتور و چۆوە شارەکەی خۆی. دوکتۆرێکی باشبوو. لە فیکری ئەوە دابوو کە نەخۆشەکانی زیاد بکەن.      بەڵام ئەو تازە کار بوو، کەس نەیدەناسی و بۆ دەرمان کەس نە دەچوە لای.

ڕۆژێک ئەحمەد بە کوچە دا دەڕۆی بیستی جارچی جار دەکێشێ و دەڵێ:

- ئەی خەڵکینە! کوڕی پاشای وڵاتی مەغریب زۆر نەخۆشە! هەر کەس بتوانێ چاکی کاتەوە بە قەد گرانایی خۆی ئالتونی دەدەنێ.

ئەحمەد لە دڵی خۆیدا گوتی :

- من دەبێ زانستی خۆم لە پزشکیدا لە و نەخۆشیە نیشان بدەم. ئەگەر بەختم هەبێ و دەرمانی بکەم، ناوبانگ دەر دەکەم .

ئەحمەد بڕیاری دا بچێ هێزی خۆی تاقیکاتەوە. کیژێکی ڕەفیق بوو بە ناوی « گولیزار» پێکەوە دەرسیان خوێند بوو. یەکتریان خۆش دەویست. کاتێ ئەحمەد خۆی بۆ سەفەر ساز دەکرد، گولیزار پرسی :

- ئەحمەد بۆ کوێ دەچی و من بە تەنیا بە جێ دێڵی.؟

ئەحمەد گوتی: « تۆ دەزانی من دەبێ کار بکەم تا بناسریم. زوو دەگەڕێمەوە.

ئەحمەد مالاوایی لە گولیزار کرد و بەرەو وڵاتی پاشای مەغریب کەوتە ڕێ. گەیشتێ و کوڕی پاشای تەماشا کرد و دیتی تاقە عیلاجی ئەوەیە کە بچێتە کوێستان وهەوای ئەوێ هەڵمژێ. بە هەڵکەوت وڵاتی ئەحمەد کوێستانی بەرز و ئاو وهەوای سازگاری هەبوو.

ئەحمەد بە پاشای گوت:

-کورەکەت لە گەڵ من بنێرە، بیبەمە وڵاتی خۆم. لە کوێستانەکانی ئەوێ، کوڕەکەت چاک دەبێتەوە.

پاشا ڕازی بوو. کوڕەکەی ئەوەندە لاواز و بێ هێز ببوو گواستنەوەی بۆ شوێنێکی دیکە مەترسی هەبوو. ئەحمەد بە زەحمەت کوری شای بردە وڵاتی خۆی. لە گەڵ گولیزاری دۆستی، دەستیان کرد بە دەرمانکردنی. زەحمەتێکی زۆریان کێشا تا نیشانەی چا بوونەوەی دەر کەوتن. زۆری پێنەچوو کوڕی پاشا ساغ بۆوە. دیتیان کاتی ئەوە هاتوە کە کوڕی پاشا بەرنەوە وڵاتی خۆی. لە پێشدا کەسێکیان نارد خەبەر بۆ پاشا بەرێ کە کورەکەت چاک بۆتەوە و ئەوا لە گەڵ دوکتۆر دێتەوە.

پاشا کە ئەو مزگێنییەی پێگەیشت، لە گەڵ خەڵکی شار بە دەهۆڵ و زوڕنا بە پێشوازیانەوە چوون. ئەوانیان هێنا کۆشک و باشترین ژووریان دانێ.

پاشا بە ئەحمەدی گوت:

– هەرچی دەخوازی داوا بکە!

– پاشا سلامەت بێ هیچم ناوێ، لە ئەنجامی چاک کردنەوەی کوری تۆ، ئێستا ناوبانگم دەر کردوە و خەستەخانەی خۆم هەیە.

هەر چەند پاشا پێی داگرت، ئەحمەد هیچی وەر نەگرت و گەڕاوە بۆ شاری خۆی. لە گەڵ گولیزار کاریان دەکرد و خۆیان بۆ شایی و زەماوەند ئامادە دەکرد. بەڵام ڕۆژێک ئەحمەد نامەیەکی لە پاشای مەغریبەوە پێگەیشت کە بۆی نووسیبوو:

– ئەی ئەحمەد زوو خۆت بگەیێنە ئێرە، کوڕەکەم زۆر نەخۆشە و لە جاران خەراپترە.

ئەحمەد نامەکەی خوێندەوە سەری سور ما. پێی وابوو کە دوای ئەو دەرمان و چا کردنەوە یە، نە دەبوایە نەخۆش بێتەوە. ئەحمەد بەرەو وڵاتی مەغریب کەوتە ڕێ. تەماشای کرد هەموو لەشی کوری پاشا ساغ و سەلیمە. بەڵام نەخۆشیشە. جارێکی تر بە پاشای گوت:

– هیچ عیلاجی نیە. دەبێ دیسان لە گەڵ من بێتەوە کوێستانەکانی وڵاتی

من. ئەحمەد کوڕی پاشای لە گەڵ خۆی برد و بەڵام لە گەڵ گولیزار هەر چی دەیانکرد، باشتر نە دەبوو.

جارێک ئەحمەد بە تەنیا چوە کن نەخۆش و لێی پرسی:

- ڕاستیم پێ بڵێ، چشتێک نارەحەتت دەکا. بۆ چی داو ودەرمان چارت ناکا.؟

کوڕی پاشا هیچی نەگوت. تەنیا هەناسەیەکی هەڵکێشا. ئەحمەد پرسیارەکەی دوو پات کردەوە. کوڕی پاشا رەنگی لە شەرمان سوور هەڵگەڕا و لە وەلامی ئەحمەد دا گوتی:

- ئەم کیژەی لە گەڵ تۆ دەرمانم دەکا. ئاقڵ و هێزی لێ بڕیوم. ئەحمەد تێی نەگەیشت. گوتی:

- ئەگەر ناتەوێ، ئیتر با نەیەتە لات.

نەخۆش ترسا و گوتی:« نا.نا. ئەگەر نەیە هەر بە جارێک لە بەین دەچم.

- بۆ چی؟

لە وەلامدا گوتی: « خۆشم دەوێ. ئەوەی لە دڵم دابوو پێم گوتی. چۆنت پێ باشە وابکە.

ئەحمەد کەوتە فیکر و گوتی:

- دەبێ لەم بارەوە یارمەتی بەم کوڕە بکەم، دەنا چاک نابێتەوە.

ئەحمەد بە کوڕی پاشای گوت:

- گوێ بدەیە. گولیزار نە خوشکی منە و نە کچی منە و نە ژنی منە.، ئەو لە ئاست منەوە بێگانەیە. ناتوانم لە جیاتی ئەو وەلام بدەمەوە. قسەی لە گەڵ دەکەم و دێم وەلامت دەدەمەوە.

ئەحمەد بە نارەحەتی چوە کن گولیزار، بەلام نەیتوانی دەست بەجێ لە گەڵی باسبکات. ئاوای دەست پێکرد:

- ئەی گولیزار ئێستا چەند ساڵە پێکەوە کار دەکەین، هەمیشە دوو رەفیقی سەر کەوتوو بووین، یەکترمان خۆش ویستوە، کەس نەیزانیوە ئێمە خوشک و براین یا دڵداری یەکترین.

گولیزار گوتی : « ئەو قسانە ڕاستە، بەڵام دەتەوێ بێژی چە.؟

- دەمەوێ پێکەوە خوشک و برا بین.!

گولیزار ڕەنگی گۆڕا . نەیتوانی هیچ بڵێ. پاش چەند دەقیقە هاتەوە سەر خۆ و گوتی :

- ئەحمەد ئەگەر تۆ منت وەک خوشک خۆش دەوێ، قەی ناکا، تۆ برای منی.!بەڵام پێم بڵێ بۆ چی ئەم مەسەلەت هێنا گۆڕی و دەتەوێ بڵێی چی ؟

ئەحمەد گوتی:« تۆ دەبێ شو بە کوڕی پاشا بکەی.»

گولیزار گوتی :« عیلاج نیە، من لە بەر خاتری تۆ ئامادەم ببمە ژنی کوڕی پاشا !»

ئەحمەد گوتی :« ئەو لاوێکی ئاقڵ و میهرەبانە، کوڕی پاشایە، لە هەموو بارێکەوە وەزعت باش دەبێ. من سەبارەت بەم ڕازی بوونەت سوپاست دەکەم.»

پاش ئەم گفتگۆیە ئەحمەد چوە کن کوڕی پاشا و گوتی:

- هەموو شت بە دڵی تۆیە. گولیزار ڕازییوە. کوڕی پاشا بە بیستنی ئەم قسەیە چاوی گەشانەوە و ڕوومەتی سوور هەڵگەڕان و لەشی سوک بوو، لە جێ هاتە دەر و گوتی :

- داخوا دەتوانم ڕۆژێک تۆڵەی چاکەی تۆ بدەمەوە.

پاش چەند ڕۆژ کوڕی پاشا بە یەکجاری چاک بۆوە، ئەحمەد ئاهەنگی شایی و مارە کردنی ئامادە کرد و پاش مارە و زەماوەند. هەر سێکیان، ئەحمەد و گولیزار و کوڕی پاشا بەرە و مەغریب کەوتنە ڕێ. مزگێنی هاتنەوەی کوڕی پاشایان بۆ بابی برد و گوتیان:

- ئەحمەد کوڕەکەتی چاک کردۆتەوە و ژنیشی بۆ هێناوە.!

پاشا کەیف خۆش بوو، چود پێشوازیان و جێژنێکی بەر بڵاوی ساز کرد پاشان بە ئەحمەدی گوت:

- نازانم چۆن چاکەی تۆ بدەمەوە، هەرچی دەتەوێ لە ماڵی من بخوازە.

ئەحمەد گوتی :

- پاشا سڵامەت بێ، من هیچم ناوێ. ئێستا لە سایە کوڕەکەت لە تۆ کەمترم

نیە.. مالاوایی خواست و بۆ ولاتی خۆی گەڕایەوە. گەیشتەوە شار دیتی هەرایەکی سەیرە . ئەحمەد کەوتە فیکرەوە و توشی منداڵێک بوو، پرسیاری لێکرد و گوتی:

- ڕۆڵە گیان چ قەوماوە.؟

- دەڵێی چقەوماوە ؟ سێ ڕۆژە خەستەخانەی ئەحمەد دەسووتێ، بە جارێ بۆتە خۆڵە مێش.

ئەحمەد بە بیستنی ئەو خەبەرە ڕەنگی گۆڕا و ئەژنۆی لەرزین و دەڵە کوتەی گرت و هەر لە وێ دانیشت. فیکری کردەوە کە لەم شارە جگە لەمن ئەحمەدی دیکەی تێدا نیە. بێگومان خەستەخانەی من ئاگری گرتوە. بە زەحمەت خۆی گەیاندە خەستە خانە و دیتی داری لە سەر بەردی نەماوە. کاولێک نە بێ چیتری لێ نیە.

- ئێستا چبکەم. بچمە کوێ، جێگاو ڕێگام نیە. کێ یارمەتیم دەدا؟ لەو فیکرانە دا کوڕی پاشای هاتەوە بیر و گوتی:

- دەچمە کن ئەو تا یارمەتیم بدا.

ئەحمەد ئیتر پارەی نەما بوو. لیباسەکانی فرۆشت و بۆ لای ولاتی کوڕی پاشا کەوتە ڕێ. ڕێگایەکی دوور بوو. چەند ڕۆژ نە هیچی خوارد و نە خۆی شوشت و نە حەسایەوە. کەسێک تەماشای کرد بایە، نەیدەزانی کە ئەوە دوکتۆرە. لای وابوو شوانێکە ساڵەهای ساڵ لە چیا بوە و ئینسانی نەدیوە و بۆتە وەحشی. مێشیش لێی دوور دەکە وتنەوە. بەم سەر و سیمایە چوە ماڵی کوڕی پاشا. لە دوورەوە دیتی گولیزار و کوڕی پاشا لە بەر پەنجەرە وێستاون وقسان دەکەن. کە ئەحمەدیان بینی پەنجەردیان پێوە دا و ڕۆیشتن. ئەحمەد پێی سەیر بوو. لە دڵدا گوتی:

- ئەی خودا.. بۆچی وایان کرد. بێگومان منیان نە ناسی!

ئەحمەد چوە پێش و بە دەرکەوانی گوت:

- برۆ بە کوڕی پاشا بڵێ کە ئەحمەدی دوکتۆر داوات دەکا.

دەرکەوان چوو بە کوڕی پاشای گوت. لە وەلامدا کوڕی پاشا گوتی:

- پێی بڵێ کاتی نیه و نایەتە لای و ئیتر چی لە من دەوێ؟»
دەرکەوان گەڕایەوە و پەیامی کوڕی پاشای پێگەیاند. ئەحمەد کە ئەوەی بیست بە جارێ تێکچوو، نەیدەزانی چبکا. لیباسیشی نە مابوو کە بیفرووشێ و پارەی ئەو خەرجی سەفەر بکا و بگەڕێتەوە. گوتی: « با بچم عەمباڵی بکەم. چوە لەنگەر گای کەشتی و دەستی بە عەمباڵی کرد. ماوەیەکی زۆر خەریکی عەمباڵی بوو. ڕۆژێک دوو پیاوی گەنج بە دوو سندوقەوە هاتن و لێیان پرسی
- چەندەت بدەینێ ئەو سندوقانە بەریە ئەو شوێنە کە نیشانت دەدەین.
ئەحمەد گوتی: سکەیەک.
ئەوان گوتیان : دوو سکەت دەدەینێ سندوقەکان بەرە فلان جێ و لە وێ چاوەڕوانی ئێمە بە.
شوێنەکەیان بە ئەحمەد نیشاندا و ئەویش سندوقەکانی برد و لە وێ چاوە ڕوان وێستا. تا ڕۆژئاوا لە وێ بوو، خاوەن سندوق نەهاتن، شەو درنگ بوو، ناچار سندوقەکانی بردە ژوورەکەی خۆی و بەیانی دیسان هاتەوە ئەو جێگایە. و تا شەو چاوە ڕوان بوو کەس نەهات. ئەحمەد سێ ڕۆژان ئەوە کاری بوو کەس پەیدا نەبوو. ڕۆژی چوارەم سندوقەکانی برد و سەری هەڵگرتن تەماشای کرد یەکیان هەمووی ئامرازی دوکتۆریە و ئەوی دیکەیان پڕە لە ئاڵتون و جەواهیرات. ئەحمەد گوتی : « خەراب نیە. ڕاست ئەم شتەیە کە پێویستم پێیەتی.»
هەر ئەو ڕۆژە بەرەو وڵاتی خۆی گەڕایەوە. دەستی کرد بە دروست کردنی خەستە خانە، ڕاست وەک خەستە خانەی پێشوو. بەڵام قەت ڕەفتاری گولیزار و کوڕی پاشای لە بیر نە دەچۆوە. لە فیکری ئەوە دابوو کە چۆن بیانبینێ و ئەوەی لەدڵی دایە پێیان بڵێ.
ڕۆژێک ویستی هێندێ کەس داوەت بکا، داوەتنامەی بۆ هەموان نارد. میوان کۆ بوونەوە، کوڕی پاشا و گولیزاریش هاتن. لە دەوری سفرە کۆ بوونەوە. ئەحمەد هەستا و ئیجازەی قسەی خواست. ئەوەی لە نێوان ئەو و کوڕی پاشا و گولیزاردا ڕوویدابوو، هەمووی باسکرد. کە تەواو بوو، میوانان

ویستیان هەر لەوێ گولیزار و کوڕی پاشا بکوژن. بەڵام کوڕی پاشا گورج ڕاست بۆوە و جامی خۆی هەڵێنا و ڕووی کردە خاوەن ماڵ و گوتی :

– ئەی ئەحمەد! داخوا بەو سەر و ڕیش و لیباسەوە هاتبایە ماڵی من، خۆت نارەحەت نە دەبووی؟

– بەڵێ.. شەرمم دەکرد. بەڵام ئاخر ئەو ڕۆژە بەدبەختی یەقەی گرتبووم

– منیش بۆیە ئەو ڕۆژە ڕێگام نەدای، تا هەست بە شەرم و خەجاڵەتی نەکەی. ئەو دوو لاوەی کە سندووقەکانیان دا بە تۆ، من و گولیزار بووین، ویستمان کارێک بکەین کە تۆ نارەحەت نەبی. و شەرم نەتگرێ. ئێستا خۆت داوەری بکە و بزانە کارێکی باشمان کردوە یا خەراپ.

کاتێ کوڕی پاشا قسەکانی تەواو کرد هەموو بە سلامەتی ئەو خواردیانەوە. کوڕی پاشا خوشکێکی جوانی هەبوو دایان بە ئەحمەد و ئەوان بە ئاواتی خۆیان گەیشتن و داستانی ئێمەش تەواو بوو.

## چاکە و خەرابە ٢٧

پاشـایەک هەبوو، ڕۆژێک چوە ڕاو. لە سـەر ڕێگا پیرە پیـاوێکی دیت بە ناوی « خانۆ» کۆڵە دارێکی بە پشتێوە بوو. پاشا گوتی :

– تۆ ئێستا پیر بووی، بۆ چما ژن و منداڵت نین لە جیاتی تۆ کار بکەن؟

– نا دەبێ خۆم کار بکەم. قەرزی خۆشم بدەمەوە و هێندێکیش بە قەرز بدەم بە هیدیکە.

– بە کێ قەرزداری و بە قەرز بدەی بە کێ ؟

– دایک و بابم هێشتا زیندوون، دەبێ کار بکەم تا قەرزی ئەوان بدەمەوە. بە منداڵەکانیشم قەرز بدەم تا ئەوان پاشان بمدەنەوە.

پاشا قسەکانی خانۆی لێ خۆش هات. پێی گوت:

– دەبێ هەموو ڕۆژێ سەعاتێک بێیە لای من تا قسان بکەین.

خانۆ هەموو ڕۆژێ دەچوە کن پاشا . شا قسـەکانی خانۆی پێخۆش بوو، هەموو ڕۆژێ مستێک زێڕی دەدایە.

پاشا وەزیرێکی حسودی هەبوو. وەزیر دیتی پاشا خانۆی لەو خۆشتر گەرەکە و مەرحەمەتی لە گەڵ ئەوە لە زیادێیە، ویستی کارێکی وا بکا کە پاشا خانۆ بکوژێ و یا دەری بکا.

چەند مـانگی پێـچوو وەزیر لە قـەسـدی خـۆی پەشـیـمـان نە بۆوە. واتە نەهێشتنی خانۆی لە نییەت دابوو.

ڕۆژێک خانۆ بە پاشای گوت:

– ئەی پاشا. هەمیشە لە گەڵ چاکان چاکە بکە، بەڵام لە گەڵ خەرابان، خەرابە مەکە.

پاشا پرسی بۆچی ؟
– چونکە خەرابەی فیکر و کردەوەیان بۆ ئەوان بەسە. پاشا ئەو قسانەی بە دڵ نە بوو ئیتر خانۆی بانگ نەکرد.
چەند مانگێک پێچوو. ڕۆژێک چەند میوانی وڵاتی دراوسێ هاتنە کن پاشا. پرسیاری زۆریان لێکرد و وەڵامی دانەوە. وەبیری هاتەوە کە ئەم وەڵامانە لە خانۆ فێر بوە. بە خۆی گوت :
–باشە دۆستایەتی ئێمە بۆ تێکچوو.؟
کاتێ ڕووداوەکەی وەبیر هاتەوە، خۆی بە تاوانبار زانی. بە وەزیری گوت کە دەست بەجێ خانۆی بۆ بانگ کات.
وەزیر کە بە دەر کردنی خانۆ شاد ببوو، ئێستا نارەحەت بوو، دیسان کەوتە بیری پیلان نانەوە تا خانۆ لە بەین بەرێ.. بەڵام بە ناچار چوە کن خانۆ و گوتی: « پاشا ئیمشەو چاوە ڕوانتە.»
پاشان گوتی:
– با ئێستا بچینە ماڵی ئێمە. چەند ساڵە یەکتر دەناسین، جارێک نە هاتوویە ماڵمان.
خانۆ لە گەڵ وەزیر چوە ماڵیان. وەزیربە کەباب و سیر و ماست میوانداری کرد. سیرێکی زۆری دەماستەکەی کرد و بە خانۆی گوت: « تۆ دانیشە ئێستا دەگەڕێمەوە.»
وەزیر خانۆی بە جێهێشت و چوە کن پاشا و گوتی :
– نازانم بۆ خانۆت خۆش دەوێ و بانگی دەکەی؟
پاشا گوتی:« پیاوێکی ئاقڵە بۆ دۆستایەتی نەکەم.؟»
وەزیر گوتی :
–دەزانی خانۆ لە هەموو شوێنێ بڵاوی کردۆتەوە کە پاشا بۆگەنی لە زاری دێت،
پاشا تورە بوو گوتی :
– ئەگەر دەرکەوێ ڕاست دەکەی، فەرمان دەدەم دەست بە جێ سزای

بدەن.

شەو کاتێ خانۆ هاتە کن پاشا، شا زۆر نیزیک لای دانیشت. هەر چەندی پاشا لێی نیزیک دەبۆوە، خانۆ خۆی لێ دوور دەخستەوە، جگە لەوە دەستیشی بە زاریەوە دەگرت. پاشا لە دڵدا گوتی:

– دیارە وەزیر ڕاست دەکات

پاشا بە گوێرەی داب هەموو جارێ، کاتی خانۆی بانگ دەکرد، کە دەهات بڕوا نووسراوێکی دەدایە بۆ خەزێنە دار تا چەند سکەیەکی بداتێ. ئەم جارەش یاد داشتێکی دایە و گوتی :

– بیدە بە خەزێنەدار. لە یاد داشتەکە نووسرا بوو: « هەر کەسێک ئەم یاد داشتەت بداتێ، دەست بە جێ ئیعدامی بکە و جنازەکەشی لە دەروازەی شار هەڵاوسە و لە سەر سینگی بنووسن: «ئەوە چارە نووسی کەسێکە قەدری چاکە نەزانێ.»

وەزیر لە پەنجەرەی ماڵی خۆیان دیتی کە خانۆ بە نامەیەکەوە لە کۆشکی شا هاتە دەر. وایزانی کە دیسان لە خەزێنەدار پارە وەر دەگرێ. تەماعی ڕێکەوت و چوە نیزیک خانۆ و گوتی :

– ئەی خانۆ، تا ئێستا پاشا زێڕێکی زۆری داوە بە تۆ. وەرە پیاوەتی بکە و ئەم نامەیە بدە بە من، با ئەمجار من پارەکە وەر بگرم.

خانۆ گورج نامەکەی دا بە وەزیر. وەزیر بە خۆشیەوە چوە کن خەزێنە دار و نامەکەی دایە. خەزێنەدار نامەکەی خوێندەوە و بانگی « جەلاد » ی کرد

جەلاد گورج خۆی گەیاندێ. خەزێنە دار گوتی : « بە فەرمانی پاشا لە سەری بدە.!»

هەر چەند وەزیر پاڕاوە، خەزێنە دار مۆڵەتی نەدا و گوتی :« من دەبێ فەرمانی شا ئیجرا بکەم.»

جەلاد لە سەری وەزیری دا و جەنازەکەیان لە دەروازەی شار هەڵاوسی. خەبەریان بە شا دا کە جەنازەی وەزیر لە دەروازە هەڵاوسراوە. شا ئەمری کرد خەزێنە دار بێنن. خەزێنە داریان ئامادە کرد و پرسیاریان لێکرد. خەزێنە

دار گوتی:

– ئەی قیبلەی عالەم ! خۆت ئەمرت کرد بوو.

ئەمجار پاشا گوتی: خانۆ بێنن و لێی پرسێ :

– کاتێ لە کن من دانیشتبووی، بۆ چی بە دەسرە زاری خۆت دەگرت.

خانۆ حکایەتی سیر خواردنی ماڵی وەزیری بۆ گێڕاوە. پاشا کە ئەوەی بیست گوتی :

– هەقت بوو. لەگەڵ خەرابان نابێ خەرابە بکەی، چونکە هەر خەرابەی نیەت و کردەوەیان بۆیان بەسە. دیتت کە وەزیری خەراب چۆن بە سزای خۆی گەیشت.

## دوو کوێر ٢٨

ڕۆژێ کوێرێک بە ڕێگا دا دەڕۆی چاوساخێکیش بە دوای ئەو دا ڕێی داگرتبوو. کابرای چاو ساخ چەمەدانێکی پێبوو، هێندێ لیباس و کەوش و شتی بۆ ماڵێ کریبوو. لە پشتەوەی کوێرەکە دەڕۆیشت و گوتی با ئەم کوێرە تاقی کەمەوە بزانم چ پیاوێکە. دەڵێن کوێر ڕاست نین. بزانم ئەم قسەیە ڕاستە.

چاو ساخ دارێکی دەست دایە و دەعەرزی دەکوتا و بە کوێرەکەی گوت:

– برا گیان من کوێرم چاوساخیم بکە و لە گەڵ خۆتم بەرە.

– پەنا بۆ خوا. خۆم کوێرم، تۆ بۆ کوێ بەرم؟

– بۆ کوێ دەچی، منیش بەرە. دەستی لە کوێر هەڵنەدەگرت و ئاخرەکەی پێکەوە ڕێک کەوتن . برێک ڕۆیشتن. چاو ساخ گوتی

– برا گیان! ئاگات لەو چەمەدانەی من بێ، تا دەست بە ئاو دەگەیێنم. ئەوەک یەکێک بێ و بیبات،

کوێرە گوتی :« برۆ برام. برۆ دڵنیا بە.

کابرای چاو ساخ چوو له پشت دارێک خۆی مات کرد و ئاگای له کوێره بوو. دیتی کوێره چه‌مه‌دانی کرده وه نێوه‌که‌ی کۆڵیه‌وه تا بزانێ چی تێدایه. پاشان هه‌ڵیگرت و له ڕێگا لایدا و گۆیا خۆی شارده‌وه.

کابرای چاو ساخ له پشت داره که هاته ده‌ر و چوه جێگای چه‌مه‌دانه‌که و بانگی کرد:

– براکه‌م له کوێی، ناتبینم. کوێره بێده‌نگ بوو.

– جارێکی تریش بانگی کرد و گوتی :

– برام من کوێرم، به‌د به‌ختم، گه‌دایی‌م کردوه و هێندێ شتم بۆ منداڵان کڕیوه. به‌زه‌یت به من دانایه.؟

کوێره بێده‌نگ بوو، وه‌ڵامی نه‌دایه‌وه، کابرای چاو ساخ به‌ردێکی ده‌ست دایه و گوتی :« ئه‌ی خودای گه‌وره، ئه‌م به‌رده به سه‌ری برای کوێرم دابده. له کوێره‌ی وه نیزیک که وت به ره‌دکه‌ی توند له پشتی دا. کوێره هاواری کرد و گوتی:

– خودا درۆزن بگرێ، ئاخر کوێر چۆن ده‌توانێ به‌ردی ئاوا بوه‌شێنێ.

## محەممەد ٢٩

محەممەد لە گەڵ سێ برادەری خۆی سوار بوون کە بچنە حەج. ماوەیەک بە ڕێگا دا ڕۆیشتن، ئەسپی محەممەد وەستا. بە ڕەفیقانی گوت: « ئێوە بڕۆن، خواتان لە گەڵ. من لە گەڵ ئێوە دەر ناچم.

ئەوان ڕۆیشتن. محەممەد لە ئەسپ دابەزی و زینی لێکردەوە و بەرەڵای کرد بلەوەڕێ. پاش حەسانەوە، ئەسپی زین کردەوە وسوار بوو کەوتە ڕێ. گەیشتە چادری سەحرا نشینان. لە چادرێک نیزیک بۆوە و دیتی ژنێک لە پێش چادرەکە دانیشتوە. محەممەد ڕاوەستا و سڵاوی کرد و گوتی : « میوان ڕادەگری ؟»

– میوان خۆشەویستی خودایە، فەرمو بە خێر هاتی. محەممەد دابەزی. ژن ئەسپی لێ وەر گرت و ئەسپەکەی لە مەزرایە بەستەوە، گەڕایەوە لبادێکی بۆ ڕاخست و ئاوی هێنا دەست ولاقانی بشوا. پاشان نانی هێنا و پێکەوە نانیان خوارد و محەممەد پرسی :

– ئایا پیاوت لە ماڵێ هەیە ؟

ژنە کە گوتی. تۆ چکاردت بەوە داوە، تۆ میوانی. هاتوویە ئەم چادرە. چکارت بەوەیە کە پیاو لە ماڵێ هەیە یان نا ؟

شەو جێگای بۆ ڕاخست و هەر تکیان چوون بخەون. نیوە شەو محەممەد وە خەبەر هات و چوە سەر جێگای ژنەکە.

ژن بە محەممەدی گوت:

– تۆ لێرە میوانی، بڕۆ بخەوە، بۆ هاتوویە ئێرە. ئەگەر مێردەکەم هاتەوە، ئیجازەی لێ وەر دەگرم، ئەگەر ئەو ڕێگای دا ، وەرە لە گەڵ من بنوو.

محەممەد چووە سەر جێگای خۆی و تا بەیانی لێی نوست، بەیانی کە هەستا گوتی:

– ئەسپەکەم لە کوێیە، دەمەوێ برۆم.

– ڕاوەستە. لە پێشدا نان بخۆ و دوایە برۆ.

نانی بۆ هێنا و محەممەد نانی خوارد و دیتی پیاوێک بە سواری ئەسپ و تفەنگ دەشانیدا، لە پێش خێوەت دابەزی، ژنەکە ئەسپی لێ وەر گرت، محەمەد لە ترسان زراوی چوو. ژنەکە بە مێردەکەی گوت:

– دوێنێ شەو میوانەکەمان دەیویست لە گەڵ من بنوێ. من گوتم مێردەکەم لە ماڵ نیە، کە هاتوە ئیجازە لەو دەخوازم.

مێردی ژنەکە بێدەنگ بوو. محەممەد گوتی:

– ئەسپەکەم لە کوێیە، دەمەوێ برۆم.

– ڕاوەستە. من تازە هاتوومەوە، با پێکەوە نانێکی بخۆین و دوایە برۆ. جارێکی تر دانیشتنە سەر سفرە و پاش خواردن محەممەد داوای ئەسپەکەی کرد. خاوەن مال گوتی:

– ئێستا هەر ماست و هەنگوینمان خواردوە. ڕاوەستە بەرخێک بکوژینەوە و بیکەینە کەباب و دەیخۆین و ئەمشەویش لای ئێمە بە و پاشان برۆ.

محەممەد ناچار گیر بوو. بەرخیان کوشتەوە وکەبابیاب خوارد وجێیان بۆ محەممەد ڕاخست و خاوەن ماڵ گوتی:

– برۆ لە گەڵ ژنەکەی من بخەوە. من لە جێگای تۆ دەنووم،

– نا،، ژنی تۆ دایک و خوشکی منە. بەیانی محەممەد زوو هەستا و ویستی سوار بێ و بڕوا.

خاوەن ماڵ گوتی:

–ڕاوەستە. نان بخۆ و برۆ. پاشان بە ژنەکەی گوت: « نان و گۆشتی سورەوە کراو بۆ میوان ئامادە بکە لە گەڵ خۆی بەرێ.» محەممەد کە لە ترسان ئارامی نەبوو، ماڵاوایی لە خاوەن ماڵ کرد و لە خێوەت چوە دەرێ. دیتی ئەسپەکەی زین کراوە و خورجێنێکی پڕ لە خواردەمەنی لە پاشتەرکی بەستراوە. سوار بوو

کەوتە ڕێ.

ئەوش بڵـێم کە مـحـەممەد زۆر دەوڵەمـەند و خـاوەنی چەند دوکـان بوو. ڕۆژێک لە پێش دوکانی خۆی وێستا بوو دیتی دوو کەس دەستی ژنێکیان گرتوە و ڕایدەکێشن. محەممەد ژنەکەی ناسیەوە. ئەو ژنە بوو کە لە خێوەت میوانیان بیوو.

محەممەد پرسی :

- ئەو ژنەی بۆ کوێ دەبەن.؟

گوتیان ئەو ژنە پێمان قەرز دارە و لە جیاتی قەرزی خۆمان دەیبەین.

- قەرزەکەی چەندە ؟

- سەت لیرە.

- وەرن ، ئەوە سەت لیرە ، وازی لێ بێنین.

محـەممەد ژنەکـەی بردەوە مـاڵێ و بە خـێزانـی گـوت: « ئەو ژنە خـوشکی منە. لیباسی تازەی بدەیە و نان و خواردن و با لە ماڵی ئێمە بێ.»

ساڵێک بە سەر چوو ڕۆژێک مـحەممەد دیتی دوو پیاو دەستی کەسێکیان گرتوە و ڕایدەکێشن. محەمەد پیاوەکەی ناسی.

پرسی بۆ کوێی دەبەن.؟

گوتیان دوو سەت لیرەمان پێ قەرز دارە و لە جیاتی قەرز دەیبەین.

مـحـمـمەد دوو سـەت لیرەی دانێ و کـابرای نەجـات دا و بردییەوە مـاڵێ. ناردییە حەمام و لیباسی جوانی دەبەر کرد و پاشان بردیە دوکان و گوتی :

- لەم لایە من دەفرۆشم و لەو لاش تۆ بفرۆشە. پاش ماوەیەک گوتی:

- دەمەوێ ژنت بۆ بێنم.

- خۆت دەزانی. چۆنت پێباشە وا بکە.

- خـوشکێکی زۆر جـوانم هەیە دەیدەم بە تۆ. ئەوەش بڵـێم کە ژن و مـێرد هیچیان محەممەدیان نە ناسیە وە.

محـەممەد کابرای بردە کن ژنەکەی و یەکتریان ناسیەوە و زۆر خۆشـحاڵ بوون

مێرد لە ژنەکەی پرسی:« تۆ چۆن کەوتیە ئێرە،»

ژن گوتی : « سەت لیرەی دا بە قەرز دارەکان و منی نەجات دا.»

مێردەکەش گوتی :« بۆ رزگاری منیش دوو سەت لیرەی دانێ. ژن و مێرد حەوت ساڵان لە ماڵی محەممەد گیرسانەوە. ڕۆژێک پیاوەکە بە ژنەکەی گوت:

- ئێمە ئەوە حەوت ساڵە بۆ ئەرباب کار دەکەین. تۆ بڵێی بایی سێسەت لیرە کارمان نەکرد بێ.؟

بەڵام محەممەد لە جیایەکی نیزیک شوێنەکەی خۆی، خێوەتێکی هەڵدا. مێگەلە مەڕ و ڕەوە ئەسپ و ماڵاتی لە گەڵ فەرش و لیباس و خواردەمەنی بردە وێندەرێ.

ڕۆژێک مێردی ژنەکە بە محەممەدی گوت:

- ڕێگامان بدە بڕۆین. محەممەد بە ژنەکەی گوت نان و کەباب و خواردەمەنیان بۆ ڕێگا بۆ دانێ. پاشان سواری ئەسپی کردن و بردنی بۆ ئە و کێوە. ژن و مێرد چاویان بە مێگەلە مەڕ و ڕەوە ئەسپ و فەرش و شتی ماڵێ کەوت. محەممەد گوتی :

- ئەو شتانە هەموو بۆ ئێوەن. حەوت ساڵ کارتان بۆ من کردوە، ئەوەش پاداشی کارەکەتانە. ماڵاوایی لێکرد و ڕۆیشت.

پیاوەکە لە دڵی خۆیدا گوتی:

- چۆن چاکەی ئەو پیاوە بدەمەوە، باشترە بیکوژم و لە شەڕی ئەم هەقناسییە نەجاتم بێ.

سەری ئەسپی باداوە و بانگی محەممەدی کرد و گوتی: بوێستە.

محەممەد لە مەبەستی گەیشت و ڕاوەستا. کابرا لێی وە نیزیک کەوت و گوتی :

- تۆ ئەو هەموو چاکەت لە گەڵ من کرد. ئێستا چۆن تۆڵەی بکەمەوە. دەبێ بتکوژم و لە ژێر باری ئەم چاکەیە خۆم رزگار بکەم.

- چما تۆ من ناناسی ؟ من ئەو کەسەم کە میوانی تۆ بووم و دەمویست لە گەڵ خێزانت بنووم. ئەو پێی گوتی. تۆ لە جیاتی ئەوە ڕێزت لێگرتم. من کەڕامە وە و

لە گەڵ خۆم شەرتم کرد کە ئێوە هەر تکتان بۆ من وەک خوشک و برا وابن. من هێشتا ئێوەی ئەم چاکەشم تۆڵە نەکردۆتە وە کە تۆ لە گەڵ من کرد بووت.

هەر تک یەکتریان لە ئامێز گرت و ژن و مێرد لە و خێوەتە دا ژیانیان بردە سەر و محەممەدیش گەڕاوە لای ژنی خۆی و هەموویان بە خۆشی و شادی ڕۆژگاریان بردە سەر.

## سێ ئەحمەد ٣٠

حاکمێک بوو ساڵێ جارێک دەچۆ کن ژنەکەی. ژنەکە دوو کوڕی بوون کوڕی هەوەڵ و دووەمیان ناو نان ئەحمەد. نایبێکی زۆر فێڵە زانی هەبوو، دەیزانی حاکم کەنگێ دەچێتەوە ژوور و دەچێتە کن ژنەکەی. جارێک بەر لەوەی حاکم بچێتەوە ژوور، چوە ژووری حاکم و لە تاریکی دا لە گەڵ ژنەکەی نوست.

پاشان حاکم چۆوە ژوور و لە دەرگای دا، خێزانی دەرگای لێکردەوە و بە سەر سور مانەوە گوتی :

– ئەوە چت لێهاتوە. تۆ پێش سەعاتێک هاتیە کن من. حاکم هەستی کرد چقەوماوە، گوتی:

– کیسە توتنم لە بیر چوو بوو، ڕۆیشت و نیتر نە چۆوە ژوور، نۆ مانگ ڕابرد و خێزانی کوڕێکی دیکەی بوو ئەویشیان ناو نا ئەحمەد.

هەر سێ کوڕ پێکەوە گەورە بوون و زۆری پێنەچوو حاکم مرد. لە وەسیەتنامەکەی دا نووسیبووی: « ئەحمەد کوڕی منە و ئەحمەد کوڕی منە و ئەحمەد کوڕی من نیە و لە میرات بێبەشە.»

هەر سێ ئەحمەد وەسیەتنامەیان خوێندەوە و لێیان بوو بە کێشە. کە لەم

سێ یانه کامیان کوڕی بابمان نیه. پاشان گوتیان: - بۆ کێشه بکەین. با بچینه کن حاکمی وڵاتی جیرانمان. له ئاقڵ و حیکمەت دا به ناو بانگه. داوای لێبکەین ئەو دادوەری بکا.

هەر سێ کەوتنه ڕێ. له شوێنێ وێستان. برای گەورە تەماشای ئەملاو لای کرد و گوتی :

- تازه حوشترێک بێرەدا تێپەڕیوه. چاوێکی کوێر بوه و شەلیش بوه و دوو دانی پێشەوەشی نەبووه.

برای نێونجی گوتی:

- باری ڕۆن و هەنگوین بوه،

برای گچکه گوتی :

- ژنێکی سک پڕ سواری بوه.

لەم کاته دا کابرایەک گەیشتێ و پرسی :

- هیچ حوشترتان نەدیوه. حوشترم بزر بوه و نایدۆزمەوه.

برا گەورەکه پرسی :

- داخواوشترەکەت شەله و چاوێکی کوێره ودوو دانی پێشەوەی نەماون ؟

برای نێونجی گوتی :

- داخوا باری ڕۆن و هەنگوینی لێ بوه ؟

برای گچکه گوتی :

- داخوا ژنێک سک پڕ سواری بوه ؟

خاوەن حوشتر گەلێک شاد بوو، گوتی :

-ڕاست خۆیەتی، کەوابوو ئێوه دیتوتانەتەوه، بۆ نامدەنەو ، له سەر چی ڕاوەستاون،؟

- سوێند به خوا، حوشتری تۆمان نەدیوه.

- نەماندیوه یانی چی. گاڵتەم پێدەکەن. یالله بابچینه کن قازی. چوونه کن قازی و خاوەن حوشتر ڕووداوەکەی بۆ باسکرد و گوتی :

- بێگومان حوشتریان له جێگایەک شاردۆتەوه، بڵێ بمدەنەوه.

برایان گوتیان: « سوێند دەخۆین کە ئێمە هیچمان حوشترمان نەدیوە.»
قازی گوتی: « ئەگەر حوشترتان نەدیوە، ئەدی چۆن هەموو نیشانەکانی دەزانن.؟»
ڕووی کردە برا گەورەکەی و گوتی :
- تۆ چۆن دەزانی حوشترەکە شەل بوە وچاوێکی کوێر بوە ودوو دانی پێشەوەی نەماون.؟
- کاتێ بە ڕێگادا ڕۆیشتوە، لاقێکی بە سەر خاکدا کێشاوە و شوێنی دیارە. گیاشی هەر لە لایەکی ڕێگا خواردوە، یانی چاوێکی نەیدیوە. لە شوێنی دانەکانی پێشەوەی، گیا ساخ ماوەتەوە.. لە ڕووی ئەم نیشانانە، تێگەیشتم کە شەل بوە، چاوێکی کوێر بوە و دوو دانی پێشەوەی نەماون.
قازی لە برای نێونجی پرسی :
- باشە تۆ بێژە چۆن زانیت باری حوشترەکە ڕۆن و هەنگوین بوە ،؟
لە وەڵامدا گوتی :
- زۆر سادەیە. کاتێ حوشترەکە یخی خواردوە، لە لایەکی ڕۆن ڕژاوە و لە لایەکی هەنگوین. لای ڕۆنەکە مێرولەی تێهاڵاون و لای هەنگوینەکە مێش لێی کۆ بوونەوە.
قازی لە برای کچکەی پرسی :
- تۆ چۆنت زانی ژنی دووگیان سواری حوشتر بوە .؟
لە وەڵامدا گوتی :
- بەو نیشانانە زانیم کە بە جێ مابوون. ژنەکە بۆ حەسانەوە لە سەر زەوی دانیشتوە. بەڵام کاتێ ویستوویەتی هەستێ، هەر تک دەست لە زەوی داناون و بە یارمەتی دەستەکانی هەستاوە.
ئەم بەڵگانە ئەوەندە قایم بوون کە قازی نەیتوانی هیچ بڵێ. بیری کردەوە کە چبکا و چ حوکمێک بدا؟ پاشان بە دەنگی بەرز گوتی:
- ئەمشۆ لای من بمێننەوە و شێو بخۆن و بخەون وبەیانی جارێکی دیکە قسەی لێدەکەین و ئیشەللە فیکرێکی لێ دەکەمەوە.

به خێزانی گوت : تا نانێکی باش ساز بکا. ئەویش بەرخێکی کوشتەوە وکەبابێکی خۆشی دروست کرد سفرەی ڕاخست.

برای گەورە پاروە گۆشتێکی هەڵگرت دە زاری نا، ئاخێکی هەڵکێشا و هێنایەوە دەر.

قازی گوت: « چۆن بوو، ناخۆشە ؟»

– بۆنی سەگی لێدێت، ببوورە، ناتوانم بیخۆم.

قازی گوتی :« شوانی بانگ کەن. شوان هات و قازی لێی پرسی:

– ئەم گۆشتە بۆچی بۆنی سەگی لێدێت.؟

– تۆ گەورەی منی. بمبەخشە. ئەو ڕۆژەی ئەو بەرخە لە دایک بوو، دێڵە سەگەکەی مەڕی شیری دەدا بە گجولەکانی. ئەو بەرخە ئەحمەقەش لە گەڵ گجولەکان دەستیکرد بە مژتنی شیری سەگ. خەتای من بوو ئاگاداری نە بووم. داوای لێبوردن دەکەم.

قازی گوتی: تا مەنجەڵە گۆشت فڕێ بدەن.. پاشان مەنجەڵی پلاویان هێنا. برای نێونجی پاروە برنجێکی هەڵگرت، دەزاری ناو هێنایەوە دەرێ و فڕێیدا.

قازی گوتی :« چیە بۆ ناخۆی.؟»

– بۆنی ئاسنی لێدێ. مەنجەڵەکەیان وەر گێڕا. دیتیان بزمارێکی گەورە لە بن برنجەکە دایە، پلاوەکەشیان ڕشت.

قازی گوتی :« تا کەباب ئامادە دەبێ، با شەراب بخۆینەوە. ئەوەی گوت و پیاڵەی پڕ کرد و دای بە برای گچکە. ئەویش لێوی لێدا وپیاڵەکەی دانا.

قازی گوتی : « چیە؟ بۆ نایخۆیەوە.؟»

– بۆنی خوێنی لێدێ.

– بۆنی خوێن.؟ یالله شەراب ساز بانگ کەن. قازی پرسی: « ئەم شەرابە بۆ چی بۆنی خۆنی لێدێت.؟»

کابرا گوتی :

– ئەی حەزرەتی قازی لێم تورە مەبە. کاتێ ترێمان دەشێلا، درکێکم دەلاقی ڕاچوو. خوێنی لێهات و گەوتە ناو ترێ.

قازی ئەمری کرد کویەی شەرابەکە برێژن. پاشان ڕووی کردە خاوەن حوشتر و گوتی:

– ئازیزم برۆ بە خوات دەسپێرم. دڵنیا بە کە ئەوانە حوشتری تۆیان نەدیوە.

خاوەن حوشتر ڕۆیشت. قازی لەو سێ برایەی پرسی:» بڵێن بزانم بۆ کوێ دەچن.؟«

– دەچینە کن حاکمی ئاقڵی وڵاتی دراوسێمان کە شەرعی ئێمە بکات.

قازی گوتی:

– روو داوەکەم بۆ باس بکەن بەڵکو بتوانم یارمەتیتان بدەم.

براکان داستانی خۆیان بۆ گێڕایەوە. تکایان کرد کە بۆیان ڕوون بکاتەوە کە کامیان کوڕی حاکم نین.

قازی هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی :» وەلامی ئەم پرسیارە دژوارە. نازانم بڵێم چی. باشترە تا بەیانی ڕاوەستین. قازی کیژێکی هەبوو لە پشت پەردەوە گوێی لە قسەکان دەبوو. بەر لە نوستن بە باوکی گوت:

– بابە نیگەران مەبە. من باس و کێشەی ئەم سێ برایە کۆتایی پێدێنم.

بابی دەنگی دا و گوتی : » باشە باش . تۆ چ تێدەگەی .«؟

بەیانی کیژەکە چوە کن ئەو سێ برایانە و گوتی:

– لاوەکان گوێ بدەنێ. حکایەتێکتان بۆ دەگێڕمەوە. ڕۆژێک کچێکی زۆر فەقیر هەبوو گوێلەکەلی گوندی دەلەوەڕاند و لەم ڕێگایەوە دەژیا. ڕۆژێک یەک لە گوێلکەکان چوە نێو مێگەلی شوانی جیرانیان. کیژەکە چوە کن شوان و پاڕاوە گوتی: ک – گوێلکەکەم هاتۆتە نێو مەڕی تۆ بمدەوە. شوان گوتی: ئەگەر لە گەڵم بنووی، دەتدەمەوە. ئەوەی گوت و دەستی کچەکەی گرت. کیژەکە پاڕاوە گوتی:

– من هێشتا کچم. لێم گەڕێ. گوێلکەکەم بدەوە، قەولت پێدەدەم کە مێردم کرد هەوەڵ شەو پێش ئەوەی بچمە کن مێردەکەم دێمە کن تۆ و پاشان دەچم لە گەڵ مێردەکەم دەنووم.

شوان بەزەیی پێدا هات و گوێلکەی داوە. کچ گوێلکی برد و ڕۆی. لە

ڕێگادا تووشی کوڕی حاکم بوو. کوڕی حاکم کە چاوی بە لیباسی دڕاوی کیژەکە کەوت ، بەزەیی پێدا هات و هیچی نە گوت. تەنیا لە کیژەکەی پرسی: کێیە و لە کوێ دەژی؟ کچەکە وەڵامی دایەوە و ڕێگای خۆی درێژە پێدا. ئەوەش بڵێم کە خدر پێغەمبەر ڕۆژی لە دایکبوونی کوڕی حاکم بە دایک و بابی گوتبوو کوڕەکەیان ئەگەر ژن بێنێ دەمرێ. هەربۆیە حاکم نەیدەویست کوڕەکە ژن بێنێ. ماوەیەک تێپەڕی خەڵک و کەس و کاری حاکم داوایان لێکرد کە بۆ ئەوەی وەجاخ کوێر نەبێ، ژن بۆ کوڕەکەی بێنێ. هەر چەندی حاکم هەولی دا حالیان بکات کە کوڕەکەی دوای ژن هێنان دەمرێ، فایدەی نەبوو. حاکم چاری نەما. کوڕەکەی بانگ کرد و گوتی:

– کاتی ژن هێنانتە، کیژێک بۆ خۆێ هەڵبژێرە.

کوڕی حاکم کە ئەوەی بیست. کیژە فەقیر و ڕووتەکەی وەبیر هاتەوە. لە دڵدا گوتی: « خۆ من هە ر دەمرم، کە وایە با ئە و کیژە لە هەژاری و فەقیری نەجات بدەم.» پاشان بە دەنگی بەرز گوتی: « من تەنیا کیژی گوێلکە وانی گوندی دێنم.»

حاکم گوتی:

شەرمە، خەڵک چیمان پێ ئێژن! چۆن ئەم کیژە پیسە بێنینە کۆشکی خۆمان.

کوڕی حاکم پێی لێ دەکەوشێکی کرد و گوتی:

– یا ئەو، یا هیچ کەس . چار نەبوو شایی و زەماوەند ساز کرا. کاتێ شەو بە سەر داهات و کوڕی حاکم چوە کن بوکێ، بوک پێی گوت: « بەر لەوەی ببیە مێردی من دەبێ قەولێکی من داومە پەسندی بکەی»

کوڕی حاکم پرسی: « چ قەولێکت داوە.؟»

کچەکە گوتی : « ڕۆژەکانی زۆر پێشتر قەولم بە شوانێکی داوە کە شەوی بوکێنیم لە پێشدا بچمە لای ئەو. ئێستا دەبێ تۆش ڕێگام بدەی، چونکە بەڵێنم داوە.»

کوڕی حاکم گوتی:« باشە ئێستا کە قەولت داوە بچوو.»

کیژەکە چوە گوند و شوانی دیتەوە. شوان پرسی چکارت بە من هەیە ؟
ماوەیەکی زۆر تێپەڕیبوو، شوان قەول قەراری کیژەکەی لە بیر نەما بوو.
کچەکە گوتی :
– بۆ لە بیرت چوە ئەو ڕۆژەی پێکەوە قەرارمان دا کە شەوی هەوەڵی بوکێنیم. لە پێشدا بێمە کن تۆ .
شوان گوتی:« بمبەخشە. من ئەو دەم گەنج و نەزان بووم. تۆ لەجێی خوشکی منی و من براتم.)
کیژەکە خۆشحاڵ بوو گەڕاوە و گوتی : «لە گەڵ شوان شەرتی برایەتیمان بەست و من بووم بە خوشکی.»
بەڵام هەر کە ویستی لە گەڵ کوڕی پاشا بنوێ؛ عزرائیل پەیدا بوو گوتی:« هاتووم گیانت بکێشم»
کوڕی حاکم گوتی: « تۆزی بوێستە با لە پێشدا دایک و باوکم بانگ کەم و پاشان گیانم بکێشە!»
دایک و بابی هاتن. باوک تکای لە عزرائیل کرد و گوتی:« بەزەییت بە کوڕەکەم دابێ. لە جیاتی ئەو گیانی من بکێشە. عزرائیل دەستی کرد بە گیان کێشانی ئەو، گیانکەی گەیشتە ئەژنۆیان، باب هاواری کرد«.. ئاخ.. ئاخ.. بەرمدە. بڕۆ گیانی کوڕەکەم بکێشە.!»
دایکیشی هەر وایکرد. ئەو دەم ژنی کوڕی حاکم، واتە کیژە گوێلکەوانەکە لە پشت پەردە هاتە دەر و بە عزرائیلی گوت:
– گیانی من بکێشە و مێردەکەم با زیندوو بێت»
عزارائیل گیانی کیژەکەی گەیاندە گەروی. کچەکە گوتی: یالله تەواوی کە و بیکێشە.»
عزرائیل کیژەکەی بەردا وگوتی :« لە جیاتی ئەو هەموو بیر باشییە سەت و چل ساڵ تەمەنت دەدەمێ.» کیژەکە گوتی:« ئەگەر وایە نیوەی بۆ من و نیوەی بۆ مێردەکەم.»
کاتێ حکایەتی کیژی قازی گەیشتە ئەو جێگایە ڕووی کردە سێ براکان و

گوتی :

– ئێستا پێم بێژن لەو سێ کەسانە – کوڕی حاکم کە ڕێگای دا ژنەکەی بەڵێنی خۆی بەرێتە سەر و شەوی هەوەڵی بوکێنی دەپێشدا بچێتە کن شوانەکە، یا کیژەکە کە بەڵێنی خۆی بردە سەر و چوە کن شوانەکە، یا شوانەکە کیژەکەی بە خوشکی خۆی دانا – کامیان بە شەڕەفتر و بە شەخسیەت ترن.

برا گەورەکەیان گوتی :« کوڕی حاکم! چونکە ئەگەر من لە جێگای ئەو بام، قەت ڕێگام نەدەدا ژنم کارێکی وابکات.

برای نێونجی گوتی : نا . کیژەکە. چەند ساڵ پێچو بوو، لەوانە بوو قەولەکەی لە بیر چوو بێتەوە. هەموو کەس ئامادە نیە کە نرخی شەوی هەوەڵی بوکێنی فیدای قەول بکات.

برا گچکەکەیان گوتی :« نا شوان کە وازی لە وە هێنا لە گەڵ کیژە کە بنوێ، لە وانیتر بە شەخسیەتترە.

کیژی قازی گوتی : « وا دیارە تۆ بیژووی و لە حاکم نی .!

# نۆکەری ئاقڵ ٣١

پیاوێک بوو کچێکی هەبوو. کیژەکە گەیشتە تەمەنی خۆی لە هەموولاوە خوازبێنی ڕوویان تێکرد. کچەکە پێی دەگوتن:

- لە پێشدا وەڵام پرسیاری من بدەنەوە،پاشان خوازبێنی بکەن.

کەس نەیدەتوانی وەڵامی پرسیاری کیژەکە بداتەوە. ئاخری دایک و بابی کیژە کە تورە بوون و گوتیان :

- ئێمە کارمان بە تۆ نیە . لەو ماڵە بچۆ دەر و بۆ کوێ دەچی بچوو.

کیژەکە گوتی: « خانوێیکی جیاواز بۆ من دروست بکەن.

باوک پارەیەکی زۆری خەرج کرد و ماڵێکی بۆ ساز کرد کیژ و خزمەتکارەکانی بۆ ئەو ماڵە گوێستەوە. دیوارێکی لە دەوری خانوکە کێشا و خواردەمەنی و پێداویستیی چل ساڵی بۆ لەو ماڵە دانا و بە کیژەکەی گوت :

- کیژم! ئێستا هەر چۆنی دەتەوێ ئاوا بژی. خوازبێنیکەر ڕوویان دەو ماڵە کرد، بەلام کەس نەیتوانی وەڵامی پرسیاردکەی بداتەوە.

ئێستا داستانێکی دیکە باس دەکەین.

سێ برادەر بوون یەکێیان زۆر ئاقڵ و زاناو ئەمیر بوو. دووەمیان دەوڵەمەند و سێیەمیان نۆکەری ئەوان بوو. ڕۆژێک هەر سێکیان چوونە ڕاو. لە پەنا جۆگەلەیک ڕاوەستان. لغاویان لە ئەسبەکان کردەوە و بەرەلایان کردن. پاش ئەوەی حەسانەوە، ئەمیر گوتی:

- وەرن با هەر یەک بە تەنیا ڕاو بکەین.

هەر یەکە ڕوویان دەلایەکی کرد. ئەمیر ماوەیەک گەڕا و هیچی نەدیتەوە. هیلاک و برسی و تینوو لە بن دار بادامێک دانیشت تۆزێ بحەسێتەوە.

تەماشای دەور و بەری خۆی کرد. لە سەر ئەو چیایە هەموو جێیەک دیار بوو. ئەو کچەی دیت کە خزمەتکار دەوریان داوە، عاشقی بوو وای لێهات بێهۆش کەوتە سەر زەوی.

دووەمیشیان گەڕا و هیچی نەدیتەوە. ڕێگای کەوتە سەر ئەو چیایە و دیتی رفیقەکەی بێهۆش کەوتوە. گوتی: بێگومان ڕفیقەکەی شتێکی دیوە. ئەویش سەیری ئەملاولای کرد و کیژەکەی دیت، ئەویش عاشقی بوو، بێهوش کەوت.

بەڵام نۆکەر. ئەویش گەلێک گەڕا و هیچی دەست نەکەوت و گەیشتە هەمان چیا. هەرتک برادەری خۆی بە بێهۆشی چاو پێکەوت. پاشان سەیرێکی دەور و بەری کرد، ئەویش کیژەکەی دیت و عاشقی بوو، لە دڵی خۆیدا گوتی:« تۆ بۆ من دەبی» پاشان رفیقەکانی وە هۆش هێناوە. ئەوان هەستان و دیتیان کاتی ڕۆژئاوایە و هیچیان ڕاو نەکردوە.

ئەمیر گوتی: « ومرن بچینەوە. لە بەر خۆی بیری کردەوە کاتێکی هەموو خەویان لێکەوت دە چم خوازبێنی ئەو کیژە دەکەم. شەو درنگ ئەمیر بە یەواشی هەستا و چوە پەنا دەروازەی ماڵی کیژەکە و لە دەرگای دا. خزمەتکار دەرگای لێکردەوە و پرسی:

لە چی دەگەڕێی؟

ئەمیر لە وەڵامدا گوتی : « دەمەوێ خانمەکەت ببینم.»

– لێرە ڕاوەستە، بچم پێی بڵێم. ئەگەر ڕێگای دا دەتبەمە لای. خزمەتکار چوە کن کیژە کە و گوتی: کابرایەک هاتوە بتبینێ.

– برۆ پرسیارەکانی منی لێبکە. با وەڵام بداتەوە و پاشان بیهێنە.

خزمەتگار گەڕاوە و گوتی :« وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەوە: مانگایەکمان هەیە، نە گەورەیە و نە بچوک. نە قەڵەوە و نە لاواز، چەند مەن ڕوون دەدا.؟»

ئەمیر فیکری کردەوە وەڵامێکی نە دۆزییەوە. گوتی : حەوت مەن.

خزمەتکار چو وەڵامەکەی بە کیژەکە ڕاگەیاند. کیژەکە گوتی :

– برۆ پێی بڵێ کە بۆ من نابێ. هێشتا پێنەگەیشتوە. دەبێ زۆر شت فێر

بێ. منداڵە، تەنانەت سەری لە دڵداری دەر ناچێ ، جا چۆن لە قسەکانی من تێدەگا .

ئەمیر ئەم وەڵامەی بیست و گەڕایەوە. دیتی رەفیقەکەی بۆ لای دەروازەی کیژەکە دەچێ. خۆی لە بن پردێ مات کرد و بە خۆی گوت:« با وەڵامی پرسیارەکان بداتەوە و کچەکە بۆ ئەو بێت، پاشان من لێی دەستێنم.

رەفیقی دووەم لە دەرگای دا و خزمەتکار دەرگای کردەوە و چوە کن کیژەکە و گوتی :

– ئەی خانم یەکی دیکە هاتوە، چی پێ بێژم ؟

– برۆ پرسیارەکەی پێ بێژە. ئەگەر وەڵامی ڕاستی دایەوە. بیهێنە. ئەگەر جوابی نەداوە، بینێرە کن ئەویتر.

خزمەتکارهاتەوە کن کابراو لێی پرسی:« مانگایەکمان هەیە، نە گەورەیە و نە کچکە. نە قەڵەوە ونە لاواز. چەند مەن ڕۆن دەدا؟

زۆری بیر کردەوە، لە ئاخر دا گوتی : شەش مەن.

کیژەکە گوتی : برۆ پێی بێژە: تۆ هێشتا منداڵی. ڕاوەستە با تۆزێ گەورە بی

کابرا گەڕایەوە کە بچێتەوە ماڵ. دیتی یەکێک بۆ لای دەروازەی ماڵی کچەکە دەچێ. لە بنپرد خۆی شاردەوە. دیتی رەفیقی گەورەی لە وێیە. لە ئەمیری پرسی:« باشە تۆش ئەوە لێردی؟ ئەوەی بۆ لای ماڵی کیژە کە دەچوو ناسیان کە نۆکەرەکەیانە.

نۆکەر لە دەرگای دا و خزمەتکار دەرگای کردەوە و پرسی کارت چیە؟

نۆکەر گوتی : هاتوومە خوازبێنی. خزمەتکار بێ ئەوەی لە کیژەکە بپرسێ، پرسیارەکانی لێکرد و گوتی : مانگایەکمان هەیە نە گەورەیە و نە کچکە، نە قەڵەوە و نە لاوازە.چەند مەن ڕۆن دەدا ؟

دوو کەسەکەی تر لە بن پرد گوێیان دابوە قسەکان. لە بەر خۆیانەوە گوتیان: ئێمە کە ئاقڵ و زانا و دەوڵەمەندین، نەمانتوانیوە وەڵام بدەینەوە، با بزانین ئەو دەڵێ چی ؟

نۆکەر لە وەڵام دا گوتی :« هەرچەندی بیدا گرنگ نیە. من بە دڵ و گیان ئامادەم وەری بگرم و تا مردن خزمەتی بکەم.

خزمەتکار چوو، وەڵامی نۆکەری پێگوت:

کیژەکە گوتی: با بێتە ژووریّ. نۆکەر هاتە ژوور. کە گەیشتە ماڵ. دیتی ژوورەکە چۆلە و کورسییەک لە نێوە ڕاست دانراوە. گوتیان: دانیشە.

دانیشت. خزمەتکار کەشەفێکی هێنا و شوتییەک و کێردێکی لە سەر بوو.

خزمەتکار گوتی :« وەڵامی پرسیارێکت داوە. ئێستا دەبێ وەڵامی پرسیاری دووەم بدەیەوە.

جاریّ با بزانین ئەم دوو کەسەی ژێر پرد چدەکەن.

ئەمیر بە رەفیقی دووەمی گوت:« وەرە با بچینە حەسار و بزانین ئاخری بە کویّ دەگات. چوونە حەسار و لە پەنا پەنجەرە خۆیان مات کرد، دیتیان نۆکەر، کێردەکەی هەڵگرت ، شووتیەکەی لەتکرد وکێردەکەی لە کن دانا و ناردییەوە بۆ کیژەکە.

پاشان کیژەکە سێوێک و قوتوە دەرزییەکی بۆ نارد و خزمەتکار گوتی : ئێستا وەڵامی ئەم پرسیارە بدەوە.

نۆکەر سێوەکەی هەڵگرت، دەرزییەکانی تێچەقاند و بۆ کیژەکەی ناردەوە. پاشان کچەکە لاپەڕە کاغەزێک و مقەستێکی بۆ نارد. نۆکەر مقەستی هەلگرت و کاغەزەکەی ورد کرد و بۆی ناردەوە. کیژەکە هاتە لای و گوتی:

– باشە ئێستا من هی تۆم و تۆ هی منی. بەیانی وەرە.

نۆکەر ڕۆیشت. ئەمیر و رەفیقەکەشی چوونەوە. بەیانی ئەمیر گوتی: نۆکەر بێننە ئێرە و لێی پرسی : دوێنیّ شەو لە کویّ بووی

– لە ماڵیّ نوستبووم

– درۆ مەکە. ڕاستی بێژە، دوێنیّ شەو لە کویّ بووی.؟

نۆکەر دانی پێدا نەهێنا. ئەمیر فەرمانی دا کە لەداری بدەن. کاتیّ کە ویستیان تەنافی بخەنە ئەستۆ لە پڕ دیتیان سوارێک لە دوورەوە بە غار دێت تا

گەیشتە دارەکە و هەنارێکی لە گیرفانی دەر هێنا بە دارەکەی دادا . هەنار قەڵشی و دەنکەکانی بە سەر زەویدا بڵاو بوونەوە.

کاتێ نۆکەر ئەمەی دیت هاواری کرد:« بەرم دەن، تا ئێستا هەموو شت بڵێم.»

ئەمیر گوتی بەریدەن و پرسی :

- باشە، ئێستا بڵێ بزانم مەتەڵی ئەم مانگایە چیە؟

- کیژەکە بەم مەتەڵە پرسی:« تۆ کە چاکە و خەرابەی من نازانی چۆن خوازبێنیم لێدەگەی»؟ من لە وەلامدا گوتم :« هەر چی بێ بەدڵی منی .»

باشە مانای کێرد و شوتی چیە ؟

- کیژەکە بەم هۆیە گوتی :« ئەگەر ئەمیر بزانێ کە من دەبمە هاو سەری تۆ، لە تۆم دەستێنێ.»

لە وەلامدا گوتم:« ئەگەر وەک ئەم شوتییە دوو لەتم کەن، ڕازی ئەوە بە کەس ناڵێم.»

- باشە. مانای سێو و دەرزییەکان چیە ؟

- ئەوەش مانای ئەوە بوو کە ئەگەر وەک ئەم دەرزییانە شیرم لە لەشی ڕابکەن، قسێک نادۆرێنم

ئەمیر پرسی :کاغەز و مقەست بۆ چی بوون:

-کاغەز بەو مانایە بوو ئەگەر وەک ئەم کاغەزە ورد وردم بکەن دیسان هیچ ناڵێم.

ئەمیر گوتی: ئەدی بۆ هەموو شتێکت درگاند.؟

- چونکە کیژەکە گوتی:« ڕووداوەکە باس کە.»

ئەمیر گوتی: ئەو خۆ نە هاتە ئێرە، چۆن توانی پێت بڵێ هەموو شت باس کەی ؟

- ئەو سوارەی کە هەنارەکەی بە دارەکە دادا، کیژەکە خۆی بوو. بەم هۆیەوە گوتی: ڕازی ئێمە هەموو دەزانن، هەموو شێ بڵێ.

پاشان نۆکەر گوتی : ئێستا ئەگەر تۆ ئەمیرێکی باش و ئینسان و

میهرەبان بی، دەبێ شایی و زەماوەندمان بۆ ساز کەی.

ئەمیر مەجلیسی شایی و بوکهێنانی ساز کرد و ئەوان بە ئاواتی خۆیان گەیشتن. هیوادارین ئێوەش پێبگەن،

## ئەحمەد پاشا ٣٢

خوا لە دایک و بابی ئێوەش خۆش بێ. ڕۆژێ کیژی ئەحمەد پاشا بۆ گەڕان چوە مەزرا. لە گەڕانەوە دا منداڵێکی دیت لە عەرزی کەوتوە. بە خزمەتکارەکەی گوت:

– ئەو منداڵە هەڵگرە، لەوانەیە بێکەس بێ، بیبەین گەورەی بکەین.

منداڵەکەیان بردەوە و دیتیان کوڕە. پاشا کوڕێکی هەبوو، ئەو منداڵەش بوو بە کوڕی دووەم.

هەرتک کوڕ گەورە بوون، ڕۆژێک پاشا ژن و کوڕەکەی هەڵگرت و چوە حەجێ، کوڕە دۆزراوەکە کە ناوی « تاپ تیغ» بوو لە گەڵ کچەکەی لە ماڵێ بەجێهێشت. ڕۆژێک تاپ تیغ چوە نێو بازار، توشی پیرێژنێک بوو. پیرێژن پێی گوت : « ئەی «تاپ تیغ» کیژی پاشای بێنە. نە ئەو خوشکی تۆیە و نە پاشا باوکتە. تۆیان لە سەر ڕێگا دۆزیوەتەوە. کیژی پاشا بکە ژنی خۆت و دەبیە خاوەنی سامانی ئەو.

تاپ تیغ هاتەوە ماڵ و لە گەڵ کیژی پاشا دەستێی بە گەمە کرد و خۆی تێهەڵدەقوتاند.

کچی پاشا گوتی : ئاخر تۆ برای منی.

– کێ گوتی من برای تۆم. من منداڵی سەر ڕێگام.

کیژی پاشا دیتی که «تاپ تیغ» وازی لێ ناهێنێ. ناسنێکی لەسەری دا و لە مالێی دەر کرد. خوێنی لە سەر هات و چوە لای دوکتۆر، دوکتۆر سەری بڕژاندەوە و دەرمانی کرد. لە شار دەنگ بلاو بۆوە کە پاشا لە حەج دێتەوە. تاپ تیغ چوە پێشوازی و گوتی:« ئەی پاشا! کیژی تۆ کاری خەراب دەکا. پێمگوت دەست لەو کارانە هەلگرە، تورە بوو سەری شکاندم.

پاشا بە کورەکەی گوت: « لە پێشدا برۆ خوشکت بکوژە.»

کوڕی پاشا رۆی. گەیشتەوە مال و دەستی خوشکی گرت بردیە جەنگەل تا بیکوژێ. کیژەکە لە دەستانی رایکرد و تەواوی شەو هەلدەهات، تا بوو بە رۆژ. لە دلی خۆیدا گوتی: « لەم جیهانە دا ئینسانی خەراب زۆرن . لەوانەیە ئازارم بدەن. چبکەم.»

کانیەک لە جەنگەلدا هەبوو دارێکی لە سەر روا بوو. ئاوی خواردەوە و چوە سەر دارەکە و لە نێو لق و پۆپی دارەکە دا خۆی شاردەوە.

کوڕی ئەمیری عەرەبان لەم جەنگەلە راوی دەکرد. هاتە سەر کانی و عەکسی کیژەکەی لە ئاوێ دا دیت، هێنایە خوارێ و بردیەوە ولە خۆی مارە کرد. چەند سال لە مالی کوڕی ئەمیری عەرەب ژیا و دوو کوڕی بوون و بەلام لەم ماوەیە دا یەک قسەی نەکرد. مێردەکەی وایزانی کە لالە.

رۆژێک کوڕی ئەمیری عەرەب لە بازار دەگەرا، توشی پیرێژنێک بوو،لە گەلی دایمەزراند و گوتی :« ژنێکی باشم بە نسیب بوە، هیچ عەیبێکی نیە، بەلام لالە.

پیرێژن گوتی :« نا لال نیە. دوو سێوان بکرە. یەکی سوور و یەکی سپی. بیدە بە کورەکانت. لە پشت دەرگا خۆت مات کە. بزانە چۆن لە گەل کورەکان دەدوێ.»

کوڕی ئەمیری عەرەب قسەی پیرێژنی بە جێگەیاند. منالەکان لە سەر سێو لێیان بوو بە کێشە. دایکیان گوتی :

– رەبی باوکتان خێر نە بینێ. نەیدەتوانی دوو سێوی وەک یەک بکرێ. خێر نە دیتوو یەکی سووری کریوە و یەکی سپی.

مێردەکەی خۆی نیشاندا و گوتی: « ئەدی بۆ تا ئێستا دەنگت نە دەکرد.؟

– چونکە ئەگەر دەنگم کرد بایە، دەتپرسی کچی کێی و منت دەناردەوە کن دایک و بابم. بەلام ئێستا دەتوانم بلێم: کیژی ئەحمەد پاشام.

کوڕی ئەمیری عەرەب کەیفی ساز بوو گوتی:« لەوەی باشتر کە کیژی پاشای. هەر سبەی ئەسبابی سەفەرت بۆ ئامادە دەکەم، بچی دایک و بابت ببینی. ڕۆژی دوایە ژنی لە گەڵ وەزیر و چل سوار و دوو کوڕەکانی بۆ ماڵی پاشا خستە ڕێ.

قۆناخێک ڕۆیشتن و شەو بۆ حەسانەوە ڕاوەستان. وەزیر بە سوارانی گوت:« ئێوە بخەون، من کێشک دەکێشم.»

شەو چوە خێوەتی ژنی کوڕی ئەمیری عەرەب . ژن وەخەبەر هات . وەزیر گوتی: « دەبێ لە گەڵم بنووی.»

– ئەی وەزیر، ئەم قسانە چیە تۆ لە جێگای باوکی منی، چۆن دەتوانی قسەی وا بکەی ؟

وەزیر گوتی: « لە گەڵم نەنووی دەتکوژم.

– هەر چی دەکەی بیکە. لە گەڵت نانووم. وەزیر سەری کوڕێکیانی بڕی و گوتی: سەری تۆش ئاوا دەبڕم.

– هەرچی دیکەی بیکە. جوابت نادەمەوە. وەزیر سەری کوڕەکەی تریشی بڕی و بە ژنەکەی گوت؛ ئێستا سەری تۆش دەبڕم.

– ئەگەر هەر سەرم دەبڕی، ڕێگا بدە بچمە دەر و پاشان سەرم ببڕە. لە خێوەتێ وەدەر کەوت و بۆ جەنگەڵ هەلات.

وەزیر کە دیتی نێچیر لە چنگانی ڕایکردوە. مەیتی دوو کوڕەکانی هەڵگرت و گەڕایەوە. بە کوڕی ئەمیری عەرەبانی گوت:

– ژنەکەت شێت بوە، سەری منداڵەکانی بڕیوە و ڕایکردوە.

کوڕی ئەمیری عەرەبان بە دوای ژنەکەیدا کەوتە ڕێ. لەم هەرایە دا ژنەکە توشی شوانێک هات و ماندوو نەبووتی لێکرد.

شوان جوابی داوە و گوتی: « خوشکێ بە خێر هاتی سەر چاوان.

ژن گوتی : مەڕێکی لاوازم بدەیە، جلەکانی خۆمت دەدەمێ.

شوان گوتی: تۆ خوشکی منی. جلەکانم ناوێ و مەڕیشت دەدەمێ و ئێستاش بۆت سەر دەبڕم.

شوان ژنەکەی بردەوە ماڵێ. مەڕی بۆ کوشتەوە. بەیانی شوان مەڕی بردە مەزرا. ژنی کوڕی ئەمیری عەرەبان، لیباسی وی کردە بەر و ورگی مەڕەکەی لە سەر ناو ڕاست وەک ئینسانی کەچەڵ کە مووی لە سەری نەهاتبێ، کەوتە ڕێ. ڕۆی ڕۆی تا گەیشتەوە وڵاتی بابی. لەو لاشەوە کوڕی ئەمیری عەرەبان بە پرسیاران دەڕۆی تا گەیشتە ئەو وڵاتە. ژنەکە لە ماڵی بابی بوو بە قازەوان.

شەوێک کوڕی ئەمیری عەرەبان میوانی ئەحمەد پاشا بوو. بە قسان سەریان گەرم ببوو. ئەحمەد پاشا تکای لێکرد، حکایەتێکی بۆ بلێ. کوڕی ئەمیری عەرەبان گوتی : « هیچ نازانم. هیچم لە بیر نیە.»

لەو کاتە دا ژنی کوڕی ئەمیری عەرەبان هاتە ژوور و گوتی: « پاشا سلامەت بێ، ڕێگا بدە من حکایەتت بۆ بلێم. پاشا گوتی : « تۆ بیلێ » کیژەکە دەستی پێکرد و هەر چی بەسەری هاتبوو گێڕایەوە.

ئەحمەد پاشا گوتی : « باشە. ئاخری ئەو ژنە چی بەسەر هات،

– ژن کلاوی ورگە مەڕی لە سەر کرد و گوتی: « من کیژی تۆم. ئەوەی گوتم بە سەر خۆم هاتوە.»

ئەحمەد پاشاو کوڕی ئەمیری عەرەبان زۆر شاد بوون و « تاپ تیغ» و وەزیریان هەر لەوێ بە سزای خۆ گەیاند. کوڕی ئەمیری عەرەبان ژنەکە ی هەڵگرت و بۆ وڵاتی خۆی گەڕایەوە و ژیانیان بە خۆشی بردە سەر.

## محەممەد پاشا و وەزیرەکەی ۳۳

ڕۆژێک محەممەد پاشا لە گەڵ وەزیرەکەی لیباسیان گۆڕی و دەسوڕانەوە، لای ئێواری گەیشتنە دە ور و بەری شار. لەوێ شوانێک دەژیا.پاشا و وەزیر چوونە خانووی ئەو شوانە. شەو ژنی شوان ژانی هاتێ. پاشا دیتی کە شوان سەری لێ شێواوە و بەملاو لادا دەگەڕێ. پاشا پرسی:

- ئەوە چیە. بۆ وا سەرت لێ شێواوە.؟

- ئاخر ژنەکەم منداڵی دەبێ.

- باشە، ئێمە دەچینە دەر، ژنی جیرانەکەت بانگ کە یارمەتی بدا. ژنی جیران هات و ژنەکە منداڵی بوو.

پاشا پرسی : « باشە، ژنەکەت چی بوە ؟

- کوڕی بوە. وەزیر پێکەنی،

پاشا پرسی : « بۆ پێدەکەنی ؟»

- هیچ.. هەر وا پێکەنینم هات.

- وا نیە، ڕاستی بێژە.

- ئەگەر ڕاستیت دەوێ، چارە نووسی ئەم کوڕە ئاوایە کە دەبێتە هاوسەری کیژە تۆ.

پاشا گوتی: من ناهێڵم شتی وا بقەومێ. پاشان پاشا چوە کن شوان و گوتی:« کوڕەکەت بە من بفرۆشە!»

شوان گوتی: « دەچم لە گەڵ ژنەکەم تەگبیر دەکەم بزانم دەڵێ چی.

ژنی شوان پێی گوت: « وەرە با داوای پارەیەکی ئاوای لێ بکەین کە بۆی نە درێ. شوان هاتە کن پاشا و گوتی:

- بە قەدرایی قورسی کورەکەم زێڕمان دەوێ.

پاشا خورجێنی کردەوە وبە گرانی کورەکە زێڕی دایە و منداڵی شوانی لە گەڵ خۆ برد. گەیشتنە پردێک، پاشا گوتی :

- ئەی وەزیر، تۆ گوتت ئەم کورە دەبێتە مێردی کیژی تۆ. وا نیە ؟

وەزیر لە وەلامدا گوتی: « بەڵێ وایە »

پاشا منداڵەکەی لە سەر پردەوە فڕێدا نێو رووبار و ئاو بردی.

ئاشەوانێک دیتی بوخچەیەک بە ئاوێدا دێت، بە دارێکی درێژ هێنایە قەراخ و گرتیەوە. دیتی کوڕێکی تازە لە دایک بوە. منداڵی هەڵگرت و گەورەی کرد.

با بگەڕێینەوە لای پاشا:

ڕۆژێک پاشاو وەزیر دەگەڕان و توشی ئاشێک بوون. وەزیر گوتی با ئەمشۆ لەم ئاشە بخەوین. لە گەڵ ئەم وتەیەش پێکەنی .پاشا پرسی:

- بۆ پێدەکەنی.؟

- تەماشای ئەم کورە بکە، بزانە دەیناسی ؟ ئەوە زاوای تۆیە. هەمان منداڵە کە دە ڕووبارت هاویشت.

پاشا گوتی: « وەرە با لە ئاشەوان بپرسین.»

ئاشەوان هاتە لایان و وەزیر لێی پرسی :« ئەم کورە چی تۆیە ؟»

- کوڕی منە.

- چۆن ئەوە کوڕی تۆیە، هیچ وە تۆ ناچێ. ڕاستی بێژە.

- من لە رووبار دا گرتوومەتەوە. ئاو بە قەراخ ئاش دا دەیهێنا.

پاشا گوتی : بە منی بفرۆشە. خۆ ئەوە کوڕی تۆ نیە. تا ئێستا چەندەت لێ خەرج کردوە، لێم وەر گرە و بیدە بە من.

ئاشەوان گوتی: « با لە گەڵ خێزانم تەگبیر بکەم » ژن گوتی هەتا پێت دەکرێ، زێڕی زیاتر لەم بێگانەیە وەر بگرە.

ئاشەوان هاتە وە کن پاشا و گوتی :« پێنج هەنبانە زێڕم دەیە و بیبە.»

پاشا زێڕەکەی دایە و کوڕەکەی برد. بە بەنا جەنگەڵێکدا دەڕۆیشتن، پاشا

به وەزیری گوت:

– وەرە با سەری ئەم کوڕە ببڕین.

وەزیر گوتی: « چیکردوە کە سەری ببڕین. با لە سەر ئەو دارەی دابنێین. دەکەوێتە خوار و گورگ دەیخۆن.

پاشا ڕازی بوو. وەزیر چوە سەر دار و کوڕەکەی لە سەر لقە دارێک دانا. کوڕ دەگریا و بە لقە دارە وە نووسا. پاشا و وەزیر ڕێگایان گرتە بەر و ڕۆیشتن.

بازرگانێک بە کن ئەم دارە دا دەڕۆی. دەنگی گریانێکی بیست. تەماشای کرد منداڵێکە لە سەر دار دەگری. بە نۆکەری گوت:

– بچۆ سەر دار و بیهێنە خوارێ. منداڵیان هێنا خوار و بازرگان بردیەوە ماڵ و گەورەی کرد.

پاش ماوەیەک پاشا و وەزیر کە خەریکی گەڕان و سوڕانەوە بوون. چوونە ماڵی بازرگان. وەزیر جارێکی دیکەش پێکەنی.

پاشا گوتی: « بە چی پێدەکەنی ؟

– بۆ چما ئەو کوڕەت نە ناسی.؟ ئەوە هەمان کوڕە کە دەبێتە زاوای تۆ.

پاشا توڕە بوو گوتی: « بۆ قسەی بێ جێ دەکەی ؟»

– باوەڕ ناکەی وەرە لە بازرگان بپرسین. بازرگان هات و وەزیر لێی پرسی:« ئەم کوڕی چی تۆوە ؟

– کوڕمە.

– چۆن ئەوە کوڕی تۆیە. هیچ وەتۆ ناچێ. ڕاستی بێژە.

– ڕاستی ئەوەیە. لەم جەنگەڵە لە سەر دار دیتمەوە و هێنامە خوار و بردمەوە و بە کوڕی خۆم قبوڵ کرد.

– نووسین و خوێندنت فێر کردوە؟

– بەڵێ، ئێستا یازدە زمان دەزانێ و تەنیا یەک زمان ماوە کە فێری بێ.

پاشا گوتی : « با بیبەمە کۆشکی خۆم و زمان دوازدەهەمیش فێر بێ. بازرگان ڕازی بوو. پاشا لاوەکەی بانگ کرد و پرسی :

کام زمان نازانی؟

- زمانی هیندی نازانم

پاشا بە زمانی هیندی نامەی بۆ نایبی خۆی نووسێ و دای بە لاوەکە. لە نامە دا نووسیبووی:« ئەی نایب. ئەگەر ئەم کورە بەیانی زوو گەیشتە لات، دەست بەجێ بیخە ناو مەنجەڵی سابوون. ئەگەر شەویش گەیشت، هەر بەو شەوە بیخە ناو مەنجەڵی سابوون.»

لاو نامەی وەر گرت و کەوتە ڕێ تا گەیشتە وڵاتەکە. چوە نێو باغی کۆشک. سەر و ڕوی شوشت و لە بن دارێک ڕاکشا، نامەکەشی لە بن سەری دانا و خەوی لێکەوت.

ڕۆژی دوایە بەیانی کیژی پاشا هاتە نێو باغ و دیتی لاوێکی جوان لە بن دارێک خەوی لێکەوتوە و نامەیەکی لە بن سەری داناوە.

کچی پاشا سەبروکە نامەکەی هەڵگرت و خوێندییەوە. کچی پاشا دوازدە زمانەکەی دەزانی. کیژی پاشا عاشقی کوڕی لاو بوو. نامەکەی دڕاند و لە جێگای ئەو نامەیەکی بە زمانی پاشاوە نووسی: « ئەی نایب. ئەگەر ئەم لاوە بەیانی گەیشتە کن تۆ، هەر بەو بەیانە کیژەکەمی لێ مارە کە. ئەگەر شەویش گەیشتێ، هەر بەو شەوە لێی مارە کە.»

نامەکەی لە بن سەری کوڕەکە دانا و ڕۆیشت.

لاو وەخەبەر هات و چوە کۆشک، نامەکەی دا بە نایبی پاشا. نایب خەڵکی داوەت کرد و گوتی :

- خەڵکینە! ئاگا دار بن، چونکی ئەگەر پاشا بگەڕێتەوە، لەوانەیە بیانوم پێ بگرێ، خەتا بارم بکا. شایەد بن. ئەوە نامەی خۆیەتی و فەرموویە کچەکەی بدەم بەو لاوە.

بەزم و جێژنی بوکیان ساز کرد و کیژی پاشایان دا بە لاوەکە. ساڵێکی پێچوو پاشا نەهاتەوە، کیژی پاشا کوڕ و کچێکی بوو. خەبەر هات کە پاشا و وەزیر دێنەوە. هەموو چوونە پێشوازی. وەزیر بە پاشای گوت:

- قیبلەی عالەم، تەماشا کە و بزانە ئەو کوڕەی دەتویست کە لە بەینی

بەری. بۆتە زاوای تۆ. کچەکەت کوڕ و کیژیکی لەو هەیە.
– ئەم قسە قۆڕە چیە. ماوەیەکە ئەو کوڕە لە مەنجەڵی سابوندا تواوەتەوە.
لەم قسانە دا بوون نایبی پاشا هات. حکایەتی تەواوی بۆ گێڕاوە. پاشا قینی هەستا و کەفی دەپرژاند و گوتی :
– کێ ڕێگای بە تۆ داوە کە کچی من بە شو بدەی؟ وەکیل نامەی پاشای پێ نیشاندا. پاشا دیتی هیچ چاری نیە. وەزیر گوتی :
– ئەی قیبلەی عالەم. ئەوە چارە نووسی ئینسانە هەر وا دەبێ و نا توانی بیگۆڕی.

## باڵوڵی زانا و بازرگان ٣٤

ڕۆژێک لە ڕۆژان بازرگانێک لە گەڵ کاروان بە قەراخ بەغدا دا تێدەپەڕی. لە پشت دەروازەی بەغدا کاروانی خست. بە نۆکەری خۆی گوت: برۆ لە نێو شار چل هێلکەی کوڵاو بکرە و بیهێنە تا نانی بخۆین. نۆکەر چوە بازار و توشی پیرێژنێکی بوو گوتی:
– چل هێلکەم بۆ بکوڵێنە. پیرێژن چل هێلکەی بۆ کوڵاند. نوکەر گوتی ئێستا دەچم پارەکەت بۆ دێنم. هێلکەکانی برد، خواردیان و لە بیری چوو پارەی پیرێژن بدات. لە ڕێگا دا بازرگان لە نۆکەرەکەی پرسی:
– پارەی هێلکەی پیرێژنت دا.؟
– لە بیرم چوو. بازرگان حیسابداری بانگ کرد و گوتی :
– پارەی هێلکەی پیرێژنێ چەندە، بیخە سەودا، تا قازانج بکا و ئەگەر ڕێمان دە بەغدا کەوتەوە بیدەینێ.پاش حەوت ساڵان جارێکی تر بازرگان ڕێی کەوتە بەغدا. بە نۆکەرەکەی گوت:
– برۆ، پیرێژن بدۆزەوە و بیهێنە. نۆکەر پیرێژنی هێنا کن بازرگان. لێی پرسی:« قیمەتی هێلکەکانت چەند بوو؟

- چل فلس،

- ها له جیاتیان چل سکه ئاڵتون وەرگره و برۆ. لەم حەوت ساڵه دا، چل فلسی تۆ، بۆته چل سکه ئاڵتوون.

پیرێژن به خۆشی و به غار گەڕایەوه. له ڕێگا توشی جیرانی بوو، کابرا لێی پرسی:« چۆنه وا به کەیفی.؟»

- ئاخر له جیاتی چل فلس، چل سکه ئاڵتوونم وەر گرتوه.

کابرا گوتی؛ « بازرگان فریوی داوی. خۆت حیسابی کە. له چل هێلکه، چل جوجکه پەیدا دەبوو. دەبوون به مریشک. هەر مریشکەی پێنج شەش سکەی دەکرد. ئێستا حیسابی که چەندییان فێڵ لێکردووی.

پیرێژن قسەی جیرانی باوەر کرد و چوه کن قازی و شکایەتی له بازرگان کرد.

قازی ئەمری کرد، بازرگانیان هێنا، پێیگوت: « بۆچی پیرێژنت فریو داوه:؟»

- فریودانی چی.؟ من له جیاتی چل فلس چل سکه ئاڵتوونم داوەتێ.

قازی گوتی نا فریوت داوه. له چل هێلکه چل مریشک پەیدا دەبوون. خۆت حیسابی بکه، ئێستا دەبێ هەموو کاروان و کالای خۆت بدەی به پیرێژنێ.

بازرگان چاری نەما هەرچی هەیبوو دای به پیرێژن و به دەستی بەتاڵ گەڕاوه. خەمبار له شار دەسوڕاوه، توشی بالولی زانا بوو.

بالول لێی پرسی: « بۆچ وا خەمگینی؟»

بازرگان ڕووداوەکەی بۆ گێڕایەوه.

بالول گوتێ خەمێ مەخۆ. فێرت دەکەم چبکەی. برۆ مستێک گەنمی کوڵاو هەڵگره و بچۆ حەساری قازی و به حەساریان وەر کە، قازی دێته دەر و دەڵێ: « ئەحمەق.. ئاخر گەنمی کوڵاو چۆن دەچێنرێ؟» شین نابێ. که وایگوت تۆش بڵێ:« ئەدی هێلکەی کوڵاو جوجکەی دەبێ؟» قازی له وەڵامدا دەڵێ نا، ئەو دەم داوای لێبکه کاروان و شتەکانت بداتەوه،

بازرگان پەندی بالولی به کار هێنا و شتەکانی وەر گرتەوه.

# چۆن بالولی زانا فێڵی له حاجی به ته‌ماع کرد ٣٥

هه‌بوو نه بوو ، غه‌یری خودا هیچکه‌س نه‌بوو. پیاوێکی فه‌قیر هه‌بوو به ناوی سلێمان. ده‌چوو لقه داری کۆ ده‌کردنه‌وه وده‌یفرۆشت و له‌م رێگایه‌وه ژیانی ده‌برده سه‌ر. به زه‌حمه‌ت هێندێ پاره‌ی کۆکرده‌وه بۆ ئه‌وه‌ی که‌رێک بکڕێ و بارکێشی بکا. به‌ڵام کاتێ قیمه‌تی که‌رێکی پاره کۆ کرده‌وه، فیکره‌که‌ی گۆڕی. گوتی: « هێندێکی دیکه‌ش کۆ ده‌که‌مه‌وه ز له جیاتی که‌ر ، ئه‌سپێک ده‌کڕم. سلێمان ده ترسا که پاشکه‌وته‌که‌ی خه‌رج بکا. بۆیه‌بریاری دا و چوو پاره‌گه‌ی دا به‌حاجی.

به‌ڵام بالولی زانا له دووره‌وه دیتی که سلێمان چۆن پاره‌که‌ی داوه به حاجی. بالول ده‌یزانی که حاجی کابرایه‌کي ته‌ماعکار و نا ڕاسته. کاتێ سله‌مان له ماڵی حاجی ده‌ر که‌وت، بالول لێی چوه پێش و گوتی:

– بۆ چی پاره‌ت دا به‌و کابرا ته‌ماعکاره؟ هه‌ر ئێستا بچو پاره‌که‌تی لێ وه‌ر گره‌وه. دیاره ئه‌و پاره‌که‌ت ناداته‌وه و لێیشت ده‌دا. به‌ڵکوو بتوانی له به‌ر چنگی ڕابکه‌ی. ئه‌و ده‌م وه‌ره لای من، چاوه ڕوانت ده‌بم.

سه‌لمان چوه کن حاجی و گوتی :« حاجی پاره‌که‌م بده‌وه. ئیتر نامه‌وێ ئه‌سب بکڕم . پاره‌که‌ی دام به تۆ به‌شی که‌ر کڕین ده‌کا و ده‌مه‌وێ که‌رێک بکڕم. کاتێ ئه‌و قسانه‌ی کرد حاجی لێی ده‌ست دا دار و گوتی :

– کام پاره ؟ شێت بووی؟ هه‌وه‌ڵ جاره که ده‌تبینم. حاجی ئه‌وه‌ی گوت و داری ده‌ست دایه که له سه‌ری بدا، له به‌ر ده‌ستانی هه‌ڵات و چوه کن بالول. بالول گوتی :

– پێم نه‌گوتی که پاره‌که‌ت ناداته‌وه و لێشت ده‌دا؟ باشه، قه‌ی ناکا.

دەچمە کن حاجی و ئیشەللە پارەکەی لێ دەستێنمەوە. تۆ لێرە بە و تەماشامان بکە. کاتێ دەستم هەڵێنا، وەرە کن حاجی و بڵێ: « حاجی پارەکەم بدەوە، نامەوێ ئەسب بکڕم و کەرێکی دەکڕم.»

ئەگەر لێی دای، قەی ناکا. بچوو لە جێیەک ڕاوەستە وا بێ کە تۆ ئێمە ببینی و ئێمە تۆ نەبینین. دوو بارە کە دەستم هەڵێنا، وەرەوە کن حاجی و بڵێ: « حاجی پارەکەم بدەوە، ئەسب ناکڕم و دەمەوێ کەر بکڕم.

بالول چوە کن حاجی و گوتی :

– حاجی کوپەیەکم زێر دۆزیوەتەوە، بەڵام خۆت دەزانی کە ئالتوونم پێویست نیە، بەڵام کوپەکە ئەوەندە بەرزە. بۆ نیشاندانی بەرزی کوپە دەستی بەرز کردەوە. سلێمان کە چاوی بە دەستی بالول کەوت، هاتە کن حاجی و گوتی:

– حاجی پارەکەم بدەوە، ئەسب ناکڕم و بەشی کەر کڕین دەکات.

حاجی تووڕە بوو، سلێمانی پەلامار دا و گوتی : « بڕۆ. ئێتر نەتبینمەوە. دوور کەوە و لێمان گەڕێ کاری خۆمان بکەین.

سلێمان چوو لە هەمان جێ ڕاوەستا و چاوە ڕوان بوو تا بالول دەست بەرز دەکاتەوە.

بالول قسەکانی درێژە پێدا و گوتی :

– کوپەکەم بردۆتە ئەشکەوتێک کە بیشارمەوە. دیتم لەو ئەشکەوتە کوپەی دیکەی پڕ لە زێڕ ڕیز کراون. کوپەکان بەم بەرزییە. دیسان بۆ نیشاندانی بەرزی کوپەکان دەستی هەڵێنا و گوتی :« حاجی! دەزانم تۆ پیاوێکی ڕاست و لە خوا ترسی. لەم قسانە دا، سلێمان هاتەوە و گوتی : « حاجی پارمکەم بدەوە، وازم لە ئەسب کڕین هێناوە و دەمەوێ کەر بکڕم.

حاجی لە دڵی خۆیدا گوتی : « ئەگەر پارەی سلێمانی نەدەمەوە،بالول لێم وەشک دەکەوێ و لەم زێڕانە بەشم نادا.»

حاجی پارەی سلێمانی داوە و سلێمان ڕۆی. بالول گوتی :

– ئەی حاجی دەزانم تۆپیاوێکی دنیا دیتوی، سارد و گەرمی زەمانەت

چێشتوە. ئێستا گوێ بدەیە. لە نێو زێڕەکان ئەنگوستیلەیەکم دیتەوە. دەقامکم کرد فرەوان بوو، دە باسکم کرد، دیسان فرەوان بوو، کە وام دیت ئاڵقەکوم خستە ملم، لە پڕ تەنگ بۆوە دەهات بخنکێم. سەرم ڕاوەشاند، دیتم بەیانە و ڕۆژە. وەخەبەر هاتم. ئێستا مانای ئەم خەونەم بۆ لێک بدەوە.

بەمجۆرە بالول کڵاوێکی لە سەری حاجی فێڵە زان و تەماعکار نا.

## بالولی زانا و خەلیفە ٣٦

پیاوێک قەستی سەفەری کرد. سەت سکە ئالتوونی هەبوو، بردی دای بە خەلیفە بۆی هەڵبگرێ و گوتی :

– ئەم پارەیەم بۆ لە کن پارەکانی خۆت دابنێ، تا دەگەڕێمەوە. خەلیفە پارەکانی وەر گرت، پاش ساڵێک خاوەن پارە لە سەفەر گەڕایەوە و چوە کن خەلیفە و داوای پارەکەی کرد و گوتی :

– ئەی خەلیفە، من ئەوا هاتوومەوە و پارەکەم بدەوە.

خەلیفە گوتی : « خۆشەویستم، پارەکەت مشک خواردوویە»

– چۆن شتی وا دەبێ؟ بۆچی پارەی تۆیان نە خواردوە، تەنیا پارەی منیان خواردوە.؟

خەلیفە تورە بوو، کابرای وەدەر نا و گوتی : بڕۆ وون بە. تۆ هەر پارەت نەداوە بە من.

خەڵک بە کابرای فەقیریان گوت: بچۆ کن بالولی زانا، بۆی باسبکە،ئەو پارەتیت دەدا.

کابرای فەقیر ناوی « علۆ» بوو. علۆ چوە کن بالول و نەقڵەکەی بۆ گێڕایەوە. بالول پێی گوت :

- برۆ لە ماڵی خۆت دانیشە و نیگەران مەبە. من خۆم پارە ئالتوونەکەت بۆ دێنمەوە.

بالول چوە کن خەلیفە و گوتی :

- ئەی خەلیفە، ئیمڕۆ هەموو منداڵانی شار بۆ گەڕان دەبەمە مەزرا، تۆش زارۆکی دەخۆ ڕێگا بدە لە گەڵ من بێن بۆ گەڕان.

خەلیفە گوتی : فەرموو، هەر سێ کوڕانم بەرە.

ئێوارەی ڕۆژی دوایە منداڵ هەموو گەڕانەوە و بالول منداڵەکانی بردەوە ماڵی خۆیان و تەسلیمی دایک و بابی کردنەوە. بەڵام منداڵەکانی خەلیفەی لە وەتاغی خۆی حەبس کرد و دەرگای لێ کاڵە دان.

شەو خەلیفە هاتە کن بالول و لە زارۆکانی پرسی:« منداڵەکانم لە کوێن؟»

- منداڵەکانت کەرویشک خواردونی.

خەلیفە بە سەر سور مانەوە گوتی :« چۆن منداڵەکانی دیکەیان نە خوارد و تەنیا زارۆکی منیان خوارد؟

بالول گوتی : « چۆنی ناوێ. هەر وەک مشک پارەی علۆیان خوارد و کاریان بە پارەی تۆ نەبوو. ئێستا برۆ پارەی علۆ بدەوە تا منیش زارۆکی تۆ نەجات بدەم. بەم فێڵە علۆ پارەکەی وەگیر کەوتەوە..

## جل و لغاوی خەراب ٣٧

ڕۆژێک جیرانی کەربەلایی فەڕاش گایەکەی جل و لغاو کرد و بە کەربەلایی گوت:« برۆ بۆخۆت لە مەزرا گیا بار کە و بیهێنەوە،

کەربلایی فەراش بەیانی زوو بۆ گیا هێنانێ چوە مەزرایە و بەڵام شەو درنگ هاتەوە. جیرانەکەی پرسی:

– کەربەلایی بۆ وا درنگ هاتیەوە؟

لە وەڵامدا گوتی:« تۆ جل و لغاوەکەت ئەومندە خەراب وە گایەکە خستبوو، من ناچار بووم لە ڕێگا دا حەوت جار بیکەمەوە و بیبەستمەوە.

# دەرمانی موجیزە گەر ٣٨

ڕۆژێک کەربەلایی فەراش تووشی بێ پارەیی بوو. هەر چەندی لە ماڵێ گەڕا هیچی وای نەدیتەوە بەرێ لە بازار بیفرۆشێ. پاش ناهومێدی تورەکەی پڕ کرد لە کشپەڵ و چوە بازار. بە هەڵکەوت یەکێ لە بەگ و گەورەکان لە بازار دەگەڕا، بەگ لە کەربەلایی فەراش وەنیزیک کەوت و سەیرێکی تورەکەی کرد. کشپەڵ ئەوەندە وشک وڕەش هەڵگەڕا بوو نە دەزانرا چیە.

بەگ پرسی :« کەربەلایی فەراش چ دەفرۆشی ؟ »

– شتێکی زۆر بە قیمەتە و خواردنی تۆ نیە.

– بڵێ بزانم چیە و پاشان قسان بکە.

– دەرمانێکی موجیزەگەرە. هەر کەس بیخوا ئەگەر ئاقلیشی نە مابێ، دوو بارە دێتەوە،

بەگ بە سەر سور مانەوە گوتی :« ڕێگا دەدەی یەکێکی تاقیکەمەوە،؟

– بەڵێ.. بۆچ نا. تاقیکەوە.

بەگ کشپەڵێکی هەڵگرت و دەزاری نا و تامی کرد و ڕووی گرژ کرد و گوتی :

– هیچ نەمزانی چیە. تامی نیە.

– باشە. یەکی دیکە هەڵگرە و تاقیکەوە.

کشپەڵێکی دیکەشی هەڵگرت و تامی کرد و گوتی:

– بە خوا سەرم لێ دەر ناچێ، هەر نەمزانی تامی چ دەدا.

– وەرە یەکی دیکەش تاقیکەوە. بەگ یەکی دیکەشی دەزاری ناو جاوتی و گوتی :« ئەوە کشپەڵی مەڕە.!»

کەربەلایی فراش گوتی: « بەڵێ ڕاستە. چاکت ناسی. کاتێ دیتی بەگ توڕەیە و وەختە بتەقێ، لێی زیاد کرد و گوتی :

– توڕە مەبە. من ڕاستیم بە تۆ گوت. لە پێشدا ئاقڵت نە مابوو. دوو جارت تاقیکردەوە نەتزانی. بۆ جاری سێیەم کە جاوتت، ئاقڵت هاتەوە سەر و زانیت کە کشپەڵی مەڕە.!

## چۆن دەکرێ عزرائیل بدۆزیەوە ٣٩

لە گوندێ دا پیاوێکی شەڕانی و خەراب دەژیا. ڕۆژێ هەموو کۆ ببوونەوە و خۆیان بۆ جێژن ئامادە دەکرد، کەربەکایی فەراش زۆر جنێوی بە کابرای خەراب دا.

کابرا هاواری کرد: ئاخ عزرائیل. لە کوێی عزرائیل !

کەربەلایی فەراش پرسی : « زۆرت پێویستی بە عزرائیل هەیە.؟

– بە ڵێ.. یەکجار زۆر.

پاشان کەربەلایی گوتی: « تەماشا کە. ئەو ڕەوەزە بەرزە دەبینی. بچۆ سەر لوتکەی ئەو. لە وێوە خۆت هەڵدێرە. کاتێ چەند گەزت ما بگەیە عەردی، ئەو دەم عزرائیل دێتە لات و چیت لە دڵ دایە پێی بێژە.!

## کەربەلایی فەڕاش و دزەکان  ٤٠

ڕۆژێ کەربەلای فەراش لە سەفەری دوور دەگەڕاوە. کەیشتە کن ماڵەکەی خۆی دیتی دز لە باغی میوەی لێ دەکەنەوە. بە غار چوە سەر تەپکێکی بەرز و هاواری کرد:

– زوو بگەنێ وەرنە ئێرە، کەربەلایی فەراش مردوە و مەیتەکەی لێرە کەوتوە.

ئەوانەی لە باغی بوون، گەورە و بچوک غاریاندا. دەنگی کەربەلایی فەراشیان نە ناسیبوو، کە چوون دیتیان ساخ و سەلیم دانیشتوە. هەموو هێرشیان کردێ و گوتیان: «ئەو درۆیە چبوو، ئەوە نیە زیندووی. گوتت مردووم،

– راستە مردووم. ئەگەر زیندوو بام چۆن ئێوە دەتان وێرا بێنە نێو باغی من و میوە لێبکەنەوە،؟×

× دەبێ ئەم سێ ئەفسانەیە کوردی نەبن. چونکە لە نێو کوردان دا کەربەلایی نیە. و ناوی ئاواش لە کەس نانێن. وەرگێڕ

## یوسوپ ٤١

پیاوێکی بە دەستەڵات لە وڵاتی ڕۆم دەژیا بە ناوی رەشید بەگ. چوارسەت گوندی کورد نشینی هەبوو باج و مالیاتی لێ دەستاندن. حاکمەکانی ڕۆم خۆیان دە رەشید بەگ نەدەگەیاند و باجیان لێ وەر نەدەگرت، رەشید بەگ سەروەت و سامانێکی زۆری وە سەر یەک نابوو. ڕۆژێک رەشید بەگ خەریک بوو شایی بۆ کورە گەورەکەی بکا. لە نێو کوردان داب وایە ئەگەر بۆ سەر شایی داوەت بکرێن، دیاری لە گەڵ خۆ دەبەن. لە هەموو چوار سەد گوندی رەشیدبەگ زیاتر لە چوار هەزار کەس داوەت کرا و دیارییان هێنا،

لە ناو میوانەکاندا لاوێک هەبوو بەناوی « یوسوپ » یوسپیوپلاوێک بوو جوان، چالاک، سوار چاک و نەترس. داب وایە لە نێو کوردان ئە گەر میوانێکی بەرێز لە مالی میواندار نیزیک دەبێتەوە، زاوا لە گەڵ هێندێ سوار بە دەهۆڵ و زورنا دە چێتە پێشوازی و یەک لە میوانان لە گەڵ زاوا جلیت دەکا.

زاوا– واتە کوری رەشید بەگ هاتە مەیدان و بۆ جلیت داوای حەریفی کرد، کەس نەیوێرا جلیتی لە گەڵ بکات.

یوسوپ خۆی پێ ڕانەگیرا و جوە پێش و لە گەڵ کوری رەشید بەگ دەستی پێکرد، دار جلیتی هاویشتێ و وەسەری کوری رەشید بەگ کەوت و کڵاوی سەری کەوتە خوار و نیزیک بوو خۆشی بکەوێ.

کوری رەشید بەگی زۆر خەجاڵەت بۆوە. چونکە ئەگەر کاتی بوک هێنان کڵاوی زاوا بکەوێ، شەرمێکی گەورەیە. زاوا هەڵیکێشا شیر و غاریدا سەر یوسوپ. یوسوپ دەیزانی بە گوێرەی دابی کوردان کەسێک شیر هەڵکێشێ تا خوێن نەرێژی، نایخاتەوە کالان. یوسوپ دەمانچەی دەر هێنا وگوللەیەکی پێوە

نا و زاوا کەوتە خوارێ و یوسوپ بزر بوو. بەگ و پیاوەکانی وەدوای کەوتن، بێفایدە بوو نەیاندیتەوە. یوسوپ نەوێرا بچێتەوە ماڵ و بوو بە جەردە و ڕێگر و بە« یوسوپ ڕێگر» ناوی دەر کرد.

بەڵام ڕەشید بەگ شەو ورۆژ لە فیکری ئەوە دا بوو کە چۆن یوسوپ بە زیندویی بگرێ و ئازاری بدا. ڕەشید بەگ نارەحەت بوو لە کەن خەڵک و بەگی دیکە خەجاڵەتی دەکێشا لەوەی کە یوسوپ لە ماڵی خۆی کوری کوشتوە و بەو هەموو دەستەڵات و سامانەوە ناتوانێ تۆڵەی بکاتەوە.

ڕەشید بەگ گوتی : « هەر کەسێک یوسوپ بکوژێ و یا زیندوویی بیگرێ و بۆم بێنێ، هەموو سامانی خۆمی دەدەمێ و جەمیلەی کچیشمی لێ مارە دەکەم.

زۆر کەس کەوتنە هەوڵ و تەقەلا کە یوسوپ بگرن، فایدەی نەبوو، ڕۆژێکیان کابرایەک شوێنی یوسوپی بە ڕەشید بەگ نیشاندا. ڕەشید بەگ کەیف خۆش بوو، دوو کور وچوار نۆکەری بەکاری هەڵگرت و شەو چوە ئەم ئەشکەوتە کە پێیان نیشان دابوو.

گەیشتنە ئەشکەوت ولە ئەسبان دابەزین، ئەسپەکانیان دە دارێک خست و یەکێکیان بۆ کێشکی ئەسپەکان دانا و شەش کەسیان ئەشکەوتیان گەمارۆ دا.

ڕەشید بەگ گوتی: « هیچکەس نە چێتە نێو ئەشکەوت و تەقەش نەکەن و چاوەڕوانی بەیانی بن. ڕەشید بەگ لای وابوو ئەگەر ئوسوپ لە ئەشکەوت دا بێ، درنگ یا زوو دێتە دەر. بە پیاوەکانی خۆی گوت: لەگەڵ کوو یوسوپ هاتە دەر، بیگرن، ئەگەر بۆتان نەگیرا، بیکوژن،»

یوسوپ شەو لە خەو دا دیتی کە ئەشکەوت گەمارۆ دراوە،، هەستی بە مەترسییەک کرد. بەیانی کە وە خەبەر هات، بڕیاری دا نە چێتە دەر. یەک دوو سەعات دانیشت و ئاخرەکەی گوتی: هەر دەبێ بچمە دەر، چار نیە، دەستی دا تفەنگ و لە ئەشکەوت دەر کەوت. هەر شەشیان گورج پەلاماریاندا و گوتیان :« تەسلیم بە » یوسوپ هە رشەش کەسی دڕ پێدا و خۆی هاویشتە پشت بەردێک و دەستی بە تەقە کرد. پێنج کەسي کوشت. تەنیا ڕەشید بەگ مابوو، ڕایکرد

بۆلای یوسوپ. یوسوپ ئەگەر ویستبای، دەیتوانی ئەویش بکوژێ. بەڵام دەستی بۆ نەچوو. رەشید بەگ پیاوێکی گەلێک وێچوو بوو.

پاش ئەم روو داوە ئیتر رەشید بەگ ئارامی نەبوو. سەر شۆڕ بوو کە حەوت کەس بە یوسوپی نەوەستاون و بە تەنیا پێنج کەسی لێ کوشتوون.، یوسوپ لە سەرانسەری کوردستان ناو بانگی دەر کرد.

دوو سێ ساڵ تێپەڕی. رەشید بەگ وردە وردە هاتەوە سەر خۆ و خەم و خەفەتی لە بیر کرد. رۆژێک قەستی سەفەری عەرەبستانی کرد تا لە داب ونەریتی کوردەکانی وێندەری شارەزابێ. دە سواری لە گەڵ خۆی برد و کەوتە رێ. لە سنوری ترکان تێپەڕین و وە سەر چیایێکی بەرز کەوتن. لە بناری ئەم چیایە چادر و رەشماڵی زۆریان دیتن و زانیان دەبێ هەواری کوردان بن. لە چیا هاتنە خوار و لە چادران نیزیک بوونەوە، سوارێک هاتە پێشوازیان.

رەشید بەگ پرسی :

– ئەو چادرانی هی کێن؟

– بۆ نازانی چادری خالید بەگن. خالید بەگ کە دیتی سوار بۆچادری وی دێن، خۆی چوە پێشوازیان. رەشید بەگ و سوارەکانی دابەزین. نۆکەرانی خالید بەگ ئەسپەکانیان دابین کرد و تفاقیان دانێ و میوانیان بردە چادر و خالید بەگ بەخێر هاتنی کردن. سفرەیان داخست و نانیان هێنا. بەیانی خالید بەگ و رشید بەگ لە دەور و بەری هەواری چوونە گەڕان و گەیشتنە سەر کانیەک، رەشید بەگ دیتی کیژێک ماینێک دێنێتە ئاوێ. ماین بە دەوری کیژەکە دا سەما دەکا. ماینێکە لە هەموو ژیانیدا شتی وا جوانی نەدیوە. لە خالید بەگی پرسی :

– ئەو ماینە هی کێیە؟

– ئەوە ماینی منە و کچەکەم هێناویاتە ئاوێ.

رەشید بەگ گوتی : « تکا دەکەم ئەو ماینە بە من بفرۆشە.»

– بە هیچ قیمەتێک نایفرۆشم. وەرە با بچینە نێو رەوە، هەر ئەسبێکی دڵت گرتی، پێشکێشە،

– نا.. من تەنیا ئەم ماینەم دەوێ. هەرچەندی بخوازی دەتدەمێ. ئەگەر بە گرانایی ماینەکە زێڕیش بخوازی.
– ئەگەر دە ئەوەندەی قورسایی ئەو زێڕم بدەیەی نایفرۆشم.

گەڕانەوە بۆ چادر. جارێکی تر سفرە و نان ئامادە کرا. لای ئێوارە ڕەشید بەگ ماڵاوایی خواست بەرە و ماڵ گەڕایەوە. شەو و ڕۆژ لە فیکری ئەم ماینە دا بوو، خەو و خۆراکی لێ هەڵگیرا بوو، کز و بێ تین ببوو. لێیان دەپرسی:« چتە، بۆ وات لێهاتوە.؟»
– لە عەرەبستان خالید بەگ ماینێکی هەیە تا ئێستا ئادەمیزاد ماینی وا جوانی نە دیوە. دڵم گرتوویەتی، بەڵام خالید بەگ پێم نافرۆشێ. ئە گەر سواری ئەم ماینە نەبم و سەرانسەری کوردستانی پێ نەگەڕێم، دیق دەکەم و دەمرم.

ئێستا با واز لە ڕەشید بەگ بێنین و بزانین یوسوپ چدەکا. یوسوپ خەبەری زانی کە ڕەشید بەگ چۆتە عەرەبستان و چاوی بە ماینی خالید بەگ کەوتوە ودڵی گرتوویەتی و خالید بەگیش بە هیچ قیمەتێک پێی نافرۆشێ. یوسوپ نامەیەکی ئەمجۆرەی بۆ ڕەشید بەگ نووسێ :«.. ئەی ڕەشید بەگ! بیستوومە چوویە عەرەبستان و دڵت ماینی خالید بەگی گرتوە، ئەوەشم زانیوە بە هیچ قیمەتێک پێت نافرۆشێ. ئەگەر بەڵێن دەدەی و ڕابردوو فەرامۆش دەکەی و دەمبەخشی، ماینەکەت بۆ دێنم. بەڵام چۆنی دێنم، دەیدزم، دەینەستێنم، پێوەندی بە خۆمەوە هەیە.»

ڕەشید بەگ نامەی خوێندەوە و کەوت فیکر و بیر کردنەوە. « چۆن دەتوانێ لە یوسوپ خۆش بێ کە سێ کوری ئەوی کوشتوە. داخوا دەتوانی بۆ ماینێک لەو هەموو تاوانە خۆش بێ؟ چ بە خەڵک بڵێ.؟ لە بەرانبەر خەڵکدا شەرمەزار دەبێ. ئەگەر ماینیشی دەست نەکەوێ دیق دەکا.»

ڕەشید بەگ لە وەڵامی نامەی یوسوپ دا نووسی:« ئەی یوسوپ !ئەگەر ماینەکەم بۆ بێنی، لە ڕابردوو خۆش دەبم و جەمیلەی کچی خۆشمت دەدەمێ.»

یوسوپ نامەی خوێندەوە و زۆر کەیف خۆش بوو. چۆوە ماڵ چەکی هەڵگرت و سوار بوو بەرە و عەربستان و هەواری خالید بەگ کەوتە ڕێ. کە لە

وێ نیزیک بۆوە، چوە سەر چیا و تەماشای دەور و بەری کرد دیتی لە نیزیک چادران دەهۆڵ و زورنا و زەماوەندە. سوار خەریکی جلیت و ڕمبازین. بە خۆی گوت: یا شایی و بوکهێنانە، یا شیرینی خواردنە. ئەگەر بە سواری بچمە نێو چادران، ناچار دەبێ لە چادرێک دابەزم، خەلک چەکەکەم دەبینن و لێم وەشک دەکەون. نەخشەکەم تێکدەچێ. تەماشای دەو ر وبەری کرد، ئەشکەوتێکی دیت. ئەسبەکە لەوێ بەستەوە و پیادە بۆ چادران چوو.

دابی کورەان وایە. لە شایی و شیرینی خواردندا، ڕێبوار و گەڕۆک هەر کەس بێ، دەتوانی لە سەر سفرە دانیشێ و کەس ناپرسێ کێیە. یوسوپ چوە کن میوانان و لە سەر سفرە دانیشت تا ئێوارە خواردی و خواردییەوە. شەو بەسەر داهات و دەهۆڵ و زورنا بێدەنگ بوو بڵاوەیان کرد. یوسوپ تەنیا مایەوە. تەماشای کرد لە پەنا ئەو چادرێکی گەورە هەڵدراوە و میوانی زۆری تێدا کۆ بوونەوە. زینی زۆریش لە سەر یەک داندراون. لە پەنا ئەو چادرەش خێوەتێکی ئاوریشم هەڵدرا بوو، لە وانەیە چادری کیژی خالید بەگ بێت. یوسوپ لە پشت زینەکان خۆی مات کرد و شتێکی بە سەر سەری دادا کە بخەوێ.

مانگ هەڵات بوو دەور و بەر دیار بوو. لە پڕ یوسوپ دیتی کە یەکێک بۆ لای چادرەکان دێت. یوسوپ لێی وەنیزیک کەوت و دیتی کابرایەکی عەرەب و باڵا بەرز و ڕەش ئەسمەرە. کابرای عەرەب لە چادری کیژی خالید بەگ وەنیزیک کەوت و چوە نێو چادرەکە.

کێ دەتوانێ بەو شەوە بچێتە چادری کیژی خالید بەگ.؟ تەنیا چوار کەس بۆیان هەیە: دایک و باب و برا و خوشک بەڵام کابرای عەرەب کە چوە ژوورێ، نە دایک و بابە و نە خوشک و برا.( چونکە خالید بەگ کورد بوو) یوسوپ بیری کردەوە گوتی: ئەم ماستە بێ موو نیە. لە چادرەکە پتر نیزیک بۆوە وگوێی دایە.

عەرەب گوتی :« ئەی زدینە، حەوت ساڵە خزمەتی باوکت دەکەم و بەڵێنی دابوو کە تۆم بداتێ. فریوی داوم. تۆ دەدەن بە کەسێکی تر. هەر ئێستا دەبێ لە کەڵم بنووی.

– ئەگەر دەزگیرانم بپرسێ ناموست چی لێهاتوە، چی وەڵام بدەمەوە.؟ بشم کوژی لە گەڵت نانووم.

عەرەب شیری هەڵکێشا و لە سەر سەری زدینەی ڕاگرت. کیژەکە ترسا و دەستی بە پاڕانەوە کرد و گوتی:

– ڕێگام بدە تاوێک بچمە دەر. ئێستا دێمەوە ئەو دەم چدەکەی بکە.

– نا. ڕێگا نادەم بچیە دەرێ. دەزانم هەر دەر کەوی ڕادەگەی و دەست دەگەی بە هاوار. لەو قسانە گەڕێ. ئێستا دەبێ لە گەڵم بنوی.

کیژە کە دەستی بۆ دوعا هەڵێنا و گوتی :« ئەی خوای گەورە، قاچاخ یوسووپ بنێرە بە هاوارمەوە بێ و ناموسم نەجات بدا.»

یوسوپ بە خۆی گوت:« سەیرە! تەنانەت لێرەش من دەناسن، گورج لە پەناگا هاتە دەر و هەڵیکێشا شیر ولە چادر چوە ژوور و سەری عەرەبی پەڕاند.

زدینە ترسا و گوتی: تۆ کێی. ئادەمیزادی یاپێغەمەری ؟

– من پێغەمبەر نیم. خوای گەورە دوعای تۆی قبوڵ کرد و منی بۆ یارمەتی تۆ نارد. من ئەم یوسوپەم کە داوات کردبوو بۆ یارمەتیت. بە هەر دووکیان کەلاکی عەرەبیان لە خێوەتێ بردە دەر و دە چاڵاوێکیان هاویشت.

زدینە گوتی :« ئەی یوسوپ تکا دەکەم دانیشە خواردنت بۆ بێنم.

– من لە ماڵی ئێوە ناتوانم هیچ بخۆم. چونکە ئەگەر نان و نمەکی کەسێک بکەی، ئیتر ناتوانی هیچی لە ماڵێ هەڵگری و ببەی.

زدینە پرسی: « مەگەر خەیاڵی چیت هەیە.؟»

– ئەمشۆ دەمەوێ ماینی ئێوە بفڕێنم. بۆیە لەم ماڵە نابێ هیچ بخۆم.

زدێنە گوتی :« تۆ ژیان و ناموسی منت نەجات دا، هەر لێرە بە، هەر ئێستا ماینەکەت بۆ دێنم و زینی دەکەم و سوار بە و برۆ.

زدینە ماینی هێنا و زین و لغاوی کرد وبانگی نوسیبی کرد:

– ئەی یوسوپ وەرە ماینەکە وەر گرە، تەنیا بڵێ بە کام ڕێگادا دەڕۆی.؟

یوسوپ ڕێگای بە کیژەکە نیشان دا. زدێنە گوتی:« تکا دەکەم جڵەوی ماینەکە شل مەکە. کەمێک جڵەوی شل بکەی هەڵت دەگرێ و لە عەرزت دەدا.

دوو لای ئەم جـادەیە زەلکاوە. تۆ لە زەلکاو دا گـیـر دەکـەی، هاتنەوە دەرت دژوارە. برۆ بە هومێدی خوا.

زدینە گـەڕاوە بـۆچادر و یوسـوپ سـواری مـاین بـوو کـەوتە ڕێ. کـەمـێک ڕۆیشت بوو، قسەکانی کیژەکەی لە بیر بردەوە و جڵەوی ماینی شل کرد و ماین هەڵیگرت، بە عـەرزی دادا. یوسـوپ لە زەلکاو دا گیر بوو نەیتوانی بێتـەوە دەر. مـاین گـەڕاوە بۆ چادر و جێگای خۆی. زدینە دیتی مـاین بێ سـوار گـەڕایەوە. زانی یوسـوپ دە زەلـکاو کـەوتوە. گـورج سـواری مـاین بـوو، ڕۆی تا یوسـوپ بدۆزێتـەوە. هێندێ ڕۆی، دیتی بە ڕاسـتی لە زەلکاو دا مـاوەتەوە و ناتوانێ بێتەوە دەر. لە مـاین دابەزی، جڵەوی لە دارێکی بەست و چوە پەنا زەلکاوەکە و گوتی :

– یوسـوپ، ئاخر پێم نە گوتبووی جڵەوی مـاینەکە شل مـەکە. ئەگینا دە زەلکاو دەکەوی. بە گوتی منت نە کرد و توشی ئەم ڕۆژە بووی.

– ئەی زدینە، ئـەوەی تۆ بە منت گـوت، هـەر لەوێ لە پەنا چادر بـە جێـما. ئێستا وەرە نەجاتم دە، تا زووتر لەم زەلکاوە بێمە دەر.

زدینە دەسـتی درێژ کـرد و کـەم کـەم ئوسـیبـی بۆ لای خـۆ کێـشـا. بەڵام توانای ژن چەندە ، ئـەویش دە زەلـکاو کـەوت و لـە کن یـوسـوپ مـایەوە. با یوسووپ و زدینە لە زەلکاو دا بن، تا بزانین لە ماڵی خالید بەگ چباسە.

دایکی زدینە بـەیانی لە خـەو هـەستا و دیتی زدینە دیار نیـە. بە غار چوە تەویلە و دیتی مـاینەکـەش نەماوە. مێردەکەی بانگ کرد و گوتی : « ئەی خالید بەگ تۆ لە خەو دای و زدینەی کچتیان ڕفاندوە. ماینەکەشیان بردوە.

خـالید لە جێ هەسـتا و هـەموو نۆکـەرەکـانی دەنگدا و فـەرمـانی دا کـە دەست بەجێ هـەمـوو چیا و کـەژ و دۆڵ و جـادەکـان بگەڕێن و زدینە و مـاینەکە بدۆزنەوە و بیهێننەوە.

نۆکـەر سـوار بـوون و وەدوای زدێنە کـەوتن. کـەمـێک لە چادر دوور کەوتبوونەوە دیتیان ماینەکە لە دارێک بەستراوەتەوە. زدینەش لە پەنا لاوێک دە زەلکاو دا کەوتوە. هەر تکیان لە زەلکاو هێنا دەر و بردیاننەوە. خەڵک بیستیان

که ڕاکردوەکانیان کرتوونەوە. هەموو لە مەیدان کۆ بوونەوە.

خالید بەگ فەرمانی دا کە دەست بەجێ لە سەریان بدەن.

زدینە گوتی : « بابە لە پێشدا ڕێگا بدە دوو قسان بکەم و پاشان چدەکەی بیکە، خۆت خاوەن دەسەلاتی.

خالید بەگ گوتی ؛ بلێ بزانم .

زدینە هەر چی بە سەری هاتبوو گێڕایەوە. کاتێ زدینە وتەکانی تەواو کرد، خالید بەگ ڕووی کردە یوسوپ و گوتی :

- باشە، دەتوانین چبکەین. ئێستا کە تۆ ژیان و ناموسی کیژی منت نەجات داوە، هەر چی بلێی، بەلێن دەدەم بەجێی بگەیێنم. یوسوپ لە وەلام دا گوتی:« تەنیا یەک شتم دەوێ. ماینەکەت بدە بە من و هیچیتر.

خالید بەگ کە ئەوەی بیست، ڕەنگی زەرد هەلگەڕا. لە لایەکی دیکەش لە پێش خەلک بەلێنی دابوو، نە دەکرا پەشیوان بێتەوە،

ئەمری کرد ماینەکە بۆ یوسوپ بێنن. ئەویش سواری ماینی جوان بوو بەرەو ولاتی ڕۆم کەوتە ڕێ. چوە کن ڕەشید بەک و ماینەکە ی تەسلیم کرد. ڕەشید بەکیش بەلێنی خۆی بردە سەر و لە یوسوب خۆش بوو، جەمیلەی کیژی خۆی لێ مارە کرد.

# ئەفسانەگەلی سیحر و جادوو.

## ئەحمەد خان و عەلی وەلی ٤٢

دوو برا بوون،یەکیان پاشا بوو، ئەویتریان وەزیر. هیچ منداڵیان نەبوو. ڕۆژێک پاشا تەماشای ئاوێنەی کرد دیتی پیر بوە و ریشی چەرموک بوە و هێشتا منداڵی نیە. قورئانی هەڵگرت و دەستی کرد بە پاڕانەوە و گریان و گوتی :« پیر بووم و منداڵم نیە » خوای گەورە دوعاکەی بیست . عەلی وەلی خۆی هێنا سەر شکڵی دەروێش و هاتە پەنا کۆشکی پاشا و دەستی بە دوعا کرد.

پاشا سەری هەڵنەهێنا و تەماشاشی نەکرد.

وەلی لێی پرسی:« بۆ سەیرم ناکەی »؟

پاشا گوتی : « بۆ سەیرت ناکەم؟. نابینی وا لە خەم و خەفەت دام. بڕۆ لەو ماڵەی کە ژنەکەمی تێدا دەژی، چ بخوازی دەتدەمێ.»

وەلی گوتی: من هیچم ناوێ. تەنیا دەمەوێ بزانم تۆ بۆ دەگری،

– تۆ چیت لە گریانی من داوە؟

– تا هۆی گریانی خۆتم پێ نە ئێژی، لێرە ناڕۆم.»

– باشە، پێت دەڵێم. دەزانی کە من پیر بووم، بەڵام هێشتا منداڵێکم نیە.

وەلی سێوێکی دایە و گوتی:

– ئەم سێوە دوو لەت بکە، نیوێکی بخۆ و نیوێکیش بدە بە خێزانت. دڵنیا بە منداڵێکی دەبێ.

پاشا سێوەکەی لێ وەر گرت و گوتی :« براکەشم منداڵی نیە »

وەلی سێوێکی دیکەشی دایە و ڕۆیشت. پاشا سێوەکەی تری دا بە براکەی و گوتی:« ئەم سێوە دوو لەت کەو لە گەڵ خێزانت بیخۆن.»

ڕۆژێکیان پاشاو وەزیر لە ڕاوێ بوون. وەزیر گوتی:« لام وایە بەم زوانە ژنەکەم منداڵی دەبێ.»

پاشا گوتی :« منیش وا گومان دەکەم کە ژنەکەم بەم زوانە منداڵی ببێ.»

هەر لەوێ قەراریان دانا ئەگەر یەکیان کوڕ بێ و یەک کچ. لێکیان مارە کەن. هێندەی پێنەچو ژنی پاشا کچی بوو، ژنی وەزیریش کوڕ. پاش ماوەیەک وەزیر مرد و کوڕەکەی هەتیو بوو. ژنەکەی مناڵەکەی گەورە کرد . کاتێک بوو بە لاوێکی وێچوو، پێیان گوت:

- تۆ و کیژی پاشا دەزگیرانی یەکترن .

ناردییە خوازبێنی و داوای کرد کە کیژەکەی لێ مارەکات. پاشا لە وەڵامدا گوتی :« زێڕ بێنە تا کیژەکەمت بدەمێ.»

لاو چبکا.؟ زێڕ لە کوێ بێنێ.؟ تەنانەت سکەیەکی زێڕیشی نەبوو، سەر گەردان و بێ بەرنامە دەستی کرد بە گەڕان بە دەوری دنیادا. تەماشای کرد دووکەڵێکی کەم لە دوورەوە دیارە. ڕووی دەوێ کرد، دیتی ئەشکەوتێکە و پڕە لە شتی خواردن. دانیشت تا تێر بوو خواردی. تەماشای ئەملاو لای کرد، دیتی لە قوژبنێک زێڕ ڕژاوە. کیسەی پڕ کرد لە زێڕ و بە کۆڵی دادا و هات وەدەر کەوێ، لە پڕ خاوەن ئەشکەوت بە سواری پەیدا بوو.

- تۆ.. تۆ چۆن وێراوتە بێیە ماڵی من؟ وەرە شەڕ بکەین و هەرکام شکا، سەری ببڕدرێ.

شەر دەستی پێکرد و کوڕی وەزیر کەوت، سوار شیری هەڵیکێشا کە سەری ببڕێ. کوڕی وەزیر هەناسەیەکی خەفەتاوی هەڵکێشا .

خاوەن ئەشکەوت گوتی :« ئەم هەناسەیە چبوو. بۆ تۆ پیاو نی.؟

- هەناسەم بۆیە هەڵنەکێشا لە مردن بترسێم. دەزگیرانێکم هەیە کە هێشتا نەمتوانیوە بیگوێزمەوە. هەناسەکەم بۆ ئەوەیە.

خاوەن ئەشکەوت بەزەیی پێدا هات و پێی گوت:« وەرە پەیمانی برایەتی ببەستین. منیش دەزگیرانێکم هەیە. لە پێشدا دەچین ئەوی دێنین و دوایە وەدوای دەزگیرانی تۆ دەکەوین.»

پەیمانی برایەتیان بەست. چوونەوە نێو ئەشکەوت و دانیشتن، نانیان خوارد. خاوەن ئەشکەوت کە ناوی ئەحمەد بوو، گوتی :

– جارێ تۆ لێرە بە، من دوو ئەسپ و دوو شیرم هەنە. ئەسپێکی هەر لێرە دە ئەشکەوت دا دەبەستمەوە، شیرێکیش لێرە هەڵداوەسم. کاتێکی بینیت خوێن لە نوکی شیرەکە دێتە خوار، بزانە توشی بەڵایەکی بووم. ئەوە دەم دەست بدە شیر و سواری ئەسب بە وبە هاوارمەوە وەرە.

کوڕی وەزیر لە ئەشکەوت دا بە جێما و ئەحمەد وەدوای دەزگیرانی کەوت. ڕۆژێک کوڕی وەزیر دیتی خوێن لە تیغی شیرەکە دێتە خوار. گورج شیری دەست دایە و سوار بوو ڕۆیشت، دیتی شایی و زەماوەندە. کوڕی وەزیر چوە مەجلیسی شایی و دەستی کرد بە تار لێدان. کاتێ میوان بڵاوەیان کرد، کوڕی وەزیر چوە کن بوکێ و لێی پرسی :« نازانی ئەحمەد خان لە کوێیە.؟»

کیژەکە پرسی: ئەو دەستە برای تۆیە؟

کوڕی وەزیر گوتی : « بەڵێ دەستە برامە»

کیژەکە کە هەمان دەزگیرانی ئەحمەد خان بوو، قوتوێکی بچوکی پڕ لە تۆزی خەو هێنەر دا بە کوڕی وەزیر و گوتی:

– دەستە برای تۆیان لە چاڵاوی ڕەش بەند کردوە. چل کەس کێشکی لێ دەکێشن. تۆ بچۆ کن ئەوان تاریان بۆ لێدە. پاشان بێژە داب وایە کە میوان شەراب بۆ میوانداراني تێبکا. ئەوان ڕازی دەبن. چل جامت دەدەنێ شەرابیان بۆ تێبکەی. بۆ خۆشت تێکە. لەم تۆزەش بۆ هەموان نەختێک دە شەرابەکەی بکە و هەموویان بێهۆش دەبن.. سەری هەموان ببڕە. کلیلێک لە گیرفانی سەر کێشکچی دایە، ئەو کلیلە بدە بە ئەحمەد تا زنجیری لاقی بکاتەوە، هەر بەم شەوە دەبێ ڕابکەین.

کوڕی وەزیر چوە کن کێشکچیان و گوتی چاوەشم. هەموو پێیان خۆشبوو، گوتیان بە خێر هاتی فەرموو. کە دانیشت دەستی کرد بە گۆرانی و تار لێدان. هەوا تاریک بوو، دانیشتن کە نان بخۆن. کوڕی وەزیر گوتی:

– دابی ئێمە وایە کە میوان دەبێ شەراب تێکا.

– هیچ عەیبی نیە. چل پیاڵەیان لە سەر کەشەف دانا وکوڕی وەزیر تۆزی دەهەموان کرد. دەست کرا بە خواردنەوە. هەموویان بێهۆش بوون. کوڕی وەزیر سەری هەموانی بڕی و کلیلی لە گیرفانی سەر کێشکچی هێنا دەر و دای بە ئەحمەد خان. ئەویش زنجیری پای کردە وە ولە زیندان هاتنە دەر و چوونە کن کیژەکە. سوار بوون و کەوتنە ڕێ.

ڕۆیشتن تا بوو بە ڕۆژ. لە پڕ کچەکە تەماشای کرد بە لایەک دا ڕۆیشتوون کە وا تەپ و تۆزێکی زۆر دیارە ولەشکر وە دوایان کەوتوە. کیژەکە نەیویست خۆشەویستەکەی وەخەبەر بێنێ، دەستی کرد بە گریان و فرمێسکی کەوتە سەر ڕوی ئەحمەد خان و وەخەبەر هات. پرسی : بۆ دەگری.

– لەشکری باوکم بۆ ئەولایە دێت. ئەحمەد خان هەستا، کوڕی وەزیری وە خەبەر هێنا و بیریان لێکردەوە کە چبکەن.

ئەحمەد خان گوتی: « ئێمە سێ کەسین و ئەوان زۆر. وەرن با شەڕ بکەین و تا بتوانین لێیان بکوژین.»

کیژەکە گوتی : « من بە شیر لە شانیان دەدەم و ڕاست وچەپ لێیان دەوەشێنم»

ئەحمەد خان گوتی – «من لە سەریان دەدەم و لە گەڵ ئەسب دوو لەتیان دەکەم»

کوڕی وەزیر گوتی: « من لە پشتەوە دوو لەتیان دەکەم.

لەشکر وەنیزیک کەو ت و شەڕ دەستپێکرا. زۆری پێنەچوو کە هێندێ ڕایان کرد و هێندێ کوژران. کوڕی وەزیر و کیژەکە دیتیان ئەحمەد خان دیار نیە. هەر ئەوان ماون. بە نێو کوژراواندا گەڕان، مەیتی ئەحمەد خانیان دیتەوە. زانیان کیژەکە بە هەڵە خۆی کوشتوویەتی. لەو نیزیکانە کانیەک بوو، مەیتی ئەحمەد خانیان شوشت و بۆی گریان بە خاکیان ئەسپارد.

کوڕی وەزیر گوتی : « چار چیە. با بڕۆین. هێندێ وە دوور کەوتن، کیژەکە گوتی:« تۆ کەمێک بوێستە. من دچمە سەر گۆڕی ئەحمەد خان، ڕێزی لێدەگرم و ئێستا دێمەوە..»

:- منیش لە گەڵت دێم.
- نا، تۆ هەر لێرە بوێستە.
کوڕی وەزیر دانیشت و چاوەڕوان بوو. بەڵام کیژەکە چوە سەر گۆڕی ئەحمەد خان و شیری هەڵکێشا و بە سینگی خۆیەوە نا و خۆی بە سەر دادا. کوڕی وەزیر دیتی، کچەکە لە سەر گۆڕی ئەحمەد خان کەوتوە و ڕاست نابێتەوە.
- بچم بزانم بۆ هەڵناستێتەوە. هاتە کن گۆڕەکە و دیتی کیژەکە خۆی کوشتوە.
بە پەڕۆیەک چاوی خۆی بەست و مەیتەکەی شوشت و لە پەنا ئەحمەد خان بە خاکی ئەسپارد و خۆی کەوتە ڕێ و بۆ ئەشکەوت گەڕایەوە و لە وێ دانیشت. شەو و ڕۆژ بۆ دەستە برای دەگریا، ماوەیەکی درێژ کاری هەر تازیە و گریان بوو. وای لێهات ریشی درێژ ببوو.
ئێستا بگەڕێینەوە بۆ چیرۆکی عەلی وەلی.
ڕۆژێک چاوی دێشا. یەکێکی ناردە شار و گوتی : « ئەگەر کابرایەکی ریش درێژت بینی، بیهێنە کن من تا حکایەتێکم بۆ بگێڕێتەوە و ئارام بگرم. قاسید چوە شار و کوڕی وەزیری دیتەوە و گوتی :« لە گەڵ من وەرە، عەلی وەلی داوای کردووی.»
کوڕی وەزیر لە گەڵ کابرا چوە کن عەلی وەلی. پێی گوت:
- چاوەکانم زۆر دێشن، شتێکی بڵێ ژانیان بشکێ.
- ئاخر من تەمەنێکی وام نیە، هیچ نازانم و سەر گوزشتێکم نیە.
- داخوا دەبێ بەڵایەکت بەسەر نەهاتبێ و کارەساتێک ڕووی نەدابێت؟
- دیارە کە بەڵایەکم بەسەر هاتوە هەر باسی ناکرێ. ئێستا بۆت دەگێڕمەوە.
کوڕی وەزیری تەواوی سەر بردەکەی بۆ عەلی وەلی گێڕاوە.
وەلی گوتی :« تۆ بەڕاستی لە سێوی سیحراوی پەیدا بووی؟ باشە. ئێستا من بەرە سەر گۆڕی ئەحمەد خان و کیژەکە.

گەیشتنە سەر گۆڕیان. عەلی وەلی لە نێوان دوو گۆڕەکە دانیشت و دەستی بە دوعا خوێندن کرد. لە نەکاو گۆڕەکان کرانەوە و ئەحمەد خان وکیژە کە هاتنە دەر و ڕاست بوونەوە. گوتیان ئێمە خەوتبووین، بۆچی خەبەر و کردینەوە؟

کوڕی وەزیر گوتی :« خەوی چی.؟ ئێوە مردبوون، من چەند ساڵە لە تازیەی ئێوەدا دەگریم. پیر بووم و ریشم وا درێژ بوە.

عەلی وەلی جارێکی تر دوعای کرد و کوڕی وەزیر گەنج بۆوە. هەموو سواری ئەسپان بوون و چوونەماڵی کوڕی وەزیر و عەلی وەلیش چۆوە ماڵی خۆی.

بەڵێ ئەم سێ کەسە هاتنە کن پاشا. کوڕی وەزیر بە پاشای گوت: « ئێستا کیژەکەی لە من مارە کە.»

پاشا بەزمی بوکی ساز کرد و حەوت شەو ورۆژ شایی و زەماوەند کرا. ئەوان بە ئاواتی خۆ گەیشتن و ئیشەلله ئێوەش پێدەگەن.

# بالولی زانا و خەلیفەی بەغدا ٤٣

خـــەلیـــفـــەی بەغـــدا و بالـولي زانـا دوو بـرا بوون. ڕۆژێک بالـولی زانـا منداڵەکـانی شـاری هەڵگرت و چوە قـەراخ دەریا و لـە وێ خـانوێکیـان بۆ خـۆ دروست کـرد. خـەلیـفـەی بـەغـدا دوو ژنـی هـەبوون ولە گـەڵ ژنەکـانی بۆ گـەڕان چوونـە قـەراخ دەریا و دیتـیـان بالول لـەوێیـە. سـڵاویان لێکرد و بالـول وەڵامی دانەوە و گوتی:

عەلێکە سـەلام، بوکـە خۆشـیـەویسـتـەکـان، بە خـێر هـاتن، سـەفـاتان هێنا، فەرموون.

ژنە گەورەکەی خەلیفە پرسي:

– ئەم خانوە بە من نافرۆشی ؟

– لە جیاتیان چیم دەدەی ؟

– نانی شیرینی خۆشت بۆ دروست دەکەم.

– باشە. ڕازیم. بالول سێ جار گوتی :« ڕازیم»

ژنی کچکە ی خەلیفە پێدەکەنی. هەر تکیان گەڕانەوە بۆ مـاڵ. ژنی کچکە خـەوی لێکەوت. لە خـەویدا ژنی گـەورەی خـەلیـفـە لە بەهەشت دا لە کۆشـکێکی سـپی وەک بەفـر دانیـشـتـوە. وەخـە بەر هات، دیتـی خـەونە. سێ جـار خـەوی لێکەوت و هەمـوو جارێ ئەم خـەونەی دەبینی. بەیانی کە هەسـتـا یەکسـەر چوە کن بالول وگوتی:

– ئەم خانوە بە من بفرۆشە.

– ها. ئێستا وەبیرت هاتۆتەوە.؟ ئیتر نایفرۆشم.

– سەت سکە ئاڵتونت دەدەمێ، پێم بفرۆشە.

- نا. نایفرۆشم.
- هەموو زێڕ و جواهێراتی خۆمت دەدەمێ، پێم بفرۆشە
- بە خودایەتی خودا، نایفرۆشم.
- ئێستا کە وایە، شتی وا لە سەر تۆ بە خەلیفە دەڵێم کە بتکوژێ.
- برۆ، بێژە پێی با بمکوژێ.

ژنی گچکە لیباسی خۆی دڕاند و بە غار چوە کن خەلیفە و گوتی: خاکت وەسەر. بزانە برای شێتت چی لێکردووم. هەموو جلەکانی دڕاندووم و بە زەحمەت لە چنگانی نەجاتیم بوە.

خەلیفە دەستی دا شیر و بانگی کرد: کوا بالول لە کوێیە، ئێستا دەیکوژم.

لەم بێنە وبەرەیە دا،بالول مەنجەڵێک و هێندێ جاو( بۆ کفن) و پێمەڕەیەک و بێلێکی هەڵگرت و چوە قەبرستان و گۆڕێکی هەڵکەند و لە پەنای ڕاوەستا. خەلیفە شوێنی هەڵگرت و هاتە وێندەرێ و بانگی کرد:

- ئێستا لە سەرت دەدەم.

بالول گوتی : من کفنم ئامادە کردوە و ئاوم گەرم کردوە و گۆڕم هەڵکەندوە و ئامادەم کە بمکوژی.

خەلیفە لێی چوە پێش. بالول گوتی :« من و تۆ براین و لە دایک و بابێکین. دەستت بدە بەمن و قاچت لە سەر لاقی من داینێ و یەکتر ماچ کەین و دوایە بمکوژە.»

لە گەڵکو خەلیفە قاچی خستە سەر لاقی بالول و دەستی دایە دەست، بالول سورێکی خوارد وخەلیفەی ڕێگای هەزار سال دوور هەڵداشت. خەلیفە وەهۆش هاتەوە، تەماشای کرد تا بزانێ لە کوێ کەوتوە، لە کام وڵاتە.؟ هەستا و کەوتە ڕێ. گەیشتە گوندێک و پرسی: دەزانن بەغدا لە کوێیە ؟

- ئەم ناوەمان نە بیستوە، ئینسانە یا جانەوەرە.؟
- شارە. ڕۆژە ڕێیەک دوور لێرە، کابرایەک دەژی کە سەت ساڵی تەمەنە، ڕەنکە ئەو بزانێ بەغدا لە کوێیە.

خەلیفە کەوتە ڕێ. ڕۆژێکی تەواو ڕۆیشت، کۆشکێکی دیت. چوە کۆشک و دیتی پیرە مێردێکی ڕزیو، ریش سپی دانیشتوە. سڵاوی کرد و گوتی: میوان ڕادەگری؟

پیرە مێرد گوتی : « میوان ئازیزی خودایە. پاشان ژنە پیرەکەی بانگ کرد و گوتی: فەرشێکی بۆ میوان ڕاخە با دانیشێ. ژن تەبزوت، پیرە مێرد دوو سێ جار دوو پاتی کردەوە، بەڵام ژن نە بزووت. پیرە مێرد هەستا،لبادێکی بۆ ڕاخست و بە خەلیفەی گوت: فەرموو دانیشە. خەلیفە دانیشت، خاوەن ماڵ دارێکی دەست دایە و پیرێژنی باش کوتا. پاشان خەلیفەی بانگ کردە سەر سفرە کە نان بخوا. خەلیفە گوتی :« تا پێم نەڵێی بەغدا لە کوێیە. نان ناخۆم.»

– من لە کوێ دەزانم.؟ هەوەڵین جارە ئەم ناوە دەبیسم. سەت ساڵ ژیاوم، ناوی وام نەبیستوە، ڕۆژە ڕێیەک لێرە وە دوور، برام دەژی. تەمەنی دوو سەت ساڵە، ڕەنگە ئەو بزانێ.

ڕۆژی دوایە خەلیفە ناوی خوای هێنا و کەوتە ڕێ تا گەیشتە ماڵی کابرا. لە بەر دەرگا وێستا بوو. خەلیفە چوە ژوور و خاوەن ماڵ بانگی ژنەکەی کرد و گوتی :« ژن! فەرش بێنە میوان دابنیشێ. پیرێژن بە نەقە نەق هەستا ولباد و باڵنجێکی هێنا و میوان دانیشت. پاشان نانیان هێنا. خەلیفە گوتی: تا ڕێگای بەغدام پێ نیشان نەدەی، دەست لە خواردن نادەم.»

خاوەن ماڵ گوتی:« ڕێی بەغدا لە کوێ دەزانم. هەوڵجارە ئەم ناوە دبیسم. بەڵام ڕۆژە ڕێیەک لێرە وە دوور، برایەکم دەژی کە سێسەت ساڵی تەمەنە. لە وانەیە ئەو بزانێ بەغدا لە کوێیە.

خەلیفە ماڵاوایی لێ خواستن و کەوتە ڕێ. ڕۆژێک ڕۆیشت گەیشتە ماڵی برای سێیەم. خاوەن ماڵ لە بەر دەرگا وێستا بوو.

– میوان ڕادەگری؟

– میوان خۆشەویستی خودایە. فەرموو دانیشە. خەلیفە چوە ژوور. ژنی خانە خوێ هەستا، لبادێکی ڕاخست، باڵنجی هێنا، پاشان تەشتێکی ئاو هێنا، قاچی خەلیفەی شوشت و وشکی کردەوە. ئەوەش بڵێم کە ژنی خاوەن ماڵەکە

سگیشی پڕ بوو. خاوەن ماڵ بانگی خەلیفەی کرد بۆ خواردن. خەلیفە گوتی:

– تا نەڵێی بەغدا لە کام لایە، نان ناخۆم.

– سێسەت ساڵە لێرە دەژیم. نازانم بەغدا لە کوێیە. بەڵام بیستوومە لە پەنا زیارەتگای ئێمە دارێک هەیە، باڵندەیەک دێتە سەر ئەو دارە، ڕۆژەکانی هەینی خەڵک لە وێ کۆ دەبنەوە و مەڕ سەر دەبڕن و خێرات دەکەن. باڵدار دوعا دەکا و خەڵک بڵاوەی دەکەن. باڵندەکەش دەفڕێ و دەڕوا. دەڵێن ڕێگای بەغدا بەو لایە دایە کە باڵندەکە بە لایدا دەفڕێ. ئەوەی دەمزانی پێتم گوت. ئێستا نان بخۆ. نانیان خوارد و خاوەن ماڵ بە ژنەکەی گوت:

– بچو لە ژێر زەمین شوتی بێنە تا میوانمان تاقیکاتەوە. پێویستە بگوترێ کە ئەم ژن و پیاوە تەنیا یەک شوتیان هەبوو. ژنەکە شوتی هێنا. کابرا ڕێکی کوشی، گوتی: ئەوە باش نیە، بچو یەکیتر بێنە.

ژن چۆوە ژێر زەمین و هەر هەمان شوتی هێناوە. کابرا ڕێکی کوشی، گوتی کاڵە، بچوو یەکی تر بێنە.

ژن چۆوە ژێر زەمین و هەمان شوتی هێناوە. خەلیفە ڕووی کردە خاوەن ماڵ و گوتی: بەسە لێی گەڕێ، سگی پڕە. چل پلیکان چوونە سەر و هاتنە خوار کاڵتە نیە. بێنە لەتی کە، باش یا خەراب دەیخۆین.

شوتیان لەت کرد و خواردیان. خەلیفە لە خاوەن ماڵی پرسی:

چەند ساڵی؟

– سێسەت ساڵ.

– ئەدی بۆ چی براکەت کە سەت ساڵە لە تۆ پیر ترە.؟ تۆ لەو باشتر ماوی.

خاوەن ماڵ لە وەڵامدا گوتی:« هۆی ئەم جیاوازییە ژنە. ژنی ئەو کەر سیفەتە، دەبێ وەک کەر بیکوتی تا کارێکی دەکا، بۆیە مێردەکەی پیر بوە،

– ئەدی برایەکەی دیکەت کە دوو سەت ساڵە، لە تۆ پیرتر دیار دەکا؟

– چونکە ژنەکەی سەگ سیفەتە. کە میوان یا دراوسێ چوە مالیان، وەک سەگ مڕە مڕ دەکا و دەناڵێنێ، بە وتەیەک کار ناکا. بەڵام ژنی منت بینی؟

بینیت چەند جار لە پلیکانەکان چوە ژێر زەمین و هاتەوە سەر. ئێمە تەنیا شوتییەکمان هەبوو، بینیت چەند جار چوو دیسان هەر ئەو شوتییەی هێناوە و رووی گرژ نەکرد.؟

چوونە سەر جێ و خەوتن. بەیانی هەستان و نانیان خوارد. خاوەن ماڵ خەلیفەی هەڵگرت و چوونە زیارەتگا. باڵندەکە هات و لە سەر دارەکە نیشت و دەستی کرد بە دوعا خوێندن. خەڵک کۆبوونەوە، مەڕیان کوشتەوە، چێشتیان لێنا و دایان بە هەموان. پاشان خەڵک بڵاوەیان کرد و خەلیفە بە یەواشی چوە سەر دار و لاقی باڵندەکەی گرت. باڵندە فڕی. خەلیفە زۆر ترسا و لە دڵدا گوتی:« ئەگەر لاقی بەردەم دەکەوم و هەلا هەلا دەبم» لاقی باڵندەکەی توندتر گرت، باڵندە فڕی وئاخرەکەی لەو گۆڕستانەی دانا کە بالول لە پەنا قەبرەکە وێستا بوو. خەلیفە چاوی هەڵێنا و دەتگوت بۆ هیچ کوێ نە چوە. دیتی بالول لە پەنا ئاگر وێستاوە و مەنجەڵێکی پڕ لە ئاوی لە سەر ئاگر داناوە و گۆڕێک هەڵکەنراوە. بالول گوتی :

- باشە خەلیفە ئێستا ئەگەر باوەڕ بە قسەی ژنەکەت دەکەی. مەحتەل مەبە و بمکوژە.

خەلیفە دەستی بالولی گرت و بردیە کۆشک و ئەمری کرد تا ژنە گچکەکەی بێنن. دوو حوشتریش ئامادە بکەن لاقێکی ژنەکەیان لە حوشترێک بەست و لاقەکەی دیکەشیان لە حوشترێکی دیکە. حوشتریان دەنگ دان و ژنەکە دوو لەتبوو. خستیانە نێو ئەم گۆڕە کە بالول هەڵیکەند بوو. بەمجۆرە خەلیفە لە دەست ژنی حیلە بازی خۆی نەجاتی بوو.

## حەسەن حەکیم ٤٤

پاشایەک بوو کوڕێکی هەبوو. حەوت ساڵە بوو کوڕی پاشا زۆر نەخۆش بوو. تەواوی دوکتۆریان هێنانە سەر، نەیانتوانی دەرمانی بکەن. ڕۆژێکیان پاشا بیستی کە حەسەن حەکیمێک هەیە و هەموو نەخۆشیەک چار دەکا . لەم و لەوی دەپرسی کە داخوا کەس ئەم حەسەن حەکیمە دەناسێ و دەزانێ لە کوێیە.؟ بەلام کەس لە بارەی ئەو هیچی نەبیستبوو. پاشا کە وای دیت، دوو کەسی لە نیزیکانی خۆی ئامادە کرد و گوتی: کەل و پەلی سەفەر ئامادە بکەن و وەداوی حەسەن حەکیم کەون، بیدۆزنەوە. پاشا ئەسپی وێرغە و خورجێنی پڕ لە ئاڵتونی دانێ و گوتی: بێ حەسەن حەکیم نەیەنەوە.

پیاوەکان کەوتنە ڕێ، ماوەیەکی زۆر ڕۆیشتن، لە هەر کەسێکیان دەپرسی، کەس ناوی حەسەن حەکیمی نەبیستبوو. چەند مانگ لەڕێدا بوو. ڕیشیان درێژ ببوو، ئاخرەکەی گەیشتنە شاری جزیرێ.

یەکیان گوتی :« با ریشمان بتاشین. چوونە حەمام و خۆیان شوشت و چوونە کن سەر تاش. سەر تاش دیتی بێگانەن. پرسی لە کوێوە دێن و دەچنە کوێ و کاریان چیە.؟ پیاوەکان حکایەتی خۆیان بۆ گێڕایەوە.

سەر تاش گوتی: لە وانەیە بتوانم یارمەتیتان بدەم. ئەمشەو جارێکی دیکەش وەرنەوە ئێرە.

کاتێکی پیاوەکان شەو چوونە کن سەرتاش، دیتیان ناوبراو چاوەڕوانیانە. گوتی : « لە گەڵ من وەرن.»

ماوەیەک ڕۆیشتن. سەر تاش ئەوانی بردە قەبرستانێک و نیزیک بۆوە و دەستی لێکدان و گوتی :

– یا شێخ عەدی ×

کاتێ ئەوەی گوت دەست بەجێ دەرگای قەبرستان کرایەوە، سەرتاش و پیاوەکان چوونە ژوور و چوونە وەتاغێکی ڕازاوە.

پیاوێکی لیباس ڕەش لە نێوە ڕاست وەتاغەکە لە سەر سەکۆیەکی بەرز دانیشتبوو. سەرتاش کڵاوی لە سەر خۆی هێنا خوار و لە بەرانبەر ئەو ئەژنۆی دادا. پیاوەکانیش هەر وایانکرد. سەرتاش بە دەنگی بەرز گوتی:

– سڵاو بۆ تۆ ئەی حەسەن حەکیم !

حەسەن حەکیم وەلامی داوە و گوتی:

– سڵاو بۆ ئێوە. ئیزن دەدەم هەستنەوە! کام گیر و گرفتێک ئێوەی گەیاندۆتە ئێرە.؟

یەک لە پیاوەکان گوتی :« بێگومان تۆ دەزانی کە کوڕی پاشا زۆر نەخۆشە. پاشا تکات لێدەکات کە دەرمانی بکەی.»

حەسەن حەکیم گوتی:« بۆ شاری خۆتان بگەڕێنەوە، من بە دواتاندا دێم.»

هەر سێک سەریان دانواند و گەڕانەوە و سوپاسی سەرتاشیان کرد و گوتیان:

– لە تۆڵەی ئەو خزمەتەی بە مەت کردوە، ئەم کیسە ئاڵتونە وەر گرە.

سەرتاش گوتی :« ئاڵتونی خۆتان بۆ خۆتان، من پێویستم بە هیچ شتێک نیە. تەنیا دیتم ئێوە غەریبن و کارتان هەیە و بەزەییم پێتاندا هات و ویستم یارمەتیەکم بە ئێوە کرد بێ. ئەوەی گوت و بزر بوو، دەتگوت هەر نە بوە.

---

× شێخ عەدی دامەزرێنەری کۆمەڵی عیرفانی عەدەویە کە لە نێو کورداندا لە سەدەی شەشەمی کۆچی دا نفوزێکی زۆری هەبوە. کوردەکانی پیرەوی ئەم کۆمەڵەیە خۆیان بە یەزیدی ناو دەبەن. یەزیدیە تاقە مەزهەبێکی جیهانیە کە کەس ڕێی تێ نەبردوە و بێگانەش وەر ناگرێ. مەزهەبی یەزیدیە تێکەڵاوێکی لە ئیسلام وزەردەشتیگەری و مەسیحیەت و یەهودیەت. قەبری شێخ عەدی زیارەتگای یەزیدیەکانە و لە باکوری عراق لە «لالش» هەڵکەوتوە.

پیاوەکان بۆ کن شا گەڕانەوە و دیتیان حەسەن حەکیم بەر لە وان گەیوەتە وێ و لە پەنا شا دانیشتوە. پاشا بە حەسەن حەکیمی گوت:« ئەی حەسەن حەکیم! کوڕەکەم چا بکەوە، لە پاداش دا دەستەڵات و پاشایەتیم دەدەم بە تۆ.»

حەسەن حەکیم لە وەڵامدا گوتی: « با بچین کوڕەکەم نیشان بدە.»

حەسەن حەکیم تەماشای نەخۆشی کرد و گوتی:« پەڕە کاغەزێکم بۆ بێنن.

پاشا نۆکەرێکی بانگ کرد و گوتی:« بچۆ دوکانی مەیمون و پەڕە کاغەزێک وەر گرە و زوو وەردوە.»

حەسەن حەکیم گوتی : « منیش لە گەڵی دەچم. نارەحەت مەبە، زوو دێمەوە. حەسەن حەکیم و نۆکەری پاشا گەیشتنە دوکان. دیتیان دوکانێکی گەورە و پڕ لە شتو مەکە. بەڵام فرۆشیار مەیمونە. بە تاقی تەنیا، شت دەدا و پارە وەر دەگرێ. خاوەن دوکان لە کەنارێک دانیشتوە و نا بزوێ. مەیمون هەموو کارەکان دەکا. حەسەن حەکیم لە وە کە مەیمون بە زیرەکي کارەکان دەکات و هیچ بە هەڵەش ناچێ، سەری سور ما.

ئاخرەکەی بوو بە شەو. دوکانیان داخست. خاوەن دوکان تەنافێکی خستە ملی مەیمون و بردیە حەسار و تا توانی لێی دا. پاشان بە دوای خۆیدا ڕایکێشا و لە ڕێگاش نێوە نێوە لێی دەدا. حەسەن حەکیم بە دوایدا دەڕۆی. خاوەن دوکان ئاوڕی داوە و دیتی پیاوێک بە دوایانەوەیە. گوتی :

– بە دوای ئێمەدا مەیە. دەبینی لە مەیمونەکەم دەدەم تۆزی لێ هەڵدەستێ و لە لیباسی تۆ دەنیشێ و پیسی دەکا.

حەسەن حەکیم گوتی:

– ئەمشەو میوانی تۆم.

– باشە، ئەگەر بۆ میوانی هاتووی، فەرموو. گەیشتنەوە ماڵ. حەسەن حەکیم دیتی ماڵ پڕە لە میوان. هەموو دانیشتوون، دەخۆن و دەخۆنەوە و مەجلیسی بەزمیان ساز کردوە. خاوەن ماڵ حەسەن حەکیمی دانا و گوتی : نان بێنن.

حەسەن حەکیم گوتی:« نا، ئازیزم، تا ڕازی ئەم مەیمونەم پێ نەڵێی، دەست لە خواردن نادەم. ئاخر ئەم حەیوانە بە ڕاستی و دروستی لە بەیانیەوە تا ئێواری شت دەفرۆشێ، لە دوکان کار دەکا، تۆ لە پاداشدا لێی دەدەی. بۆ چی ؟ چیکردوە.؟ تکادەکەم دەلیلی ئەوەم پێ بڵێ. ئاخر من میوانی تۆم.!

– چەند خانوو لەولای ماڵی من خاوەنی سەگێکی ڕەش دەژی. هەر کاتێ ئەو حکایەتی سەگە ڕەشی بۆ گێڕایەوە، منیش داستانی مەیمونت بۆ باس دەکەم. حەسەن حەکیم گورج هەستا و چوو ماڵی خاوەنی سەگە ڕەشی دیتەوە و چوە ژوورێ و گوتی:

– میوان ڕادەگرن.؟

– میوان خۆشەویستی خوادایە. سەر چاوان، فەرموو. حەسەن حەکیم تەماشای دەور و بەری کرد، دیتی لە وەتاغێ دا سەگێکی ڕەش لەسەر حەوت باڵنجان وەر کەوتوە وقەڵەدەیەکی زێڕی لە ملی دایە.

خاوەن ماڵ حەسەن حەکیمی لە سەر فەڕش دانا و خواردنی بۆ هێنا.

حەسەن حەکیم گوتی:« سوپاست دەکەم. تا داستانی ئەم سەگەم بۆ باس نەکەی، دەست لە خواردن نادەم. زوو بۆم باسکە. ئاخر من میوانی تۆم.»

خاوەن سەگ لە وەڵامدا گوتی :« لە نیزیک ماڵی من قازی دەژی. ئەگەر ئەو داستانی خۆی بۆ باسکردی، منیش سەرگوزەشتی خۆمت بۆ دەگێڕمەوە.

حەسەن حەکیم هەستا و چوو ماڵی قازی دیتەوە. ماڵەکەی دیار بوو زۆر نیزیک بوو. کاتێ حەسەن حەکیم گەیشتە نیزیک دەرگای ماڵی قازی، قازی لە ماڵ دەهاتە دەر. قازی بە پێکەنین و کەیف خۆشی هاتە دەر و بۆ لای منارە ڕۆیشت. پاشان چوە سەر منارە و دەستی کرد بە دوعا و موناجات و تا ڕۆژ ئاوا لە سەر منارە بوو. پاشان بە گریان و هاوار هاتە خوار و بۆلای ماڵێ چۆوە. لە ڕێگادا لە سەر و ڕووی خۆی دادە و دەگریا. حەسەن حەکیم وە دوای قازی کەوت و گوتی:

– من ئیمشەو میوانی تۆم.

قازی گوتی:« میوان خۆشەویستی خودایە و بە خێر هاتی. قازی حەسەن

حەکیمی بردەماڵێ. کەس لە ماڵ نە بوو. قازی خواردنی هێنا و لە پێشی دانا.
حەسەن حەکیم گوتی :

-نا، سوپاست دەکەم. تا حکایەتی خۆتم بۆ باس نەکەی، دەست بۆ خواردن نابەم. پێم بێژە بزانم بۆ چێ وا بە خۆشی و پێکەنین لە ماڵ وەدەر کەوتی و بە فریاد و هاوار گەڕایەوە.؟

- خانوێک لە و لای ماڵی من کابرایەکی کوێری شامی( واتە خەڵکی شام)دەژی، بڵا ئەو حکایەتی خۆیت بۆ بگێرێتەو، تا منیش باسی داستانی خۆم بکەم.

حەسەن حەکیم چوە کن کابرای کوێر ، کە لە دەرگای ماڵە کە نیزیک بۆوە دیتی ماڵە کە پڕە لە میوان. پرسی:

- کوێر لە ماڵە. ؟

- نا،نا، لە ماڵ نیە. وا لەو سەر پردە وێستاوە سواڵ دەکا. حەسەن حەکیم بۆ لای پرد چوو، دیتی کابرای کوێر لە سەر پرد وێستاوە و سواڵ دەکا. هەر کەسێ شتێکی دەداتێ. کوێرە تا ڕۆژ ئاوا لە وێ ڕاوەستا. حەسەن حەکیم -یش لە پەنا وی.

کابرای کوێر کیسەیەکی پڕ لە پارەی کۆ کردەوە و کە شەو داهات بە کوێرە کوێرە سێ پارەی شکاوی لە کیسە هێنا دەر و خستیە گیرفانی.. کیسەکەی هەڵگرت و بە سەر شانی دادا و ڕووی کردە مەیدان. کە گەیشتە مەیدان، پارەی ناو کیسەی لە سەر عەردی ڕۆ کرد و ڕۆیشت. حەسەن حەکیم بە دوایدا. لەم ناوە دا خەڵک هێرشیان برد و پوڵەکەیان هەڵگرتەوە و هیچیان لێ نەهێشت.

کابرای کوێر کە هەستی کرد لە پشتەوە دەنگی قاچی کەسێک دێت، پرسی :

- کێیە بە دوای من دادێت. باشترە وەپێش بکەوی. چونکە گۆچانەکەم تۆز هەڵدەستێنێ و لیباسەکانت پیس دەکا.

حەسەن حەکیم گوتی : ئەمشەو میوانی تۆم، من بەرەوە ماڵی خۆت.

کوێر لە وەڵامدا گوتی :« پێت لە سەر چاوان، میوان خۆشە ویستی خودایە و ماڵی من ماڵی تۆیە.»

گەیشتنەوە ماڵێ. حەسەن حەکیم دیتی لە قوژبنێکی ماڵەکە هێندێ خاک و قوڕ ڕژاوە. کابرای کوێر بۆلای ئەو قوژبنە چوو لە سەر خۆڵەکە درێژ بوو.

حەسەن حەکیم بانگی کرد:

– چدەکەی ؟ لە جێی خۆت درێژ بە، بۆ دەچی لە سەر خاک و قوڕ درێژ دەبی.؟

کابرای کوێر گوتی :« دانیشە و نانەکەت بخۆ و نیگەرانی من مەبە. من دەزانم چبکەم. لەو کاتە دا کەشەفێکی پڕ لە خواردنیان لە پێش دانا.

حەسەن حەکیم گوتی :« نا،نا، تا داستانی تۆ نەزانم، دەست لە خوراکی تۆ نادەم.»

– بخۆ، بخۆ ! لە کاتی خواردندا سەر گوزەشتەی خۆمت بۆ دەگێڕمەوە. گوێ بدەیە و لە بیرت بێ. سەر دەمێک برایێکم هەبوو. برایەکەم پاشا بوو. ڕۆژێک چوە زیارەتی مەککە. منی لە جێگای خۆ دانا تا حکوومەت بکەم و وڵات بە ڕێوە بەرم. من بووم بە پاشا. خەڵک و وڵاتم خەراب بە ڕێوە برد. حەوت ماڵم موحتاجی جوتە گایەک کرد. بوو بە قاتی. خەڵک نیزیک بوو یەکتر بخۆن. من زوڵمم لێ دەکردن. کاتێکی برام لە زیارەت گەڕایەوە، خەڵک شکایەتیان لێکردم و برام دوعای لێکردم کە:« ڕەببی لە هەر تک چاوان کوێر بی و لە سەر قوڕ و خاک بنووی و داهاتت تەنیا سێ پوڵی شکاو بێ. دوعاکەی وی گرتی و ئێستا دوازدە ساڵە هیچ شتێ نابینم.»

حەسەن حەکیم گوتی :« لەم دوازدە ساڵە دا قەرەبوی گوناحەکانت کردۆتەوە. ئە گەر بە کەمیشی دابنێین، ئەوە کە پارەکانی کۆ کراوە دەدەی بە خەڵک، خۆی ئەوە قەرەبوی تاوانەکانە. حەسەن حەکیم دوعایەکی کرد و کابرای کوێر چاک بۆوە و خاک و قوڕی ناو ژوورەکەش نەما. حەسەن حەکیم لە گەڵ خاوەن ماڵ خوا حافیزی کرد و چوە کن قازی و سڵاوی کرد.

– عەلێکە سەلام. باشە. چۆن بوو، داستانی کوێری شامیت زانی؟

– بەڵێ زانیم. ئێستا بۆت دەگێڕمەوە. حەسەن حەکیم داستانی بۆ قازی گێڕاوە و گوتی :

– ئێستا تۆ حکایەتی خۆتم بۆ باس بکە. گوێت بدەمێ.

– چەند ساڵ لە مەو بەر، ڕۆژێک وەک ڕۆژان چوومە سەر منارە و دەستم بە دوعا و موناجات کرد. لە پڕ داعبای زۆر بۆ لام هاتن. لەقلەقێکیان لە گەڵ بوو، دندوکی لە سەر شانی من دانا و تا من لە دوعایان بوومەوە هەر وا وێستا بوو. من دەستم بە پشت و باڵەکانیدا هێنا، لە نەکاو فڕی. من لاقەکانیم گرت، لەقلەق منی بۆ حەوا بەرز کردەوە. ماوەیەک دەفڕین، لە ترسان چاوم هەڵنە دەهێنا. کاتێ چاوم لێک کردنەوە، خۆم لە باخێکی خۆش و جوان دیت. لە دڵدا گوتم: « بێگومان ئێرە بەهەشتە»، کیژێکی جوانی وەک حۆری بەهەشت هاتە لام و گوتی؛ بە دوایدا بڕۆم. منی بردە وەتاغێک، سێ کیژی لێبوون. سێ کیژی لە خۆی جوانتر. کیژەکە لە منی پرسی :« دەتوانی بڵێی لەم کیژانە کامیان لەقلەقە؟» گوتم« نا، لە کوێ بزانم ؟» پاشان گوتی: « باشە. چاوەکانت ببەستە و دەست درێژ کە و یەک لە وانە بگرە.» من بە قسەم کرد. پاش تاوێک کیژێکم گرت. کچەکە گوتی: « ئەوە هەمان لەقلەقە کە تۆی هێناوەتە ئێرە.» من لە گەڵ ئەم کیژە جوانە مارەییم بڕی و ژیانێکی خۆشمان ڕادەبوارد. مانگ و سال و سەدە تێپەڕین– نازانم– بەڵام لام وایە هەر ڕۆژێک پێکەوە بووین، نازانم چۆن بوو کەوتمە بیری خێزان و ماڵ و منداڵانم، هەوای گەڕانەوە لە سەری دام. بە کیژی لەقلەقی– هاوسەرم– گوت: « بمبەوە ماڵێ دەمەوێ ژن و منداڵەکانی خۆم ببینم.» لە وەڵامدا گوتی: « بۆ خاتری خوا، ئەمە چ قسەیێکە.. ئاخر ئەوە زەمانێک تێپەڕیوە، لە کەس و کاری تۆ یەکیش نەماوە.» بڕوام بە قسەکانی نەکرد و ویستم بمباتەوە و پێم داگرت کە لەو کاتەوە ماڵی خۆم بە جێهێشتوە، هەر ڕۆژێک گوزەراوە. هەر چەند ویستی من قانیع بکات، لە سەر ویستی خۆم وەستام و گوتم:« من بەردەوە!» ئاخردکەی کیژدکە هاتە سەر شکڵی لەقلەق و من توند قاچم گرت و وە حەوا کەوت و منی لە سەر منارە هێنا خوار و خۆی گەڕایەوە. من لە منارە هاتمە خوار و چوومەوە ماڵ. دیتم نە ماڵ و نە کۆڵان

دیاره و نه شـوێنەواری ژن و منداڵانم مـاوە. لە هـەر کـەسم پرسی کـەس نەیدەزانی. پیرە مێردێک گوتی:« بێگومـان تۆ لەو دنیـاوە هاتووی! نەکا تۆ هەمان قازی بی کە لە منداڵیدا لە باپیرم بیستوومە. بەڵام ئەم رووداوە ئەوەندە کۆنە کە هیچ کەسی تۆ نەماون.» ئاوا من بە تەنیا مامەوە. کەسم نیە. هەموو رۆژێ بەیان دەچمە سەر منارە و بە هیوای ئەوە کە لەک لەک بە دوامدا بێتەوە. بەم فیکر و هیوایە دڵم خۆشە. پێدەکەنم و شایی دەکەم. دوای نێوە ڕۆ تا ڕۆژ ئاوا چاوەڕوانی لەقلەقم و شەو دەگەڕێمەوە. کاتی بیر لە تەنیایی و بێکەسی خۆم دەکەم و دەبینم کە تەواوی شەو دەبێ بە تەنیا بم، دەست بە گریان و هاوار دەکەم و بە سەر خۆم دادەدەم. هیچ شتێ دژوار تر و خەرابتر لە ماڵی خاڵی و وەجاخی سارد و دڵی سوتاو و گریان نیە! مردن لەم ژیانە باشترە.

حەسەن حەکیم گوتی: « ئایا پێت خۆشە بچیەوە بۆ ئەو باخە بەهەشتە؟»

– دیاری پێمخۆشە، جگە لەوە ئاواتی دیکەم نیە. حەسەن حەکیم دوعایەکی خوێند. لە پڕ دەنگی باڵی باڵندە بیسرا و لەقلەقێکی گەورە لە پەنا ماڵی قازی لە عەردی نیشت. قازی لە خۆشیان نەیدەزانی چبکا، لە ماڵێ وەدەر کەوت. لاقی لەقلەقی گرت و باڵندە بۆ حەوا فڕی و قازیشی ڕەحەوا خست، حەسەن حەکیم چوە کن خاوەنی سەگە ڕەش.

– باشە، چتکرد. هیچ لە داستانی قازی ئاگادار بووی یان نا،.؟

– بەڵێ ئاگادار بووم.

حەسەن حەکیم حکایەتی قازی بۆ خاوەنی سەگە ڕەش گێڕاوە و گوتی : « ئێستا نۆرەی تۆیە.»

– گوێ بدەیە. ڕۆژێک چوومە زیارەتی مەککە. ماوەیەکی زۆر لە شار و وڵات و ماڵی خۆم دوور کەوتبوومەوە تا لە ئاخردا گەڕامەوە. هەموو خەڵکی گوندی هاتنە پێشوازم و لە ماڵی من کۆبوونەوە. پاشان کە ڕۆیشتن، من و خێزانم بە تەنیا ماینەوە. ژنەکەم ئاوی هێنا کە لاقانم بشۆم. لاقیکی شوشتم ولاقەکەی دیکەم لە تەشتی دا بوو، وازی لێ هێنام و ڕۆیشت. من ڕاست بوومەوە کە وەدوای کەوم. سەگە ڕەشم هەڵگرت و بە دوایدا، ئەو کەیشتە دەور

و بەری شار و من سەبروکە بە دوایدا بووم دیتم چۆە نێو ئەشکەوتێک. من لە پەنا ئەشکەوت خۆم مات کرد. دیتم چل دز لە ئەشکەوتەکە دان یەک لە وان گۆیا سەرۆکی دزان بوو گوڕاندی بە سەریدا و گوتی :« بۆ وا درنگ هاتیەوە.؟»
ژنەکەم وەلامی داوە و گوتی :« مێردەکەم لە حەج هاتەوە، دراوسێکان لە مالی ئێمە کۆبوونەوە. پاشان ویستم لاقی مێردەکەم بشۆم. ئەوەندە بە پەلە بووم هەر لاقێکم شوشت و لاقەی دیکەم لە ئاوێدابە جێهێیشت و بە پەلە گەڕامەوە.!»

سەرۆکی دزان زۆر توڕە بوو دەستی دا گەسک و لە ژنەکەمی دا. پاشان هەموویان چوونە دەجێ بنوون، ئەوانەم بە چاوی خۆم دیت. کاتێ هەموو خەویان لێکەوت، من یەواشەکی چوومە ئەشکەوت و سەری دە دزم بڕی. ژنم لە خەو وەخەبەر هات و سەرۆکی دزانی وەخەبەر هێنا و گوتی :« ئەی گەورەی دزان! داعبایەک هاتۆتە ناو ئێمە و سەری دە داعبای بڕیوە.»

سەرۆکی دزان گوتی :« بێگومان تۆ خەون دەبینی و وڕێنە دەکەی. بنوو بنوو.» کاتێکی ئەوان خەوتنەوە سەری بیست و نۆ دزی دیکەم بڕی، تەنیا سەرۆکی دزان و ژنەکەم مابوون. خێزانم جارێکی دیکەش سەرۆکی دزانی ڕاوەشاند و گوتی :« خەو بەسە. ئێستا مێردەکەم سەری تۆش دەبڕێ» سەرۆکی دزان ڕاست بۆوە و منی پەلامار دا. من ئەوم لە عەردی دا و وەبەر پێلاقانم دا. بەلام لەم بەینە دا ژنەکەم لاقی منی گرت و کێشای. وەعەردی کەوتم. سەرۆکی دزان سوارم بوو دەیویست بمخنکێنێ. زۆر بە هێز بوو پێی نە دەوێرام. کەمی مابوو بمخنکێنێ. لەو کاتەدا سەگەکەم بانگ کرد. سەگ سەرۆکی دزانی پەلامار دا و کێشای و کەرووی گرت، من هەستام و بە زەبرێک ژنەکەم دوو لەتکرد. پاشان سەگی وەفا دارم هەلگرت و چوومەوە مالێ. سەبارەت بە وەفاداری ئەوم لە باشترین شوێنی وەتاغەکەم داناوە و زنجیری زێڕیشم خستۆتە ملی. ئەوە داستانی منە و وەسەلام و تەواو.

تەواوی ئەو کارانەت باش بوە، تەنیا ئەوە نەبێ کە سەگ نابێ لە باشترین شوێنی وەتاغ دا وەرکەوێ. ئەو جێگای ئادەمیزادە، ئاخر ئادەمیزاد ئەشرەفی مەخلوقاتە. بەلێن بدە سەگەکە لە حەسارێ ڕابگری هەر وەک شیاوی سەگانە.

هەر ئەوە کە خواردنی باش و تەواوی دەدەمیەی بەسیەتی.

خاوەن سەگی ڕەش قسەکای حەسەن حەکیمی دە گوێ گرت و سەگی لە حەساری بەرەڵا کرد.

حەسەن حەکیم چوە کن خاوەنی مەیمون. خاوەن مەیمون پرسی:

- باشە داستانی سەگە ڕەشت زانی؟

- بە لێ زانیم، تەواوی داستانەکەی بۆ گێڕامەوە

- ئێستا بەڵێنی خۆت بەرە سەر و داستانی مەیمونم بۆ بگێڕەوە.

- کە وابوو گوێ بدەیە. سەردەمێکی کە زۆر گەنج بووم کیژی پاشام خواست و هێنامە ماڵێ خێزانم خزمەتکارێکی هەبوو کە زۆری خۆش دەویست و لە گەڵ خۆی هێنا بوویە ماڵی من. شەو کە چوومە ژووری کن خێزانم، خزمەتکار لە زار دەرگا پێشی پێگرتم و گوتی :« ناهێڵم بچیە کن ژنت. دەبێ لە پێشدا لە گەڵ من بنووی، دوایە لە گەڵ ئەو.» خێزانم گوێ لەم قسانە بوو، بە سەریدا گوڕاندی؛« ئەی مەیمونی پیس! هەر ئێستا ڕێگای مێردم بدە بێتە لام » خزمەتکار ڕێگای دام و بەلام بە ژنەکەمی گوت: « تۆ نە بە زیندویی دەمێنی و نە مردوو. تا ڕۆژی قیامەت هەر وا دەمێنیەوە!» نەفرینی هەر تک ژن وەدیهاتن. خزمەتکار بوو بە مەیمونێکی مێ، ژنەکەشم بۆ تە بەرد. نە زیندوە و نە مردوو. سالانی ساڵە هەر لەم حاڵە دایە.!

حەسەن حەکیم گوتی:« من بەرە کن ئەو!»

خاوەن دوکان حەسەن حەکیمی بردە وەتاغیک پەنای کیژێک کە بێ حەرەکەت لە سەر دۆشەکێک دانیشتوە. کیژێکی جوان وەک مانگ. دەتگوت بۆتە بەرد. نە قاچی دەبزوێ و نە دەستی. حەسەن حەکیم دوعایەکی خوێند وکچ دەست بەجێ بزمیەکی هاتێ و لە جێ هەستا و شاد و بە پێکەنین دەستی بە ڕۆیشتن کرد. خاوەن دوکان و کیژەکە چوونە کن حەسەن حەکیم و سوپاسیان کرد.

حەسەن حەکیم گوتی: « ناچار دەبێ مەیمونەکە بکوژن. چونکە نەفرینێکی دیکە بکات، دیسان هەر تکتان توشی بەد بەختی دەبن. خاوەن

دوکان هەر لەوێ مەیمونەکەی کوشت . حەسەن حەکیم گوتی : « ئێستا پەرە کاغەسێکی باشم بدەیە.

خاوەن دوکان پەڕێکی کاغەزی هەر باشی بۆ هێنا. حەسەن حەکیم مالآوایی لێکردن و بە تالوکە چوە کن کوڕی نەخۆشی پاشا.

شا بە پێشوازیەوە هات و گوتی :« لە کوێ بووی. پەلە بکە، کوڕەکەم لە سەرە مەرگ دایە.

حەسەن حەکیم گوتی : « ئێستا دەرمانی دەکەم. قەڵەمی هەڵگرت و نیشانەیەکی نە خوێنراوە و دوعای نووسی و پاشان کاغەزەکەی لە سەر سەر و دڵی نەخۆش ڕاگرت و دوعای خوێند. پاش چەند دەقیقە کوڕی پاشا ساخ و سەلیم هەستا و دەتگوت قەت نەخۆش نەبوە. پاشا گوتی :« تاج و تەختی خۆم بە تۆ دەبەخشم»

– من پێویستم بە هیچ شتێ نیە. تاج و تەخت و حکوومەت بە تۆ دەبەخشم. خۆشبەخت بژی و بە عەدڵ و داد بە سەر خەڵکدا حکوومەت بکە. ئەوەی گوت و بزر بوو، دەتگوت هەر نە بوە. پاشا حەوت شەو و ڕۆژ جێژنی گرت و خەڵکی بانگ کرد. ئەوان بە ئاواتی خۆیان گەیشتن و هیواداریین ئێوەش بە ئاوات بگەن.

## پەندەکانی حەکیمانە ٤٥

کابرایەک هەبوو بە ناوی ئەحمەد و ژنەکەشی ناوی « سەیران» بوو. لەو پەڕی هەژاری و فەقیری دا بوون. ڕۆژێک ئەحمەد بە خێزانی گوت: « دەچمە شار و کارێک پەیدا دەکەم بەڵکو پارەیک وە دەست بێنم و خەرجی بکەین.»

خۆی ساز کرد و کەوتە ڕێ. چەند شەو و ڕۆژان ڕۆی گەیشتە حەڵەب. چوو لە کن پیاوێکی دەوڵەمەند بوو بە کرێکار. حەوت ساڵ لە کن کابرا کاری کرد. کابرای دەوڵەمەند حەوت هەنبانە زێڕی دایە. ئەحمەد زێڕەکانی وەر گرت و ماڵاوایی لە خاوەنکار خواست و خۆی بۆ گەڕانەوە ئامادە کرد. لە ماڵ هاتە دەر و دیتی خاوەن کارەکەی لە نیزیک ماڵیان دانیشتوە و گۆزمیەکی پڕ لە گەنمی کوڵاو لە پێش خۆی داناوە. گەنمەکە دەنک دەنک هەڵدەگرێ و فڕێی دەدا.

ئەحمەد پرسی: « ئاغا چدەکەی .؟

– پەندی حەکیمانە دەژمێرم.

– خودا عەمرت بدا. یک لەو پەندانە بە من بێژە.

– قیمەتی هەر پەندێک هەمبانێک زێڕە.

ئەحمەد لە هەمبانەکان یەکێکی دا بە کابرا و گوتی:« باش گوێ بدەیە: « لە هەموو کارێکدا سەبر پێویستە.»

ئەحمەد پێی سەیر بوو. پرسی: « هەر ئەوە »

– هەر ئەوە. ئەگەر دەتەوێ پەندێکی دیکەت بدەمێ، دەبێ هەمبانەیەکی تریش بدەی.

ئەحمەد هەمبانەیەکی دیکەی دایە. کابرای دەوڵەمەند گوتی:

– لە بیر مەبەوە کە « جوانتر لە هەموو کەس ئەو کە سەیە کە دڵ پەسندی دەکات»

ئەحمەد هەمبانەی سێیەم و چوارەم و پێنجەم و شەشەم و حەفتەمیشی دایە و حەوت پەندی حەکیمانەی وەر گرت:

« تا شتێکت لێ داوا نەکەن، هیچ مەدە بە کەس»

« رازی خۆت لە گەڵ ژنەکەت باس مەکە »

« ئەگەر لە شوێنێکی رێزدار دانیشتووی، لە گەڵ ئەو کەسە قسە مەکە کە لە نوختەی بەرانبەرت دینیشتوە،»

« کاتێ دەچیەوە ماڵ. لە رێگا دا هەر چی لە بەزد سوکتر بێ هەڵیگرەوە»

« لە جێیەک کە دانیشتووی هەڵمەستە.»

ئەحمەد جارێکي تر وەک پێش حەوت ساڵ یەک پوڵی رەشی نەبو. راستە کە حەوت پەندی حەکیمانە فێر بوە، بەڵام پەندی حەکیمانە سک تێر ناکا. ئەحمەد دەبوایە خۆی و منالەکانی تێر کردبایە. برسی و هیلاک رێگای ماڵی داگرت. دیتی کاروانێک خستوویەتی. گوتی:« با بچمە کن سەر بازرگان، بەڵکو خواردنێکم بداتێ»

چوە کن سەر بازرگان و سلاوی کرد. سەر بازرگان پرسی: « کێی و بۆ کوێ دەچی ؟»

– رێبوارم.

– باشە. دانیشە نان بخۆ تا پاشان قسان بکەین. ئەحمەد خواردی تا تێر بوو. دوایە سەر بازرگان پرسی:« کێی و بۆ کوێ دەچی»

ئەحمەد گوتی : « خۆشم نازانم. حەوت ساڵە بە دوای کاردا لە ماڵێ وەدەر کەوتووم. بە دەستی بەتاڵیش دەگەرێمەوە.»

سەر بازرگان گوتی :« دەتەوێ لای من کار بکەی.»

– بۆ نامەوێ. دیارە دەمەوێ.

بەڵێ، ئەحمەد بوو بە خزمەتکاری سەر بازرگان. کاتی رۆژ ئاوا سەر بازرگان خزمەتکارەکانی بانگ کرد و گوت:

– باشـــە. کـــامـــەتان دەچنە چاڵاو ئاو بێنن. دەبێ بەر لە ڕۆیشتن حوشترەکان ئاو بدەین.

ئەحمەد دیتی خزمەتکارەکان هەموو لە گەڵ یەک سرت و خورتیانە. بە چەند دەستە دابەش بوون و ئەو تەنیا ماوەتەوە.

ئەحمەد پرسی : « چ نەخشەیەکتان هەیە. نەکا خەیاڵی کوشتنی منتان هەبێ؟»

خزمەتکارەکان گوتیان: « ئەم قسانە چیە. بۆچ دەتکوژین.؟ ئەرباب دەڵێ یەک لە ئێمە بچێتە چاڵاو وئاو بێنێ. ئێمە دەزانین هەر کەسێکی بچێتە ئەم چاڵاوە. بە زیندویی نایەتەوە.»

ئەحمەد گوتی: « من دەچم»

سەر بازرگان گوتی :« من خوێنبایی تۆ دە دەم. ئەگەر بە زیندویی هاتیەوە دەر، پارەکە دەدەم بە خۆت. ئەگەر نەگەڕایەوە، پارەکە دەدەم بە ژنەکەت. تەنیا ناوی گوند و ژنەکەت بڵێ.»

ئەحمەد ناو ونیشانی شوێنی ژیانی خۆی و ژنەکەی دایە و تەنافێکی خستە ناو قەد و چوە دە چاڵاو. ئاو زۆر بوو. ستڵ ستڵ ئاوی ناردە سەر و کاتێکی حوشتر هەموو ئاو دران و ئاخرین ستلیان هەڵکێشا و ئەحمەد خۆی ئامادە کرد بێتەوە دەر، لە گەڵ بانگی کرد: هەڵم کێشن، لە نەکاو دەنگێکی بە ترس هەستاو دیواری چاڵاو کرایەوە ولاوێکی باڵا بەرز لەوێ هاتە دەر یەقەی ئەحمەدي گرت و لە گەڵ خۆی برد.

ئەحمەد کە وەخۆ هاتەوە و تەماشای دەور و بەری کرد، دیتی وەتاغێکی فراوان و ڕوناک و جوانە. کیژیکی جوانی وەک ڕۆژ لە سەر باڵنجێک دانیشتوە و لە قوژبنێکی دیکە بۆقێکی دزێوی بەدفەڕ مات بوە. لاو شیری هەڵکێشا و لە سەر سەری ئەحمەدی ڕاگرت و گوتی:

– ئێستا دەبێ بێژی لەم کیژ و بۆقە کامیان جوانتر و کامیان بۆ دڵداری دەبن؟ ئەگەر وەلامی ڕاستیش نەدەیەوە، سەرت دەبڕم

ئەحمەد نەیدەزانی بڵێ چی. سەری لێ شێوا بوو. فیکری کردەوە چبڵێم ؟

ئەگەر بڵێنم کیژەکە جوانترە، بێگومان دەمکوژێ. ئەگەر بڵێم بۆقەکە جوانترە، درۆم کردوە. هەر چۆنێک بێ دەکوژرێم. چبکەم. لە پڕ پەندێکی خاوەن کارەکەی وەبیر هاتەوە و گوتی:

- ئەی جوامێر. جوانتر ئەوەیە کە دڵ پەسندی بکا.

لە گەڵکوو ئەم قسەی کرد، دەنگێک هات و بۆق بوو بە کیژێکی ئەوەندە جوان کە زەلامی بۆ شێت دەبوو.

لاو شاد بوو، ئەحمەدی لە ئامێز گرت و گوتی:: « هەرچی دەتەوێ داوا بکە.»

ئەحمەد گوتی :« جگە لەوەی بچمەوە سەر زەوی هیچ ئاواتێکی دیکەم نیە.

لاو پرسی: « ئایا ژن و منداڵت هەیە ؟»

- ئێستا حەوت ساڵە ماڵم بە جێهێشتوە. ئەو دەم دەبوایە ژنە کەم منداڵی ببێ. نازانم ژن و منداڵم زیندوون یا نا.

لاو سندوقێکی گەورەی زێوی کردەوە وحەوت هەناری گەورەی جوانی هێنا دەر ودای بە ئەحمەد و گوتی :« پاداشی ئەو خزمەتەی بە منت کردوە.»

پاشان دەستی ئەحمەدی گرت و لە ماڵی بردە دەر. ئەحمەد دیتی دیسان بنی چاڵاوە. بانگی خزمەتکارێکی کرد:

- هەڵم کێشنەوە، ساخ و سەلیمم.

ئەحمەدیان هەڵکێشاوە. سەر بازرگان کە دیتی ئەحمەد شاد و بە کەیفە. خورجێنێک زێڕی دایە و گوتی:« ئەوە خوێنبایی تۆیە. شوکری خوا کە زیندوی.»

ئەحمەد گوتی:« من دەمەوێ دیسان بە دنیا دا بگەڕێم. تکام لە تۆ ئەوەیە ئەم پارە و هەنارانە بە ژنەکەم بگەیێنە. بە درێژی ناو و نیشانی ژنەکەی دا بە سەر بازرگان کە چۆن بیدۆزێتەوە. سەر بازرگان هەنارەکانی وەر گرت و لە گەڵ کاروان کەوتە ڕێ.

پاش ماوەیەک کاروان گەیشتە ئەو گوندە کە سەیرانی ژنی ئەحمەدی

لێبوو. سەر بازرگان ڕەدوای کەوت کە بیدۆزێتەوە، کاتێ دیتیەوە، پارە و هەنارەکانی دایە و پێی گوت: ئەحمەد زیندوە و سلامەتە و بەلام دەیەوێ ئێستا بە دەوری دنیا دا بگەڕێ. پاشان مالاوایي لە سەیران خواست و ڕۆیشت.

سەیران کوڕێکی حەوت ساڵەی هەبوو بە ناوی سمایل. کاتێ هەناری بە دەست دایکیەوە دیت، داوای کرد بیداتێ. دایکی هەنارێکی لەت کرد . یاقوت و مرواری و ئەلماسی لێهاتە دەر. سەیران تێگەیشت و بە کوڕەکەی گوت:« ئەم هەنارە ناخورێ. وەرە بچینە بازار هەناری شیرین و خۆشت بۆ بکڕم.

چوونە بازار. سەیران چەند هەناری باشی کڕی و دای بە سمایل. پاشان چوە کن جەواهیر فرۆش یەک لە گەوهەرە بە نرخەکانی پێ فرۆشت و پارەیەکی زۆری وەر گرت. هێندێ وەستا و بەننای بانگ کرد و خانوێکی گەورە و جوانی دروست کرد. لە دەورەی خانوەکە باخێکی گەورەی ساز کرد و دیوارێکی بەرزی لە دەوری کێشا. سەیران چەند نۆکەر و کلفەتی ڕاگرت و ژیانێکی خۆشی دەستپێکرد.

ڕۆژێکی دەرکەوانی بانگ کرد و گوتي : « ئەگەر پیاوێکت بینی سێ جار لە دەرگای دا و هەناسێکی قولی هەلکێشا، بیهێنە کن من.

ئێستا با سەیران لە مالی خۆی ژیان بەرێتە سەر و بزانین ئەحمەد چ دەکا؟

ئەحمەد چەند سالان بە ولاتاندا گەڕا. تا پارەیەک پەیدا بکا. بەلام هیچی وەگیر نە کەوت. ئاخرەکەی بڕیاری دا بچێتەوە مالی خۆی.

کاتێ گەیشتەوە نیزیک گوندەکەیان، دیتی مارێکی تۆپیو لە سەر جادە فرێدراوە. پەندی خاوەن مالی پێشووی وەبیر هاتەوە کە گوتبووی:« هەر چی لە سەر ڕێی مال دۆزیتەوە، لە بەرد نەرمتر بێ هەلیگرەوە.» مارە تۆپیوی هەلگرتەوە و خستیە نێو خورجێن و ڕۆی. گەیشتە گوندی. ویستی مالەکەی خۆی بدۆزێتەوە. دیتی لە جێگای خانوی ئەو مالێکی گەورە و جوان ساز کراوە. ئەحمەد لای وابوو کە ڕێگای لێ گۆڕاوە. گەڕایەوە و هێندێ وەدوور کەوت و سەرنجی دا و گوتی: نا ڕاستە، ئێرەیە. جارێکی تر چوە نیزیک خانۆکە و

دیسان گەڕایەوە. پاشان چوە سەر تەپۆڵکەیەک و لە وێوە سەیری گوندی کرد. دیتی هەوە و هەموو شت لە جێی خۆیەتی. خانووی جیرانەکەیان هەر لە وێیە. بەڵام خانووی خۆی دیار نیە. بۆ جاری سێهەم چوە کن خانۆکە و تەماشای کرد و هەناسەیەکی هەڵکێشا و ویستی بگەڕێتەوە دەرکەوان دەستی گرت و گوتی :« لە گەڵ من وەرە، خانمی ماڵ بانگی کردووی.»

ئەحمەد وەدوای دەرکەوان کەوت. بەر لە وەی بچێتە ژوور، مارە تۆپیوی لە خورجێنێ دەر هێنا و لە پێش پلیکانان لە حەسارێ داینا و خۆڵی بەسەر داکرد. چوە ژوورێ. ئەحمەد دیتی سەیرانی ژنی لە سەر تەخت نوستوە و کوڕێکی گەنج و جوان لە پەنای درێژ بوە. تورە بوو ، ئاگری گرت و گوتی : « چۆن شتی وا دەبێ. ژنم بێ ئەوەی چاوە ڕوانی من بێ، مێردی کردوە. هەڵیکێشا خەنجەر و نیزیک بوو پەلاماریان بدا و هەرتکان بکوژێ. پەندی خاوەن ماڵی وە بیر هاتەوە کە گوتبووی: « لە هەموو کارێک سەبرت هەبێ» خەنجەرەکەی فڕیدا ولە پەنا وەتاغ دانیشت و چاوە ڕوان بوو تا خێزانی وەخەبەر بێت. پاش ماوەیەک دیتی، کوڕکە بزووت و گوتی :« دایە سەرمامە پێم دادە.» ئەحمەد گوتی : سەیرە، کەمی مابوو کوڕی خۆم بکوژم» چوە کن سەیران و وەخەبەری هێنا ، سەیران کە چاوی بە مێردی کەوت، لە خۆشیان خۆی دە ئامێزێ هاویشت. بەڵێ. هەرتکیان دانیشتن و ئەوەی بە سەری هاتبوو هەمووی باسکرد.

زۆری پێنەچوو کە دراوسێ لە هاتنەوەی ئەحمەد ئاگادار بوون. هەموو لە ماڵی ئەو کۆ بوونەوە و لەوەی کە بە سلامەت گەڕاوەتەوە پیرۆز باییان پێگوت و هەموو شتیان لێ پرسی. لەو ماوەیە دا لەم شوێنەی کە ئەحمەد ماری تۆپیوی لێ وەبن زەوی دابوو دار میوەیەکی گەورە شین بوو. سەیران پرسی :

– ئەم دار میوەیە لە کوێ هاتوە؟ ئایا تۆ چاندووتە؟ چیە، هەرمێیە.؟

کاتی ئەوەی گوت، دارەکە پڕ بوو لە سێو، ئەوانەی لە دەوری دارەکە بوون، واقیان وڕ ما. هەر کەس جۆرێ بۆی دەچوو کە ئەمە چ دارێکە. یەک دەیگوت :« دار سێوە» کاتێ ئەوەیان دەگوت، داردکە هڵوی پێوە دەبوو. یەکی

دەیگوت هڵوە، دارەکە قەیسی پێوە دەبوو. سێیەمی گوتی: دەزانم ئەم دارە قەیسیە.

ئەحمەد گوتی : « هەر کەس بزانێ ئەم دارە لە چی شین بوە، ماڵ و سامانی خۆمی دەدەمێ. ئەگەر راستی نەزانی، سامانی خۆی بدا بە من. خوازیاری وەلام دانەوە زۆر بوون. بەلام هیچکەس نەیتوانی بلێ: ئەم دارە لە چی و چۆن رواوە. کە یەک دەیگوت هەرمێیە، دارەکە هەلوچەی پێوە دەبوو. ئەگەر دەیگوت هەلوچەیە، سێوی پێوە دەبوو. هەر بەم جۆرە بەری دەگۆڕی. ئەحمەد وا دەوڵەمەند بوو کە جێی نەما ماڵ و سامانی لێ کۆبکاتەوە. دوکاندارێکی بە تەماع لەم کارە ئاگادار بوو. ئەم کابرایە ئەوەندە فێڵباز بوو شەیتانی دەرس دادەدا . ماوەیەکی زۆر بوو تەماعی دە سەیران کرد بوو. چوە کن پیرێژنێک و گوتی :

– بچۆ کن ژنی ئەحمەد و وا بکە کە ببیە راز داری ئەو. تکای لێبکە چەند رۆژێ سندوقێکی بە ئەمانەت لە ماڵی ئەوان دابنێی. جگە لەوە، وای لێ بکە لە مێردەکەی بپرسێ کە ئەو دارەی لە باخەکەیان رواوە چیە. منیش لە پاداشی ئەوە دا دوو ئەوەندەی گرانی خۆت زێڕت دەدەمێ.

پیرێژن چوە ماڵی ئەحمەد. پیرێژن ئەوەندە زمان لوس بوو کە ماری لە کون دێنا دەرێ. سەعاتێکی پێنەچوو لە ماڵی ئەحمەد بووو بە خۆمانی و سەیران هەر لە فیکری ئەوە دابوو لە کوێی دابنێ و چی بداتێ. پیرێژن گوتی : « ئاخ سەیران بەزەیێم پێت دادێ»

– بۆ بەزەییت بە من دادێ، هەموومان ساخ و سلامەتین. سەروەتێکی زۆرمان هەیە. مێردم خۆشی دەوێم ئیتر چیم گەرەکە.؟

– بەلێ وایە. بەلام ئەوە دەردی سەرە کە ئەحمەد تۆی خۆش ناوێ. خۆت بیری لێبکەوە، ئەگەر تۆی خۆش دەوێ، بۆ چی رازی دارەکەی خۆی لە تۆ دەشارێتەوە.

سەیران گوتی: هەقتە. لێی دەپرسم. کاتی رۆژ ئاوا پیرێژن ویستی بڕوا. بەلام سەیران بەری نەدەدا و دەیگوت بێ تۆ چۆن دەژیم.

پیرێژن گوتی دێمەوە. دەبێ سبەی سندوقەکەم بێنم، بەڵام نازانم لە کوێی دابنێم. جێ نیە.

سەیران گوتی :« دەتوانی لە وەتاغی منی دابنێی. هەتا دەتەوێ و یا کارت پێی دەبێ،» پیرێژن ڕازی بوو، بە خۆشحاڵی گەڕایەوە و دیتی دوکانداری بە تەماع چاوە ڕێیەتی، دوکاندار لێی پرسی: چتکرد؟ توانیت ژنی ئەحمەد ڕازی بکەی؟

پیرێژن گوتی: هەموو کارەکان تەواو بوون. یاڵا نیوەی پاداشەکەی وادەت دابوو بمدەیە تا سندوق بەرمە ماڵی سەیران.

دوکاندار کەیفخۆش بوو، نیوەی زێڕی وادە پێدراوی دایە و گوتی: بەیانی وەرە سندوق لە گەڵ خۆت بەرە. بەیانی زوو دوکاندار بە سندوقێکی گەور و دوو حەمباڵ هاتە ماڵی پیرێژن. دوکاندار چوە ناو سندوق و حەمبال سندوقیان هەڵگرت بۆ لای ماڵی ئەحمەد. پیرێژنیش بە دوایاندا.

سەیران بە هاتنی میوان شاد بوو بە حەمباڵەکانی گوت تا سندوق لە ژووری خەوی ئەو لە جێیەکی باش دابنێن و خۆی خەریکی میوانداری پیرێژن بوو. ڕۆژ ئاوا ئەحمەد هاتەوە دیتی سندوقێک لە ژوورەکەی خەویان دانراوە. پرسی: ئەم سندوقە چیە؟

– پیرێژنی فەقیر جێی نە بوو هێناویەتە ئێرە، با هەر لەوێ بێ.

ژن و مێرد چوون بخەون، ئەحمەد دیتی کە سەیران جێگای خۆی جیا کردۆتەوە. پرسی : ئەوە چیە، چ قەوماوە.؟

– تۆ من بە ژنی خۆت نازانی ، هەموو شت لە٠من دەشاریەوە. بۆ چی پێم ناڵێی ئەم دارەی نێو باخی چیە و لە چی ڕواوە؟ ئەگەر منت خۆش گەرەک بایە، لێمت نە دەشاردەوە.؟

ئەحمەد نەیتوانی ڕازەکە بشارێتەوە. گوتی: دارەکە لە مارێکی مردوو ڕواوە کە لە ڕۆژی هاتنەوەیدا لە حەسارێ چاڵی کردوە.

سەیران گوتی : باشە. ئەوە ماری دارە،. ئەحمەد پێشی قسەکەی گرت و گوتی. یەواش . بەرز قسە مەکە لەوانەیە کەسێک گوێی لێبێت. سەیران کەیف

خۆش بوو، ئەحمەدی لە ئامێز گرت و ماچی کرد و گوتی: « ئێستا دەزانم کە منت خۆش دەوێ »

هەر وەک باسمان کرد دوکانداری فێڵباز هەموو ئەم قسانەی بیست. ڕۆژی دوایی پیرێژن بە حەمباڵەوە هات و سندوقی بردەوە. دوکاندار لە سندوق هاتە دەر و زۆر بە کەیف بوو. دەست بەجێ زیڕەکەی دیکەشی دا بە پیرێژن کە بەڵێنی دابوو.

باشە. با پیرێژن بە خۆشی و شادی زێڕەکانی بژمێرێ. بزانین دوکانداری فێڵباز چدەکات. ئەو ئێوارە هاتە کن ئەحمەد و گوتی :

– من دەتوانم بڵێم کە داری باخی تۆ لە چی ڕواوە. وەرە شەرت ببەستین. ئەگەر ڕاستم نە گوت، هەر چی هەمە بۆ تۆ. ئەگەر ڕاستم گوت، سێ شتی دلخوازی خۆم لە تۆ داوا دەکەم و دەبێ بمدەیەی.

ئەحمەد رازی بوو. هەرتک قەراردادیان ئیمزا کرد و خەڵکیان کردە شایەد و خەڵکیان داوت کرد. دوکاندار گوتی:

– داری تۆ مار دارە و لە مار ڕواوە، لە کەڵکو وایگوت، دارەکە ئاگری گرت و بە چرکەیەک سووتا و لە بەین چوو.

ئەحمەد گوتی: « ڕاستت گوت. ئێستا چیت لە من دەوێ بێژە.

دوکاندار گوتی :« لە ماڵەکەت دەست لە سێ شتان بدەم، دەبێ ئەو سێ شتانەم بدەیەی.

ئەحمەد گوتی : « سێ ڕۆژانم مۆڵەت بدە. پاش سێ ڕۆژ وەرە و سێ شتەکە بەرە.» دوکاندار ڕازی بوو.

ئەحمەد بەیانی ملی ڕێگای گرت بۆ حەڵەب کن خاوەن کاری پێشووی، ئەوەی پەندی دابۆیە. گەیشتێ و سڵاوی کرد و داستان و بەڵای خۆی بۆ گێڕایەوە.

پیرەمێرد گوتی :« ئەمشەو لە ماڵی پاشا داوەت کراوم. تۆش لە گەڵ من وەرە. سبەی باسی کاری تۆ دەکەین. لە ماڵی پاشا ئاگادار بە کە لە پەنا من دانیشی. گەیشتنە ماڵی پاشا. پیرە مێرد لە پەنا پاشا لە جێیەکی موحتەرەم

دانیشت و ئەحمەدیش لە پەنا وی دانیشت. وردە وردە میوان کۆ دە بوونەوە. پیرە مێرد دیتی هەر میوانێکی دێت، ئەحمەد جێگای خۆی دەداتێ. زۆری پێنەچوو ئەحمەد کەوتە پەنا دەرگا. پیرەمێرد کە وای دیت، نێوچاوانی تێک نا و بێدەنگ بوو. میوان هەموو دانیشتن و پاشا هات و نۆکەران سفرەیان داخست. لە ئاخر دا شوتیەکی گەورەشیان هێنا.

پاشا ڕووی کردە میوانان و پرسی: « کامەتان کێردێکی تیژ و پێیە شوتی پێ لەت کەین.»

کەس هیچی نە گوت. ئەحمەد بانگی کرد و گوتی : « من کێردی تیژم هەیە.». بێ ئەوەی کەس داوای لێبکا، کێردەکەی لە گیرفان دەرهێنا و بۆ پاشای برد.

پاشا کێردەکەی وەر گرت ، واقی وڕ ما. دەسکی کێردەکە ئەوەندە جوان بوو کە باسی نە دەکرا، تەواوی بە یاقوت و ئەلماس و مرواری ڕازابۆوە.

وەزیر لە پاشای پرسی : « چیت دیوە کە وا سەرت سور ماوە.؟» پاشا کێردەکەی بە وەزیر نیشان دا. وەزیر تەماشای کرد و پێکەنی.

پاشا پرسی:« بۆ پێکەنی .؟»

– ئاخر من وەزیری باوکت بووم. ڕۆژێ کە هێشتا بابت زیندو بوو، دز خەزێنەیان لێدا بوو. لە نێو شتە بە نرخەکاندا کە برد بوویان، یەکێش ئەم کێردە بوو. ئێستا تۆ کێردی باوکت ناناسیەوە. بەڵام من دەست بەجێ ناسیمەوە. ئەو دزەش ئیمڕۆ لە ماڵی تۆیە.

پاشا گورج جەلادی بانگ کرد. جەلاد هات و ئەحمەدی پێنیشان دا و گوتی : « لە سەری بدە.»

لەو کاتە دا پیرەمێردی خاوەن کاری پێشووی ئەحمەدی هەستا و گوت:

– پاشا سلامەت بێ، ئەحمەد میوانی منە. لە ڕێگای دوورەوە هاتۆتە ماڵی من. من ئەوم هێناوەتە ئێرە. ڕێگا بدە ئەمشەو لە ماڵی من بنوێ. ناکرێ نە هێڵی میوان بخەوێ. سبەی دێتە کن تۆ. دەبێتە میوانی تۆ. چۆنت پێخۆشە وای لێبکە.

- نا، تۆ فێری دەکەی کە چ بڵێ و چ بکات.

پیرە مێرد گوتی :« بەڵێن دەدەم و سوێند دەخۆم تەنانەت یەک قسەشی لە گەڵ ناکەم.» پاشا ڕازی بوو.

پیرەمێرد و ئەحمەد چوونەوە ماڵ. لە ڕێگادا ئەحمەد ویستی لە گەڵ پیرەمێرد قسان بکا ، بەڵام پیرە مێرد وەڵامی نە دایەوە.

کاتێ گەیشتنەوە، پیرە مێرد بانگی کچەکەی کرد و گوتی :

- زەری ! کەرەکە بێنە ئێرە و دارێکی ئەستوریشم بۆ بێنە. زەری کەرەکەی هێنا و بەستیەوە. پیرە مێرد دەستی دار و کەوتە گیانی کەر و گوتی :« مەگەر پێم نەگوتی لە جێی یەکی کە دانیشتی هەڵمەستە.؟ بۆ بە قسەت نە کردم.؟

پاشان دارێکی دیکەی لێدا و گوتی : « مەگەر پێم نەگوتی کە هەتا داوای شتێکت لێ نەکەن، هیچ مەدە بە کەس؟ بۆ بەقسەت نەکردم؟

پاشان چەند داری دیکەشی لێدا و گوتی :« باشە. ئێستا گوێ بدەیە، ئەوەی پێت دەڵێم لە بیرت بێ و بەیانی بە پاشایان بڵێ. پێی بڵێ :

- ئەی پاشا ! زۆرم پێخۆشبوو کە دەر کەوت تۆ خاوەنی کێردەکەی. حکایەتەکەی وایە کە بابم بازرگانێکی زۆر دەوڵەمەند بوو. ڕۆژێک ڕێگر لە کاروانیان دا و هەموو کاروانچیەکانیان کوشتن و تاڵانیان کرد و بزر بوون. کاروانچیەکان هیچیان زیندوو نەمان. بابیشم کوژرا. ئەم کێردەی کە بینیت، دە سینگی بابمیان ڕۆ کرد بوو بە جێ مابوو. لەو کاتەوە من ئەم کێردە لە گەڵ خۆم دەگێرم بەڵکوو خاوەنەکەی بیناسیتەوە تا تۆڵەی خوێنی باوکمی لێ بستێنمەوە. ئێستا زۆرم پێخۆشبوو کە قاتڵی بابم دیتەوە. کێردەکەی خۆت هەڵگرەوە وخوێنبایی باوکم لە تۆ دەوێ.

پیرەمێرد کە قسەکانی تەواو کرد، دارێکی دیکەی وای لە کەرەکە دا کە کەر کەوت و بە کیژەکەی گوت:

- وەرە کەرەکە بەرەوە تەویلە.

شەو هەموویان نوستن. بەڵام ئەحمەد خەوی لێ نە دەکەوت. تەواوی شەو

له فیکری ئەو قسانە دابوو کە دەبوایە بە پاشایان بڵێ.

ڕۆژی دوایە بەیانی پیرەمێرد ئەحمەدی بردەوە کن پاشا و گوتی :

– باشـە، ئەی قیـبلەی عـالەم، مـیوانی خـۆم هێناوە. ئێسـتـا چیت دەوێ بیکە.

پاشا بانگی جەلادی کرد و گوتی : سەری ئەم دزە بپەڕێنە.

ئەحمەد گوتی:« ئەی پاشا ڕێگا بدە بەر لە مردن، دوا قسەم بکەم.»

پاشا گوتی : قسەکانت بکە. بەڵام کورت بن.

ئەحمەد گوتی :« زۆر شادم کە دەر کەوت تۆ خاوەنی کێردی. ڕوو داوەکە ئاوایە کە بابێکی بازرگان و دەوڵەمەندم هەبوو. کاروانێکی گەورەی هەبوو، ڕۆژێک ڕێگر لە کاروانی دەدەن و هەموو کاروانچیەکان دەکوژن و دەڕۆن. کەس لە کاروانچیان زیندوو نامێنێ و بابیشم دەکوژرێ. ئەم کێردەیان دە سینگی بابم ڕاکرد بوو لە وێدا بە جێ مابوو. لەو کاتەوە من ئەو کێردە لە گەڵ خۆم دەگێڕم تا خاوەنی بناسمەوە و تۆڵەی باوکمی لێ بکەمەوە. زۆرم پێخۆشبوو کە لە ئاخر دا قاتڵی بابم دیتراوە. کێردی خۆت هەڵگرە و خوێنبایی بابم لە تۆ دەوێ.

پاشا گوتی : من ئەو کێردەم بە هی خۆم نەدەزانی. وەزیر ناسیەوە.

ئەحمەد لە وەزیری پرسی: « ئەی وەزیر، کێردەکەی دەناسی ؟»

وەزیر لە وەلامدا گوتی : « ئەحمەد گیان من ئەم داستانەم بە ئانقەست ساز کرد بوو تا کێردەکەت لێ بستێنین.

ئەحمەد گوتی: « باشە، دەر کەوت هەر ئاوا ماڵی خەڵک تالان دەکەن و لێیان دەستێنن. پاشاش هەر بۆیە تۆی کردۆتە وەزیر.»

پاشا گورج جەلادی بانگ کرد و ئەمری کرد لە سەری وەزیر بدا. بە ئەحمەدیشی گوت تۆ بڕۆ.

ئەحمەد و پیرە مێرد چوونەوە ماڵ. پیرە مێرد بە ئەحمەدی گوت:

– هەر بەلایەکی بە سەرت هاتوە، هەمووی خەتای خۆتە. ئاخر پێتم نە گوت قەت ڕازی خۆت بە ژنەکەت مەڵێ، بۆ بە قسەت نەکردم؟ ئایا دەزانی کە

دوکانداری فێڵە زان چی لە تۆ دەوێ؟ یەکەم سەری تۆ. دووەم ژنی تۆ، سێیەم دارایی و سامانی تۆ. ئێستا دەبێ چبکەی؟ گوێ بدە قسەکانم و ئەوەی پێت دەڵێم لە بیرت بێ: بچۆوە ماڵێ. نێردیوانێکی سە پلەی زۆر لێک دوور دروست بکە و پاڵی وە باڵە خانە بدە. پەنجەرەکانی ماڵێ لە ژوورەوە توند دابخە. لە گەڵ ژنەکەت بچۆ سەر باڵە خانە و چاوە ڕوان بە تا کابرای دوکاندار دێت. کە هات و تۆی لە باڵە خانە دیت، دەیەوێ بێتە سەر لای ئێوە. کە دەستی لە پلەی یەکەم دا بێتە سەر، تۆ بڵێ: « ئەوە یەکەم» کە دەستی لە پلەی دووەم دا، زوو بڵێ« ئەوە دووەم» کە دەستی لە پلەی سێیەم دا، بڵێ: « ئەوەش سێیەم». پاشان بڵێ دەستت لە سێ شتی ماڵی من داوە و شەرتت بردۆتەوە. نێردیوانەکە هەڵگرە و بڕۆ. ئیتر هیچی پێ ناکرێ جگە لەوە کە بە دەستی خاڵی بگەڕێتەوە. تەنیا ئاگا دار بە چەند شایەد لە وێ ئامادە بن.

ئەحمەد سوپاسی پیرەمێردی کرد و بە تاڵوکە بەرە و ماڵ بۆوە. کاتێ گەیشتەوە ماڵێ، پیرە مێرد چی پێگوت بوو ، وای کرد.

دوکانداری فێڵباز هات و دیتی ئەحمەد و ژنەکەی لە سەر باڵە خانەن. پلەکانیشیان بە خانوویەوە ناوە. دوکاندار دەستی وە پلەی یەکەم کەوت و ئەحمەد بانگی کرد و گوتی : « ئەوە یەکەم.»

دوکاندار گەیشتە پلەی دووەم، ئەحمەد بە دەنگی بەرز گوتی : « ئەوە دووەم»

کاتێ دەستی گەیشتە پلەی سێیەم، ئەحمەد هاواری کرد:« ئەوەش پلەی سێیەم ». ئێستا بە گوێرەی قەرار داد تۆ دەستت لە سێ شتی من داوە. ئەو سێ شتەش نێردیوانە، بیبە و بڕۆ.

دوکاندار ویستی کێچەڵێک بگێڕێ، بەڵام شایەدەکانی گوتیان هەقی ئەحمەدە و قەرارتان وا بوە. دوکاندار بە دەستی خاڵی و بە خەم و خەفەتەوە گەڕایەوە و ئەحمەد یش بە ئارەزوی خۆی گەیشت. ئیشەڵا ئێوەش پێدەگەن.

# ئەقڵ و ئیقباڵ ٤٦

لە نێوان ئاقڵ و ئیقباڵ بوو بە گفتگۆ. بەخت گوتی :« ئەگەر من لە ئینسان دوور کەومەوە، تۆ هیچ کارێکت لە دەست نایە.»

ئاقڵ گوتی: کەسێک ئاقلی لە سەر دا نە بێ، بەخت بە کاری چی دێت و فایدەی چیە. وەرە من ئەو کابرایەی کە خەرێکی جوت کردنە، ڕایدەگرم، بزانم تۆ چیت لە دەست دێت.

ئیقباڵ ڕازی بوو، گوتی: زۆر باشە. هەر لەو کاتە دا گاسنی کابرای جۆتیار- کە ناوی میرزا بوو - لە شتێک ئاڵقا و گیر بوو. میرزا تەماشای کرد و دیتی دوو کوپە دە عەرد گیراوە، یەکیان پڕە لە زێڕ و ئەوی دیکەش پڕە لە جەواهێر. میرزا کە ئاقڵی لە سەر دا نەما بوو گوتی: « بێگومان ئەوە پەمۆ دانەیە و دەیدەم بە گایەکان و کەیفی پێدەکەن.» کوپەکانی لە پێش گایەکان دانا. لە بەر بروسکەی زێڕ و جەواهێر گایەکان ڕەوینەوە.

لەو کاتە دا کاروانێک بە وێدا تێدەپەڕی. میرزا زۆر برسی بوو. مستێکی زێڕ و جەواهێرات هەڵگرت و چوە کن سەر کاروان و گوتی: « هێندێ لەم پەمۆ دانەم هەیە، ڕەنگە حوشترەکانت بیخۆن. لە جیاتیان هێندێ خواردەمەنیم بدەنێ.»

سەر کاروان کە زێڕ و جەواهێراتی بینی گوتی:

- بە لێ، حوشترەکانی ئێمە هەموو شت دەخۆن. بلێ بزانم لەم پەمۆ دانانە چیدیکەت نیە؟

میرزا گوتی : « بۆچی دوو کۆپەی پڕم هەیە.

سەر کاروان گوتی: « بچو بیانهێنە با حوشترەکان بیخۆن.

هەر دوو کوپەی هێنان. سەر کاروان خواردنی دایە، بخوا و تێر بێ. بە

پیاوەکەی خۆی گوت:« تا نەیزانیوە کە فریومان داوە لێرە بڕۆین.» پیاوەکەی گوتی :« باشترە لە گەڵ خۆمانی بەرین. دەنا لە وانەیە چەند جواهێرێکی لە کن مابێ. کەسێک ببینێ و بپرسێ« لەکوێت هێناوە» ئەویش لە وەڵامدا بڵێ: لە وانە زۆرم هەبوە و سەر کاروان کە ئێستا ڕۆی لێی وەر گرتووم. ئەو دەم وەدوامان دەکەون. هیچ پێویست نیە خۆمان بخەینە دەردە سەری. باشترە لە گەڵ خۆی بەرین و لە بیابانێکی چۆل سەر بە نیستی بکەین. سەر کاروان ڕازی بوو.

میرزایان سواری حوشتر کرد و توند بەستیان و کەوتنە ڕێ. بەڵام نەیانتوانی بیابان و جێگای چۆل پەیدا کەن، دە چوونە هەر جێیەک ئاوەدانی بوو. کەیشتنە شارێک. بە گوێرەی داب و نەریت چوونە دیدەنی پاشا و یەک لە گەوهەرەکانیان بە دیاری دا بە پاشا.

پاشا گەوهەرێکی بێ وێنە و بە نرخی دی، تەواوی زانا وئاقڵمەندانی شاری خۆی داوەت کرد و گوتی: نرخی ئەم بەردە قیمەتیە دیاری بکەن. ئەوان هەڵیان سەنگاند و گوتیان :

– پاشا سڵامەت بێ! نرخی ئەم گەوهەرە خەرجی دە ساڵی وڵاتی تۆیە.

پاشا لە وەزیری خۆی پرسی:« چۆن قەرەبۆی ئەم دیارییە بکەمەوە کە منەتبار و قەرزداری وان نەبم.»

– لە سەر کاروان بپرسە کە کوڕی هەیە یان نا. ئەگەر کوڕی هەیە کیژی خۆتی لێ مارە کە.

پاشا ڕازی بوو. سەر کاروانی بانگ کرد و پرسی:« کوڕت هەیە»؟

سەر کاروان ویستی بڵێ:« نا». بەڵام لە پڕ میرزای وە بیر هاتەوە و گوتی:« هەمە، هەمە»

پاشا گوتی:« دەمەوێ کیژی خۆم بدەم بە کوڕەکەت!

سەر کاروان گوتی: « مەیل مەیلی موبارەکە.»خواردنیان هێنا و هەر لەو دانیشتنە دا کیژی خۆی کردە دەزگیرانی میرزا. پاش ماوەیەک پاشا گوتی:« هەموو کەس ئاگادار بکەن کە پاشا کیژی خۆی بە شو دەدا و لە مەجلیسی

شایی دا ئامادە بن،»

هەموو لە مەجلیسی شایی دا کۆ بوونەوە. میوانان گوتیان:» زاوا بێت، دەمانەوێ بیبینین.!

بە سەر کاروانیان ڕاگەیاند و ئەویش بە میرزای گوت: « وەرە، ئیمڕۆ دە چینە میوانیی پاشا. بەڵام ئاگات لە خۆ بێت. تەواوی گەورە پیاوان لەو میوانیە دا ئامادەن. دەبێ ڕەفتارت ڕێکو پێک بێ.. لە هەر جێیەکیان دانای لە وێ دانیشە و مەبزوو. تا پرسیارت لێ نەکەن ، قسان مەکە.»

میرازا گوتی : « باشە » ڕۆیشتن. کاتێ گەیشتنە کۆشکی پاشا، هەموو لە بەریان هەستان. ئاخر زاوای پاشا هاتبوە ژوور.! میرزا کەوشی دەرهێنان و وەبن باخەڵی دان. سڵاوی لە کەس نە کرد و ڕاست چوو لە سەرووی مەجلیس دانیشت. خەڵک پێیان سەیر بوو.

وەزیر لێی پرسی:» ئەوی بن باخەڵت چیە»؟

– کەوشەکانمن.

– بۆ کەوشت وەبن باخەڵێ داون.؟

میرزا گوتی :» دەترسم بیان دزن.

پاشا لە گەڵ وەزیر تەگبیری کرد و گوتی:» چبکەین؟ ئەم زاوایە بە کار نایە.»

وەزیر لە وەڵامدا گوتی: « ئەگەر پەشیوان بیەوە باش نیە. ناچارین شایی بە ڕێوە بەرین. وا دیارە لە ڕۆژی هەوەڵ چارە نووسی وا بوە.» شایی بە ڕێوە چوو. میرزا چوە ژووری بوکێ. بوک نیگەران و نارەحەت دانیشتبوو، کچ و خزمەتکار دەوریان دابوو.

بوک لە میرزای پرسی :» هاتیە ژوور، بۆ سڵاوت نەکرد »؟

میرزا گوتی :» تۆ ژنی منی. منیش مێردی تووم. هاتووم لە گەڵت بنووم. ئەو قسانەی پێناوێ.»

کیژی پاشا بە کچەکان و خزمەتکارانی گوت: « لەوبێکارەی هەڵدەن و وەدەری بنێن.»

کچەکان هەر یەکەی دارێکیان دەست دایە و میرزایان پەلامار دا. میرزا هەڵات و چوە سەر بانی کۆشک و ویستی خۆ فرێداتە خوار. لەو کاتە دابەخت داوای یارمەتی لە ئاقڵ کرد و گوتی :« زوو بمگەیە ، کار خەرابە.»

ئاقل گورج دەفریای میرزا هات. میرزا تەماشای کرد دیتی لە قەراخ بانی کۆشک وەستاوە وئەگەر بکەوێ، دەمرێ. فیکری کردەوە و لە بەر خۆیەوە گوتی:« چۆن بوو هاتمە کۆشک و ئەم جۆرە قسانەم کرد» گەڕایەوە وپاشان چوە کن سەر کاروان و چۆنی پێویست بوو سڵاوی کرد و ئیجازەی دانیشتنی خواست. سەر کاروان دیتی میرزا ئاقڵ بوە، بەڵام ویستی تاقیکاتەوە. پێی گوت :- میرزا بچو ماست بێنە تا لە گەڵ سرکە تێکەڵی بکەین و بیخۆین.

- سەر کاروان ئەم قسەیە چیە ؟ کەس هەیە ماست و سرکە تێکەڵ بکات.؟ هەر تکیان ترشن، ماست دەبێ لە گەڵ شەکر بخورێ یا لە گەڵ شیرە.

سەر کاروان دیتی کە قسەکانی میرزا ئاقڵانەن. ماست و شەکریان خوارد و جارێکی دیکە چوونە کۆشکی پاشا.

ئەم جارە میرزا چوە ژوور و خزمەتکاری بانگ کرد و گوتی :

- بڕۆ بە خانمەکەت بڵێ کە نۆکەری وەفاداری هاتوە و ئیجازەی هاتنە ژوور دەخوازێ.

خزمەتکار چوە کن کیژی پاشا و قسەکانی میرزای بە کیژی پاشا ڕاگەیاند.

کچی پاشا ڕێگای دا و گوتی: با بێتە ژوور. میرزا چوە ژوور و چۆنی پێویست بوو ڕێزی بە جێهێنا و گوتی:

- من عەبدی بە وەفای تۆم. ئایا ڕازی بە مەیلی باوکت ببزوویەوە و ببیە هاو سەری من.»

کیژەکە گوتی : « ڕازیم» بەم جۆرە ئاقڵ بە سەر بەخت و ئیقباڵدا سەر کەوت.

# وەستا یوسوپ ٤٧

وەستا یوسوپ لە گەڵ دایکی دەژیا. ئەوان زۆر هەژار و فەقیر بوون. دایکی دەچوە جەنگەڵ داری کۆ دەکردنەوە و یوسوپ لەم دارانە شتی جوانی گەمەی منداڵانی دروست دەکرد، لە بازار دەیانفرۆشت و ڕۆژیان پێ دەبردە سەر.

ڕۆژێ پاشا و وەزیر جلیان گۆڕی و لە شار دا دەگەڕان و چوونە بازار. پاشا شتەکانی ئوسیبی دیت و پێی جوان بوون. لە یوسوپی پرسی:« ئایا دە توانی مەڕێکی گەورەم بۆ لە ئاڵتون دروست بکەی.؟»

– دیارە دەتوانم.

– بۆ دروست کردنی مەڕێک چەندە ئاڵتون پێویستە.؟

– کیسەیەک.

ڕۆژی دوایی پاشا کیسە ئاڵتونێکی بۆ وەستا یوسوپ نارد و خەریکی دروست کرد نی مەڕبوو لە ئاڵتون. پاش حەوتوێک مەڕی ئاڵتونی ئامادە بوو. پاشا زۆری بە کەیفێ بوو. بە دەست ئاواڵەیی پاداشی دا بە یوسوپ و لە کۆشکی خۆی نیزیک کردەوە. هەموو باسی هونەر و تەڕ دەستی و ئاقڵ و داهێنەریی یوسوپیان دەکرد. پاشا نەیدەهێشت لێی دوور کەوێتەوە، وەزیری لە بیر برد بۆوە. وەزیر ئێرەیی پێ دەبرد و لە داخان دیقی دەکرد. لە فیکری ئەوە دا بوو کە چۆن یوسوپ لە بەین بەرێ و لە دەستانی رزگار بێ.

ڕۆژێک وەزیر لیباسی گۆڕی و چوە کن دایکی یوسوپ و گوتی:

– دایە گیان یوسوپ منی ناردوە و خواهیشتی کردوە ئەو ئاڵتونەی لە پەیکەری مەڕەکە ماوەتەوە بۆی بنێری.

پیرێژنی بێ خەبەر لە هەموو شت، شکی لێ نەکرد و نیوەی کیسە ئاڵتونی دا بە وەزیر. وەزیر ئاڵتونی هەڵگرت و ڕاست چوە کۆشکی پاشا. کۆشک پڕ بوو لە خەڵک و گوێیان دەدا بە قسەکانی ئوسیب.

وەزیر چوە کن پاشا و گوتی:

- بزانە، تۆ بڕوات بە یوسوپ کرد، لە خۆت نیزیک کردەوە، دەمێک بە بێ ئەو نابی. بەڵام ئەو پیاوێکی ناڕاستە وتۆی فریو داوە

پاشا هاواری کرد و گوتی :

- ئەگەر وایە با یوسوپ بخەنە ژێر چاوە دێری و پاشان لە سەر کورسی ریسوایی دابنێن تا بەیانی ئیعدامی بکەن.

گورج یوسوپیان گرت و بردیان لە سەر کورسی ریسوایی دایان نا. کۆڵەکەیەکی زۆر بەرزیان لە نێوەڕاستی مەیدان چەقاند. تەختە دارێکیان لە سەر کۆڵەکە قایم کرد و یوسوپیان لە سەر ئەو تەختەیە دانا.

با یوسوپ لە سەر ئەو کۆڵەکە بێ و بچین بزانین دایکی چدەکا.؟ دایکی یوسوپ چاوی لە ڕێگای یوسوپ بوو بە لام هەر نەهاتەوە. بەرەو کۆشک بە دوایدا چوو. بە مەیداندا تێدەپەڕی، گوێی لە دەنگێک بوو کە دەیگوت:« دایە وا لێرەم.» تەماشای دەور و بەرێکی خۆی کرد کەسی نە دیت و ڕۆیشت. جارێکی دیکەش بیستی کە دەڵێ:« دایە! من لێرەم تەماشای سەرەوە بکە.»

پیرێژن سەری بەرز کرد و بینی یوسوپ لە سەر کۆڵەکەیە. هاواری کرد و گوتی :

- ڕۆڵە گیان، خوا بمکوژێ، تۆ لەوێ چدەکەی؟ خاک بە سەرم، خوایە کوێر بم و تۆ بەم ڕۆژە نە بینم.

یوسوپ هاواری کرد و گوتی:« دایە ئێستا کاتی گریان نیە. زوو بچۆوە ماڵێ. هێندێ دەزوو و تەناف و هێندێ هەنگوین و مێرولەیەک بگرە و بیهێنە تا بێت بڵێم چبکەی.!

دایک بە پەلە چۆوە ماڵێ و ئەوەی یوسوپ گوتبووی ئەنجامی دا.

یوسوپ گوتی:« ئێستا تا ئەو جێیەی دەستت دەگاتێ، هەنگوین دە و

کۆڵەکە هەڵسوو. پاشان سەری دەزوو لە لاقی مێروولە ببەستە و مێروولەکە لە سەر کۆڵەکە بەرەڵا کە.» دایک ئەو کارانەی ئەنجام دا ومێروولەی بەرەڵا کرد. مێروولە بە دوای هەنگویندا چوە سەر و تا گەیشتە یوسوپ. یوسوپ دەزوی لە لاقی مێرو کردەوە. ئێستا سەرێکی دەزوو بە دەست یوسوپەوە بوو، سەرێکیشی لە خوارێ. یوسوپ بانگی دایکی کرد و گوتی :« ئێستا تەنافەکە لە سەری دەزووکە بخە.» دایک وای کرد و یوسوپ تەنافەکەی هەڵکێشا تا دەستی گەیشتە تەناف. پاشان بە دایکی گوت: تەنافەکە لە قەدی خۆت ببەستە. دایک تەنافی لە خۆ بەست و یوسوپیش سەرێکی لە قەدی خۆی بەست و تەناف دەستی بە جۆلانە وە کرد و دایکی هەڵکێشا بۆ سەر و گەیشتە سەر کۆڵەکە. ئەو دەم یوسوپ بە دایکی گوت:« دایە ! تۆ مەترسێ، ئەوانە کاریان بە تۆ نەداوە. بەڵام من دەبێ ڕابکەم، دەنا لە سێدارەم دەدەن.»

ئەوەی گوت و ڕایکرد. هەڵات تا گەیشتە شوانێک و تکای لە شوان کرد کە:« قاپە شیرێک و لەتە قامیشێکی بداتێ.»

شوان دەست بەجێ ئەوەی یوسوپ ویستبووی ئامادەی کرد. یوسوپیش لەتە قامیشی لە سەر قاپە شیرەکە دانا و لە سەری دانیشت.

با یوسوپ لە وێ دانیشێ با بزانین پاشا چدەکا. بەیانی جەلاد هاتنە مەیدان تا یوسوپی لە سەر کۆڵەکە بێننە خوار و لە داری بدەن.. دیتیان لە جیاتی یوسوپ دایکی لە وێ دانیشتوە. هێنایانە خوار و ئازادیان کرد.

پاشا حەکیم و چاو بەست و فاڵگرەوەی شاری کۆ کردنەوە وگوتی: « دەبێ دیاری بکەن کە یوسپوڵە کوێ خۆی شاردۆتەوە،

ئەوان ڕەملیان هاویشت و فاڵیان گرتەوە و گوتیان:

– یوسپوپە سەر پردێکدا لە دەریای سپی پەڕیوەتەوە.

پاشا دەستەیەکی بۆ دۆزینەوەی یوسوپ بە ڕێکرد.

با بزانین یوسوپ چی لێهات. لە ڕاستیدا یوسوپ لە وڵات نە چوو بوە دەر. لە کن پیاوێکی دەوڵەمەند کاری دەکرد. بەڵام پاشا هەر وا لە یوسوپ دەگەڕا، و نەیدەدیتەوە. پاشان هەموو دەوڵەمەندەکانی بانگ کرد و پێی گوتن:

– سبەی دەبێ هەر یەکەی بەرخێک بێنن، بەیانی هەموویان بەرخیان هێنا و ئەربابی یوسوپیش لە گەڵیان بوو. پاشا گوتی ئەو بەرخانە بکێشن و ناوی خاوەنەکانیان بنووسن. بە دەوڵەمەندەکانی گوت:

– ڕاست ساڵێکی دیکە ئەو بەرخانە بێننەوە ئێرە. وریاش بن نابێ نە کەم بکەن نە زیاد. هەر کەسێککێش بەرخەکەی زیاد بکا یا کەم، لە سێدارەی دەدەم.

ئەربابی یوسوپ بە داماوی گەڕایەوە و فیکری لە وە دەکردەوە کە :« ساڵێک زیاتر تەمەنی نە ماوە» یوسوپ هەستی کرد کە ئەربابەکەی خەمی هەیە. لێی پرسی: « ئەرباب چقەوماوە؟»

ئەرباب داستانی بۆ گێڕاوە.

یوسوپ گوتی : « خەمێ مەخۆ. من دەزانم دەبێ چبکەی. وەرە بچینە جەنگەڵ. بێچوە گورگێک بدۆزینەوە و بیگرین.»

چوون بێچوە گورگیان دیتەوە و هێنایانەوە. یوسوپ گوتی :« ئێستا بەرخ و بێچوە گورگ لە ئازەڵێکدا ببەستەوە، وابێ کە بیچوە گورگ هەمیشە لە بەر چاوی بەرخ بێ. بەرخەکە دەلەوەڕێ، زیادیش دەکا، بە لام کە چاوی بە بێچوە گورگ کەوت، لە ترسان وەک خۆی لێ دێتەوە. بەمجۆرە تا ساڵێک کێشی نە کەم دەکا و نە زیاد.

ئەرباب بە چاکی ڕاسپاردەی یوسوپی بە جێگەیاند. ڕاست لە سەری ساڵ هەموو دەوڵەمەندەکان لە کۆشکی پاشا کۆبوونەوە. کاتێ بەرخەکانیان کێشان دەر کەوت یەکێک نە بێ، ئەوانیتر هەموو کێشیان گۆڕاوە. پاشا هەمووی ڕێگا دان بچنەوە، ئەربابی یوسوپی هێشتەوە و لێی پرسی: « پێم بڵێ بزانم کێ تۆی ڕێنوێنی کردوە؟

ئەربابی یوسوپ گوتی: کرێکارێکم هەیە بە ناوی یوسوپ، ئەو فێری کردم کە چبکەم.

پاشا گوتی: « بیهێنە کن من.» ئەرباب گەڕایەوە بە یوسوپی گوت: بەیانی دەبێ بچیە کن شا.»

یوسـوپ هەر ئەو شـەوە لە مـاڵی ئەربابـی هەڵات. بەیانی چوە کن پاشـا و گوتـی:« یوسوپ ئەو شـەو ڕایکردوە.»

یوسوپ ئەوجار بۆ وڵاتێکی دیکە هەڵات و چوە کن پاشای ئەو وڵاتە. پاشا کوڕێکی هەبوو بە ناوی ئەحـمـەد. زۆری پێنەچوو پاشـا دیتی یوسـوپ لە هەمـوو کـەسـانـی دەور و بەری شـا ئاقـڵـتـر و زانا تر و تێگەیشـتـووترە. ڕۆژێـک بە کوڕەکەی گوت:

- کوڕم! لە گەڵ یوسـوپ دۆسـتـایەتی بکە و بیکە بە گەورەی چل نۆکـەری خۆت.

ئەحـمـەد قسـەی بـاوکی بردە سـەر. یوسـوپی کردە گەورەی چل نۆکـەری خۆی. ڕۆژێ یوسوپ و ئەحـمـەد چوونە ڕاو، نێچـیرێکی زۆریان ڕاو کرد بوو. لە پڕ لە نێـو جـەنگەڵ مـامزێکی جـوان دەر پەڕی. ئەحـمـەد وە دوای مـامز کەوت. مـاوەیەک لە دە شت و چیا بە دوایەوە بوو تـا مامز چوە سەر لوتکەی چیـایەک و ئەحمەدیش بە دوایدا.

کـانیـەک لە سـەر ئەم کـێـوە بوو، مـامـز بۆ لای کـانی ڕۆیشـت و بزر بوو. ئەحـمـەد تەمـاشـای دەور و بەری کرد و لە نەکـاو چاوی بە کیـژێکی جوان کـەوت وەک ڕۆژ ، ئاقڵی لە سەر دا نەما. لە کیـژەکەی پرسـی: « نـاوت چیە،؟»

کیـژەکە لە جیاتی وەڵام دەسرەیەکی نیشـان دا.

ئەحمەد دوو بارە پرسـی : « نـاوت چیە، و کچی کێـی .؟»

کیـژەکە ئامـاژەی بە کەوشـەکانی خۆی کرد.

ئەحـمـەد ئەو جـاریش لێی پـرسـی:« خـەڵکی کـام شـاری .؟» ئەمـجـارە گۆزەیەکی مسـی پێ نیشـاندا. کیـژەکە ئەوەندە جوان بوو کە ئەحمەد بێهۆش بوو لە ئەسب کەوتە خـوار. کاتێ وەهۆش هـاتەوە کـچەکەی لە کن نەمـا بوو. لەو کاتە دا یوسوپ هـاتە لای و ئەحمەد هیـچی پێ نەگوت.

لەو ڕۆژەوە ئەحمەد کز وخەمگین بوو. خـەو و ئارامـی لێبڕا. نە دەیخـوارد و نە دەیخـواردەوە. پاشـا یوسوپی بانـگ کرد و گـوتی: - بڕۆ بزانە کوڕم چی بە سەر هاتوە، یارمەتی بدە. بە زەحمەت بە ڕێگادا دەڕوا .

یوسیوپچوە کن ئەحمەد و پرسیاری لێکرد و لە روو داوی پەنا کانی ئاگادار بوو. ئەحمەد دوای گێڕانەوەی داستان گوتی:

- ئێستا جگە لەو کیژە هیچ فیکری دیکەم لە سەر دانیە. بەڵام لە کوێ بیدۆزمەوە. نازانم کچی کێیە و ناوی چیە، هیچ نازانم.

یوسوپ گوتی: « نازانم کامیانە.» کاتێکی لێت پرسی ناوت چیە، دەسرەی بە تۆ نیشان دا. کە وابوو ناوی « دەسماڵ خانمە» کاتێ لە وەڵامی پرسیاری: کچی کێی، کەوشی بە تۆ نیشان داوە، مانای وایە ناوی باوکی شیمۆ پاشایە. لە وەڵامی پرسیارت دا کە خەڵکی کام شاری، گۆزەی مسی پێ نیشان داوی، مانای وایە کە لە میسر دەژی.

ئەحمەد کەیف خۆش بوو گوتی:

- باشە. ئێستا دەیدۆزینەوە. ئەحمەد و یوسوپ خۆیان ساز کرد تا بچنە میسر و کیژەکە بدۆزنەوە. باوکی ئەحمەد ئەسب و ئاڵتونی دانێ و کەوتنە ڕێ. کاتی ڕۆژ ئاوا گەیشتنە میسر. چوونە کن پیرێژنێک و یوسوپ پێی گوت:« میوانت ناوێ.»؟

پیرێژن گوتی:« من نە جێم هەیە و نە پێخەف.» یوسوپ مستە زێرێکی دایە و گوتی :

- بچۆ بازار و بۆ خۆت و بۆ ئێمەش لیفە و دۆشەک و خواردنی خۆش بکڕە و بێنەوە.

پیرێژن پارەی وەر گرت و چوە بازار و خواردن و شتی پێویستی کڕی، هەر سێکیان تێریان خوارد و کاتێ هات بنوون یوسوپ لە پیرێژنی پرسی:« دایە گیان تۆ دەسماڵ خانمی کچی شیمۆ پاشا ناناسی.؟»

پیرێژن گوتی: « چۆن نایناسم.؟ هەمیشە دەچمە ماڵی وسەری دەشۆم وبەیانیش دەبێ بچم.

یوسوپ فرە کەیفخۆش بوو گوتی:

-بەیانی بە دەسماڵ خانم بێژە بە دوایدا هاتوون. لە تۆڵەی ئەم خزمەتە، خورجێنێک ئاڵتونت دەدەینێ.

پیرێژن شاد بوو. ڕۆژی دوایی چوه کن دەسمالّ خانم و گوتی :« کارێکم پێته.»
دەسمالّ خانم گوتی: بلّێ بزانم.
پیرێژن گوتی: « دەترسم پێت بێژم.
بەلاّم دەسمالّ خانم له ڕووداوەکه ئاگادار بوو، بۆ ئەوەی که پیرێژن له ڕازی وی ئاگادار نەبێ خۆی تووڕه کرد و ئەمری کرد له ژێر دار هەرمێ لێی دەن. پیرێژنی لێدراو به زەحمەت خۆی گەیاندەوه ماڵ و هاواری کرد:
– سەبارەت به پەیامی ئێوه دەسمالّ خانم ئەمری کرد له ژێر دار هەرمێ به قامچی لێم دەن، یالله له مالّی من وەدەر کەون.
یوسوپ هێندێ زێڕی دایه و پیرێژن هاتەوه سەر خۆ. پاشان به ئەحمەدی گوت:
– زوو به با بڕۆین. دەسمالّ خانم دێته بن دار هەرمێ، دەبێ لەوێ چاوه ڕوانی بی. یوسوپ و ئەحمەد چوونه باغی کۆشک. ئەحمەد له ژێر دار هەرمێ دانیشت. یوسوپ به ئەحمەدی گوت: « وریا به خەوت لێ نەکەوێ.»
ئەحمەد چاوه ڕوانی دەسمالّ خانم بوو ، ڕاوەستا و ئاخرەکەی خۆی ڕانەگرت و خەوی لێکەوت. دەسمالّ خانم هاته بن دار هەرمێ دیتی ئەحمەد خەوتوه. گرژ بوو مستێک مێوژی ده گیرفانی ئەحمەد کرد و ڕۆیشت. یوسوپ سەبر سەبر به دوای دەسمال خانم دا ڕۆی و به جۆرێ که نه زانێ تیتۆلّێکی له داوێنی دەسمال خانم بڕی و ده گیرفانی نا. پاشان چوو ئەحمەدی وەخەبەر هێنا و چوونەوه مالّی پیرێژنێ. یوسوپ ئەو خورجێنه ئالتونەی که بەلّێنی دابوو، دای به پیرێژنێ و سوار بوون بۆ ولاّتی خۆیان گەڕانەوه. کەمێک به ڕێگادا ڕۆیبوون، گەیشتنه ئەشکەوتێک ئەسب وئامرازی خۆیان له ئەشکەوت دا شاردەوه و به پێیان بۆ میسر گەڕانەوه. کاتێ گەیشتنه میسر چوونه مەیدانی شار و یوسیوپ دەستی کرد به هاوار کە:« دز تالاّنیان کردووین و لیباسیان له بەر دەرهێناوین. لەم شاره دا ڕێگر هەن. خەبەریان به پاشا دا و ئەمری کرد، ئەم دوو لاوه بەرنه کن وی ؛ پرسیاری لێکردن. یوسوپ گوتی : « ئێمه به

میوانی هاتینه شاری تۆ. چل نۆکەرمان هەبوو، لە نیزیک شار دەستەیەک ڕێگر پەلاماریان داین. ئەسپ و هەرچی زێڕ و پارەی هەمانبوو بردیان. لیباسەکانیان لە بەر داکەندین و پیاوەکانیان کوشت و ئێمە دوو کەس ماینەوە. من نەمتوانی ئەوان بە باشی ببینم، بەلام لە داوێنی یەکێکیان گۆیا سەرۆکی دزان بوو تیتۆڵە پەڕۆیەکم بڕیوە کە یارمەتی بە دۆزینەوەی دزەکان دەکات.

شیمۆ پاشا گوتی: یوسوپ ئەو تیتۆڵە پەڕۆیە نیشان بدات.

وەزیر لە گەڵ بینینی ئەو هاواری کرد و گوتی:« ناسیم. ئەو پارچە پەڕۆیە لە لیباسی دەسماڵ خانمێیە. هەموو سەریان سورما.

پاشا ئەمری کرد کە ئەو لیباسەی دوێنێ دەسماڵ خانم لەبەری کرد بوو بیهێنن..لیباسیان هێنا و هەموو دیتیان کە پارچەی بڕاو ڕاست لە لیباسی دەسماڵ خانمێیە.

یوسوپ بە دەنگی بەرز گوتی : « کە وابوو کچی تۆ، کیژی پاشای میسر سەرۆکی ڕێگرانە.

پاشا تەریق بۆوە و جەلادی بانگ کرد و گوتی : تا دەست بە جێ دەسماڵ خانم سزا بدەن.یوسوپ گوتی :« نا، نا، کیژەکەی بدە بە مە تا خۆمان بە سزای بگەیێنین.

پاشا دەسماڵ خانمی تەسلیمی وان کرد و فەرمووی لیباس و ئەسپی تازەیان بدەنێ و ئیزنی دان. یوسوپ و ئەحمەد کچیان هەڵگرت و بۆ وڵاتی خۆیان گەڕانەوە.

باوکی ئەحمەد بە دیداریان شاد بوو ئەمری کرد دوو بوکان بخاتە ڕێ، ئەحمەد لە گەڵ دەسماڵ خانم و بەدیلي خوشکي ئەحمەدیش لە گەڵ یوسوپ بوونە هاو سەر. پاشان هەموویان چوونە میسر و داستانیان بۆ شیمۆن پاشا گێڕایەوە. ئەوان بە ئاواتی خۆیان گەیشتن و چەنە خۆش دە بوو ئێمەش بە ئاوات گەیشتباین.

# بۆ ماسی پێکەنی ٤٨

پیاوێکی فەقیر لە گەڵ خێزانی دەژیا، ماوەیەک بوو ژن و مێرد بوون، منداڵیان نەدەبوو. کابرای فەقیر شەوێک خەونی بینی کە ساڵێکی دیکە ژنەکە منداڵێکی دەبێ. ڕاست سەری ساڵ کوڕێکی بوو ناویان نا « میرزا». کوڕێکی جوان و بە هۆش بوو.

پاشای ئەو وڵاتە کیژێکی هەبوو بە ناوی گوڵنار. گوڵنار چل خزمەتکاری هەبوو، سی و نۆ یان کچ بوون. یەکیان کوڕێک بوو کە جلی ژنانی دەکردە بەر و ئەوەندە جوان و وەکچان دەچوو کەس بۆی نە دەچوو کە ئەوە پیاوە. ئەو کوڕە مەعشوقە( یار)ی گوڵناریَ بوو، بەڵام کەس نەیدەزانی. ڕۆژێک گوڵنار بە خزمەتکارانی گوت دوو ئەسپ زین بکەن، لە گەڵ یارەکەی سوار بوو بۆ کەڕان. کەس بە خەیاڵی دانەدەهات کە گوڵنار لە گەڵ یاری بچێتە گەڕان و خولانەوە بە سەحرادا . گوڵنار شاد و بە کەیف ڕووی کردە لاوە کە و گوتی :« کێ دەتوانێ هەست بکا کە تۆ پیاوێکی گەنجی. هەموو وادەزانن تۆ خزمەتکاری منی.

گوڵنار و یارەکەی بە پەنا خانووی کابرای فەقیردا دەڕۆیشتن کە ژن و مێرد و میرزای کوڕیان لە وێدا دەژیان. باب و کوڕ خەریکی وێنجە دروونێ بوون. میرزا کە چاوی بە گوڵناریَ کەوت گوتی :

– سڵاو لە کیژی پاشا و زاوای پاشا.

گوڵنار و مەعشوقە کوی چاوێکیان لێکتر کرد و گوڵنار لە کوڕەکەی پرسی:« ناوت چیە و چەند ساڵی؟»

– ناوم میرزا یە و پێنج ساڵم. گوڵنار و یارەکە جڵەوی ئەسپانیان وەر گێڕا و ڕۆیشتن. گوڵنار هاتەوە ماڵ و لە جێگادا خۆی نەخۆش کرد و گوتی

باوکی ئاگادار بکەن. کاتێ بابی هات گوتی :

حاڵم زۆر خەرابە و دەمرم. تەنیا دەرمانی دەردم یەک شتە. لە پەنا شار پیاوێکی فەقیر دەژی. کوڕێکی پێنج ساڵەی هەیە بە ناوی میرزایە. دەبێ سەری وی ببڕن و بیکوڵێنن و من بیخۆم و چاک ببمەوە.

پاشا کیژەکەی زۆر خۆش دەویست، هەر چەند دڵی نەدەهات کوڕەکەی بکوژێ، بەڵام مردنی کیژەکەشی لا گران بوو. وەزیری بانگ کرد و خورجێنێک زێڕی دایە و گوتی:

– ئەم خورجێنە زێڕە هەڵگرە وبیدە بە کابرای فەقیر و کوڕەکەی بێنە ئێرە. وەزیر چوە ماڵی کابرای فەقیر. کابرا وەزیری لە دەرکی ماڵی خۆی دیت و پرسی : « ئەی وەزیر چ ئەمرێکت هەیە .؟»

وەزیر گوتی: « پاشا ئەم خورجێنە زێڕەی بۆ ناردووی و دەیەوێ کوڕەکەت بدەی بەو.. کابرا و خێزانی دەستیان کرد بە گریان و بەڵام دیتیان چار نیە. ئەگەر کوڕەکەیان نەدەن، پاشا بە زۆر دەیئەستێنێ. میرزا رووی کردە دایک و بابی و گوتی :

– خەمێ مەخۆن. خورجێنە زێڕ وەر گرن و وای دانێن کە هەر کوڕتان نەبوە. لە بارەی منیشەوە نیگەران مەبن و خەم مەخۆن.

وەزیر کوری سوار کرد و خورجێنە زێڕی دا بە کابرای فەقیر و ڕێگای کۆشکی گرتە بەر. لە ڕێگا دا میرزا بە وەزیری گوت:

– ئەی وەزیر گوێ بدەیە. کیژی پاشا کوشتنی منی بۆ چاک بوونەوەی خۆی ناوێت. تەنیا دەیەوێ لە شەڕی من نەجاتی بێت، گوێ بدە ئامۆژگاری من. من مەکوژە و لە ماڵی خۆت بمشارەوە. ڕۆژێک بە کارت دێم. بەڵام بۆ کیژی پاشا سەری رەفیقی من ببڕە کە ڕاست وە من دچێ و دوێنێ مردوە و ناشتوویانە. قەبرەکەی بدەوە، لاشەکەی بێنە دەر و سەری ببڕە و بیدە بە کیژی پاشا.

وەزیر ئامۆژگاری میرزای بە کار هێنا و سەری کولاوی کورەکەی دا بە کیژی پاشا و ئەویش چاک بۆوە. میرزاش لە ماڵی وەزیر دەژیا. با ئەو لە ماڵی

وەزیر بژی و گەورە بێت. داستانی کابرای ماسیگر باس دەکەین:

لەو وڵاتە ماسیگرێکی فەقیر دەژیا. ڕۆژێک ماسییەکی سەیر و جوانی گرت. لە دڵی خۆید اکوتی:« ئەو ماسییە بەرمە بازار و بیفرۆشم، قایدەی چیە. باشترە بیدەم بە وەزیر» ماسیگر وایکرد، وەزیر هەمبانەیەک زێڕی دایە. ماسیەکەی بردەوە ماڵ. میرزا پێی گوت:« ئەو ماسییە لە ماڵدا ڕامەگرە، و بیدە بە پاشا.»

وەزیر وایکرد. پاشا زۆری پێخۆشبوو. فەرمووی حەوزێکی جوان ساز بکەن و پڕی کن لە ئاوی دەریا و ماسیەکەی بخەنە ناو. ماسی لە ئاوێدا بروسکی دەدا و هەمووئاشقی ببوون و تاریفیان دەکرد. ڕۆژێ پاشا ویستی ماسیەکە بدا بە گوڵناری کچی. لەم بارەوە پرسی بە دەوروبەری خۆی کرد.. هەموو گوتیان: چۆنت گەرەکە وابکە. مەیلی خۆتە. پاشا خزمەتکارێکی ناردە کن گوڵنار و پەیامی پاشای پێکەیاند و گوتی : « پاشا دەیەوێ جوانترین ماسی بە دیاری لێ قبوڵ بکەی.»

گوڵنار لە وەڵامدا گوتی :« ئەگەر ماسی مێ بێت، قبوڵی دەکەم، بەڵام ئەگەر نێر بێ نا. چونکە لە ژووری من تەنانەت حەیوانی نێریش نابی هەبێت.

کاتێ خزمەتکار ئەو قسەی بە پاشا گوت، ماسی سەری لە ئاو هێنا دەر و پێکەنی. هەموو سەریان سور ما. پاشا لە دڵی خۆیدا گوتی :« ئەو ماستە بێ موو نیە» بە وەزیری گوت:« بڵێ بزانم، ماسی بۆ پێکەنی ؟»

وەزیر گوتی: من لە کوێ دەزانم، من غەیبگۆ نیم. پاشا بە سەریدا نەڕاندی و گوتی :

- ئەو قسانەم بە گوێ داناچێ. چل ڕۆژت مۆڵەت بێ، پاش چل ڕۆژ وەڵام نەدەیەوە لە سەرت دەدەم.

وەزیر خەمبار و داماو چۆوە ماڵ. میرزا لێی پرسی: « چقەوماوە.؟»

- پاشا لێی ویستووم کە بزانم ماسی بۆ پێکەنیوە. ئاخر من لە کوێ بزانم کە هۆی پێکەنینی ماسی چیە. چل ڕۆژی مۆڵەت داوم، ئەگەر وەڵامی نەدەمەوە لە سەرم دەدات.

میرزا گوتی : « خەمێ مەخۆ. من لە بیرمە کە چۆن منت لە مردن رزگار کرد. ئێستا نۆرەی منە تۆڵەی بکەمەوە. سواری ئەسپ بە و سی و نۆ ڕۆژ بە کەیفی خۆت بگەڕێ و کەیفێ بکە. ڕۆژی چل وەرەوە ماڵێ.

وەزیر سوار بوو ڕۆی. سی و نۆ ڕۆژ گەڕا و ڕۆژی چل هاتەوە ماڵ. میرزا گوتی: « ئێستا بچۆ کۆشک و هیچ نیگەران مەبە.

پاشا و دارو دەستەی هەموو چاوە ڕوانی وەزیر بوون و دەیانویست بزانن ماسی بۆ پێکەنیوە. پاشا کە وەزیری دیت، پرسی:

- باشە وەزیر ئێستا دەڵێی چی؟

میرزا گوتی : پاشا سلامەت بێ، ڕێگا بدە با من بڵێم ماسی بۆ پێکەنیوە ؟

پاشا گوتی : بڵێ!

- دەترسم ئەوەی دەیڵێم بە کەیفێت نە بێ و لێم توڕە بی و ئەمر بکەی لە سەرم بدەن. سەعاتێک دەسەلات و جێگای خۆت بدە بە من. تا لەو ماوەیەدا ببمە پاشا و ئەو دەم هەموو شتێکت بۆ ڕوون کەمەوە و بیڵێم.

پاشا گوتی :« زۆر باشە. سەعاتێک تەختی پاشایەتی دەدەم بە تۆ. بڵێ.

میرزا لە سەر تەخت دانیشت و گوتی: « بەر لەوەی هۆی پێکەنینی ماسی باس بکەم. داستانێکت بۆ دەگێڕمەوە، گوێ بدەیە.

ڕۆژێک بوو، ڕۆژگارێک بوو. پاشایەکی بە دەسەلات بازێکی هەبوو زۆری خۆش دەویست و قەت لە خۆی جیا نەدەکردەوە.. ڕۆژێک باز خەمبار و کز بوو، نە هیچی دەخوارد و نە دەیخواردەوە و نە خۆش کەوت. وەزیر بە پاشای گوت:« بازەکە ئازاد بکا» پاشا نەیدەویست بازی خۆشەویستی وەلا بنێ، بەلام چاریشی نەبوو. فەرمووی تا زنجیری زێری لە قاچی بکەنەوە. باز باڵی لێکدان و فڕی و ڕۆیشت. زۆری پێنە چوو کە خێزانی پاشا زۆر نەخۆش بوو. باشترین حەکیمانی شار هیچیان بۆ نەکرا. ڕۆژ بە ڕۆژ حاڵی خەرابتر دەبوو. ڕۆژێکی بازەکە لە پەنجەرەی کراوە هاتە نێو کۆشک. لە ماوەی ئازاد بوونی دا هاتبۆوە سەر خۆ و جوان ببوو. باز تا کن پاشا فڕی و دوو دەنکی لە مستی پاشا نا.

پاشا دەنکەکانی دا بە خولامی خۆی و گوتی : لە باغ بیانچێنێ. پاشان دارە سێوێک لەو دەنکانە شین بوو. دوو سێوی زێڕین دارەکەیان جوان کرد بوو. پاشا کێشکچی لە بن دارەکە دانا و فەرمووی ئاگای لە سێوەکان بێ. شەو کێشکچی خەوی بەسەر داهات و یەک لە سێوەکان کەوت. مارێک بۆ لای سێوەکە چوو گەستی. کێشکچی وەخەبەر هات، ماری دوور کردەوە و سێوەکەی هەڵگرت و بردیە کن پاشا. پاشا سێوەکەی دوو لەت کرد. نیوێکی دا بە سەگ و نیوەش بە پشیلە.. هەرتکیان لەوێ وشک هەڵاتن.

پاشا تورە بوو. بازی خۆشەویستی خۆی گرت و بە زەوی دادا و کوشتی. سێوەکەی تر لە سەر دار مایەوە. پاشا فەرمووی: - ئەو سێوە بدەن بە ژنەکەم تا بیخوا و لە ئازار نەجاتی بێت. ئەو نە زیندوە و نە دەمرێ. سێویان بۆ ژنی پاشا برد. کە لەتێکی خوارد، دەست بەجێ ساخ بۆوە وجوانتر لە جاران. ئەو دەم پاشا زانی کە بە خۆڕایی بازی کوشتوە. زۆر پەشیمان بۆوە بەڵام تازە درنگ بوو پەشیوانی فایدەی نەبوو. تۆش ئەی پاشا لە وەی کە دەپرسی ماسی بۆ چی پێکەنیوە، پەشیوان دەبیەوە. باشترە لەوە نەکۆڵیەوە.

پاشا پێی داگرت کە هۆی پێکەنینی ماسی بزانێ.

میرزا ئاخرەکەی گوتی :« ئێستا کە خۆت دەتەوێ بزانی، داستانت بۆ باس دەکەم. کیژەکەت و چل خزمەتکارەکەی بانک کە بێنە ئێرە.» گوڵنار و چل خزمەتکاری هاتن. میرزا گوتی دەرگاکان داخەن. پاشان گوتی :

- کێردێکی زۆر خۆشەویستیان لە من دزیوە. دەبێ هەموتان بگەڕێم. ڕووت بنەوە. سی و نۆ خزمەتکار لیباسیان دەر هێنا، بەڵام یەکیان لە جێ نە بزوت. گوڵنار بە پاڕانەوە گوتی:

- تکا دەکەم کارتان بەوە نەبێ، ئەوەندە بە شەرم و حەیایە تەنانەت کاتی خەویش لیباس داناکەنێ.

میرزا وازی نە هێنا و گوتی : نا. دەبێ ئەویش بگەڕێم. بە زۆر ئەویشیان ڕووت کردەوە و دیتیان کە پیاوێکی گەنجە. پاشا و ئامادە بوان واقیان وڕ ما.

سەعاتی پاشایەتی میرزا کۆتایی هات. پاشا جارێکی دیکەش هاتەوە

سەر تەخت و فەرمووی کوڵناری کچی و ماشوقەکەی بەراو پشت سواری کەر بکەن و بە کۆڵانی شار دا بیانگێڕن و ریسوایان بکەن و پاشان لە وڵات شار بەدەریان بکەن. هێشتا بە سواری کەر دەڕۆن. پاشا میرزای کردە وەکیلی خۆی. میرزاش دایک و بابی فەقیری هێنا کۆشک و تا ئاخری ژیان بە خۆشی ڕۆژیان بردە سەر.

## دوو دەستە برا ٤٩

دوو دەستــە برا بوون، یەکیـان عەلی و ئەویتریان عـمرۆ. یەکتــریان زۆر خۆشدەویست. هەر یەک لە گوندێک دەژیان. عەلی ژنی هەبوو، عـمرۆ هێشتا سەڵت و ڕەبەن بوو. ڕۆژێک عـمرۆ ویستی بچی سەرێکی عەلی بدا. نەیدەزانی عـەلی ژنی هێناوە. عـمـرۆ چوە مـاڵی عـەلـی و کیـژێکی جـوانی لە وێ بینی. لە دەستە براکەی پرسی:« ئەو کیژە کێیە ؟»

عەلی شەرمی کرد بڵێ خێزانمە. گوتی :« ئامۆزامە »

– ئێستا کە ئامۆزاتە بیدە بە من.

عـەلی گوتی : « باشە. چ قـەیدیە، بیـهێنـە .» ژنی عـەلی هـیچی نە گـوت وعمرۆی خۆش ویستبوو، بە دڵ پێی خۆش بوو کە دەبێتە ژنی عمرۆ.

عەلی گوتی :« بە شەرتێک دەتدەمێ منداڵی دووەمتان ئەگەر کچ بێ بیدەی بەمن.»

عـمرۆ ڕازی بوو، چەند ڕۆژان میـوانـی دەستـە برای بوو، پاشـان ژنی دوا ڕۆژی هەڵگرت و گەڕایەوە. زەمـاوەندێکی خۆشی سـاز کرد و عـمرۆ و ژنەکەی ژیانێکی خۆشیان دەستپێکرد. پاش سـاڵێک ژنەکەی کچێکی بوو. سـاڵێکی دیکەش کـچێکی دیکە. عـەلی لەم ڕووداوە ئاگـادار بوو، چوە کن دەستـە براکەی وگوتی :« باشـە. ئێستا بەڵێنی خۆت بەرە سـەر و کچەکەتم بدەیە.»

عمرۆ گوتی : چونکە بەڵێنم داوە، کچەکە هەڵگرە و برۆ».

عەلی کیژەکەی هەڵگرت بردیە سەر چیایەکی بەرز و بڕیاری دا تەنیا دوور لە خەڵک بژی. لە سەر چیـا خانوێکی بۆ خۆی سـاز کرد و لە گەڵ کیژەکە لە وێ دەژیا. ڕۆژانە دەچوە ڕاو، مـامز یا گا کێویەکی ڕاو دەکرد و شـەو دەهـاتەوە ماڵ

و چێشتی لێ دەنا و خواردنی دەدا بە کیژەکە. ئەمە ژیانی ئەوان بوو.

بەڵێ ، هیلاکتان نەکەم. کیژ گەورە بوو عەلی مارەی کرد. یەکتریان خۆش دەویست و ژیانێکی بەختەوەرانەیان هەبوو.

ڕۆژێ کوڕی پاشای ئەم وڵاتە لە وێ خەریکی ڕاو بوو. چوە سەر چیا و خانوێکی لە وێ چاو پێکەوت. کوڕی پاشا پێی سەیر بوو، بە خۆی گوت:« سەیرە چ دەبینم؟ لە پێشدا ئێرە خانووی لێ نەبوو. بۆ لای دەرگای خانوەکە چوو، دیتی کیژێکی جوان، وەک ڕۆژ لە ژوورێ دانیشتوە. کوڕی پاشا ئاشقی بوو، ئاقڵی لە سەر دا نەما. هاتەوە ماڵ و هەموو پیرێژنی شاری کۆ کردەوە و گوتی : کامەتان دەتوانن من و ئەو کیژە بگەیێننە یەک کە دیدارێکمان هەبێ.

یەک لە پیرێژنەکان داو تەڵەب بوو گوتی :« ئەم کارە بە من بسپێرە، هەموو شت ساز دەکەم .

کوڕی پاشا خۆشحاڵ بوو، مستێک زێڕی دایە و چاوە ڕوان ما. پیرێژن چوە سەر چیا و لە خانوو وەنیزیک کەوت و خۆی لە فەقیری و غەریبی دا و دەستی بە گریان کرد. ژنی عەلی هاتە دەر و پرسی:« لێرە چ دەکەی ؟»

– ئەی کیژم ئێمە چەند کەس بووین دەچووینە زیارەت، من لە هاورێکانم بە جێ ماوم ڕێگام بزر کردوە. پەنام دەیە تا هاورێکانم دێنەوە ئێرە.

ژنی عەلی بە پیرێژنی گوت: « من جێگام نیە و لێرە برۆ خوات لە گەڵ. پیرێژن چوە دەر و لە سەر جادە دانیشت تا عەلی بێتەوە. کە لە دوورەوە ئەوی دیت، دەستی کرد بە گریان.

عەلی دیتی پیرێژنێ لە قەراخ ڕێگا دانیشتوە و دەگری. بەزەیی پێدا هات و لێی پرسی:« بۆ لێرە دانیشتووی ؟»

پیرێژن بە سکاڵاوە گوتی :« لە هاورێیانی خۆم بە جێ ماوم و ڕێگام بزر کردوە. تکام کرد لە ماڵی تۆ بمێنمەوە، ژنەکەت دری کردم.

عەلی گوتی:« وەرە بچینە ماڵی مە و تا دەتەوێ لەوێ بمێنەوە.» پێکەوە چوونە ماڵ و عەلی بە ژنەکەی گوت:

– ئەو ژنە پیرە، تەنیا و غەریبە، بچێتە کوێ ؟پیاو بەزەیی پیدا دێت،

لێگەڕێ تا ڕەفیقەکانی دێنەوە با لێرە بێ.»

ژن گوتی: «ئێستا کە تۆ خۆت دەتەوێ، با بمێنێتەوە. پیرێژن وەک فرفرە دەتگوت کچێکی چاردە ساڵەیە دەستی بە کار کرد و ماڵی هەڵدەوێژارد و هەموو کاری ماڵی دەکرد. چەند ڕۆژ پێچوو پیرێژن بە ژنی عەلی گوت:

– کچم ! حەیف بۆ تۆ، بەزەییم پێت دادێ، بەو جوانیەت لە م چۆل و هۆلە دوور لە خەڵک دەژی. تۆ بۆیە دەبی ژنی کوڕی پاشا بی.

– چ شتێکی کوڕی پاشا لە مێردی من باشترە؟

پیرێژن گوتی : ئەو قسانە چیە، بۆ خاتری خوا. ئاخر ئەگەر ژنی کوڕی پاشا بی لە سەر دۆشەک دادەنیشی، و خزمەتکار لە بەر دەستت ڕادەوەستن.

زێنەب( ناوی ژنی عەلی زێنەب بوو) فیکری کردەوە و گوتی : «باشە. کوڕی پاشا بێنە ئێرە بزانم خۆشم دەوێ یان نا!»

پیرێژن لە خۆشییان بە غار چوە کن کوڕی پاشا و گوتی : «کارەکەم ساز کردوە، ئێستا دەتوانی بچیە کن کیژەکە.»

کوڕی پاشا چوە کن زێنەب و هەر تک ئاشقی یەکتر بوون.

عەلی فەقیر بێ خەبەر لە هەموو شت، شەو هاتەوە ماڵ. نانیان خوارد. عەلی ڕاکشا کە بحسێتەوە. لە پڕ دیتی یەک لە تیرەکانی لە بەری میچی دراوە و هەڵاوەسراوە. عەلی لە بەر خۆیەوە گوتی : «سەیرە. من تیرم نە هاویشتۆتە میچ. ژنیش ئەم توانایەی نیە. بێگومان پیاوێک ئەو کارەی کردوە» ژنەکەی بانگ کرد و تیرێکی دایە وگوتی :

– یاڵا، تاقی کەوە بزانم دەتوانی ئەو تیرە وا باوێی لە بەری میچی بچێتە خوار.؟

زێنەب تیرەکە وەر گرت و هاویشتی. بەڵام نیوەش نەڕۆی. عەلی پیرێژنی بانگ کرد و گوتی: تۆ تیرەکە باوێ. ئەویش نەیتوانی.

عەلی هیچی نەکوت و لە دڵدا کوتی :« کە وابوو پیاوێک تیری هاویشتوە. پاشان چوە سەر جێ و تەواوی شەو خەوی لێ نەکەوت.

ڕۆژی دوایی عەلی بە دڵێکی داخدارەوە چوە ڕاوێ. ئەوێ ڕۆژێ هیچی

ڕاو نەکــرد. لە بن دارێک دانیــشت و چوو دە فــیکرەوە. لە نەکــاو دیتــی لەو نیزیکانە کچێک و کوڕێک لە قەراخ جۆگەلەیەک دانیشتوون و یەکتر ماچ دەکەن و لە ئامێز دەگرن. دیارە یەکتریان خۆش دەوێ. هیچیان ئاوڕیان وە عەلی نەدا. کیژەکە دانیشــتبوو، لاوەکە ڕاکشا و سەری لە سەر ئەژنۆی کیژەکە دانا و خەوی لێکەوت. کیژەکە لە سەر خۆ سەری لە سەر زەوی دانا و هەستا کەمێک لەولا تر دەستی دە باخەڵی ڕاکرد و سێوێکی هێنا دەر. سێوەکەی ماچ کرد و سێو بوو بە لاوێکی جوان . پاشان کچەکە بە کەیفی خۆی لە گەڵ لاوەکە دەستی بە کەیف و ماچ و بەزم کرد. پاشان کردیەوە بە سێو و دە باخەڵی ناوە.
پاش کەمێک لاوی نوستووی وەخەبەر هێنا و گوتی :

– خۆشەویستم هەستە. ڕۆژ ئاوایە، دەبێ بچینەوە.

عەلی هەموو ئەوانەی دیت. پاشان چوە لایان و سڵاوی کرد و گوتی:« تکا دەکەم ئیمشەو میوانی من بن.»

چوونە ماڵی عەلی. زێنەب سفرەی داخست و پێنج دەوری دانا. عەلی چاوێکی لە سفرە کرد و گوتی:« دەوری شەشەمیش بێنە»

زێنەب گوتی : « چیتە. شێت بووی؟ دەوری شەشەمت بۆ کێیە ؟

عەلی دەنگی دا و گوتی : « کاتێ دەڵێم بێنە، بێنە.» زێنەب دەورییەکی دیکەی هێنا و لە سەر سفرەی دانا.

پاشان عەلی رووی کردە کیژەکەی کە تازە لە گەڵ خۆی هێنا بوو گوتی :« ئەو کەسەی ئەم دەوریەمان بۆ داناوە، بیهێنە .»

کچەکە بە سەر سور مانەوە گوتی :« لە کوێ بێنم ؟»

عەلی گوتی : بیهێنە. ئەگەر نەیهێنی، سەرت دەبڕم.!

کچ ترسا و دەستی دە باخەڵی ڕاکرد و سێوێکی هێنا دەر و ماچی کرد و سێو بوو بە لاوێکی جوان. کیژەکە لە پەنا خۆی دانا.

عەلی ئەمجار بانگی ژنەکەی کرد و گوتی:« دەورییەکی دیکەش بێنە.

ژن پرسی: چیت لێقەوماوە، ئیمڕۆ دەڵێی شێت بووی.

عەلی بە سەریدا گوراندی و گوتی : قسان مەکە. زوو دەورییەکی دیکەش

بێنه.

زێنەب دەورییەكی دیكەی لە سەر سفرە دانا. عەلی بە ژنەكەی گوت:« باشە. ئێستا ئەو كەسەی ئەو دەوریەت بۆ دانا، بیهێنە،

ژنی عەلی دەستی بە گریان كرد و گوتی : « لە كوێ بێنم.؟»

عەلی هەڵیكێشا شیر و گوتی. بە قسەم نەكەی لەت و پەتت دەكەم.

زێنەب چوە ساردا و وكوڕی پاشای لە وێ هێنا دەر. عەلی هەستا و دەرگای داخست و شیری دەست دایە. سەری هەموانی بڕی:

- ژنەكەی و ماشوقەكەی و پیرێژن و كچەكەی تر و ماشوقەكەی- تەنیا ئەو لاوەی هێشتەوە كە لە پەنا جۆكەلە خەوی لێ كەوتبوو.

دەر كەوت كە ئەو مێردی كچەكە بوو كە سێوی دە باخەڵی دابوو.

عەلی رووی كردە لاوەكە و گوتی :« خۆشەویستم، هەر چی لەو ماڵە دایە هەمووی هی تۆیە. من ئیتر نامەوێ لێرە بژیم. دەڕۆم و بە تەنیا دەژیم و ئیتر ژنیش ناهێنم.

عەلی ڕۆی. ماوەیەكی زۆر لەم دنیا پان و بەرینەدا خەریكی سەیر و سوڕانەوە بوو. چوە شارێک، دیتی خانوێكی ڕەش ڕەش لە وێیە. عەلی خانووی تەماشا كرد. لە ئەسب دابەزی و چوە نیزیک خانوەكە. لەو كاتە دا ژنێكی جوان لە خانوەكە هاتە دەر و پێشوازی لە عەلی كرد . ژنەكەش تەواو ڕەش پۆش بوو. بە عەلی گوت: « لاو بە دوای مندا وەرە!»

عەلی وەدوای كەوت تەماشای كرد هەموو شتێكی ئەو ماڵە ڕەشە لەو ژنەش زیاتر كەسی دیكەی تێدا نیە. ژن خواردنی هێنا لە پێش عەلی دانا . عەلی گوتی :« تا حیكایەتی خۆتم بۆ نەگێڕیەوە دەست لە خواردن نادەم.»

ژن گوتی :« دانیشە و بخۆ. داستانی خەم و تازیەی من بە كاری چی تۆ دێت؟»

عەلی پێی داگرت و گوتی:« تا بۆم باس نەكەی دەست لە خواردن نادەم. » ژنەكە دیتی عەلی بە ڕاستی دەس بۆ خواردن نابات، دەستی پێكرد و گوتی : « گوێ بدەیە! دەزگیرانێكم هەبوو زۆر یەكترمان خۆش دەویست. شاییمان كرد،

منی بردە ماڵی خۆی، هەر تک سوێندمان خوارد کە ئەگەر ئەو بمرێ من قەت شوو نەکەم و ئەگەر منیش بمرم ئەو قەت ژن نەهێنێ. ڕۆژی دوای بوکێنیم مێردەکەم مرد. ئێستا حەوت ساڵە من بە تاقی تەنیا دەژیم.»

پاشان ژن لە عەلی پرسی:

- باشە، ئێستا تۆ سەر بردەی خوت بگێرەوە بزانم وەدوای چی کەوتووی.؟

عەلی گوتی : « دەردی من لە هی تۆ سەخت ترە.» پاشان دەستی پێکرد لە نوکەوە داستانی خۆی بۆ گێڕاوە.

ژن گوتی: ڕاست دەکەی دەردی تۆ سەخت ترە.

عەلی کەوتە فیکر و سەیری ژنەکەی کرد و لە دڵدا بریاری دا کە :« وەرە ئەو ژنە بێنە». عەلی بە ژنەکەی گوت:

- خۆشە ویستم گوێ بدەیە! من و تۆ هەرتکمان سوێندمان خواردوە و شەرتمان کردوە کە نەبینە هاو سەر. وەرە هەرتکمان سوێندەکە بشکێنین و ببینە ژن و مێرد. گوڵێ کە ناوی ژنەکە بوو، ڕازی بوو. چوونە سەر جێ و پێکەوە نوستن. عەلی بەیانی هەستا و لە کارەکەی خۆی پەشیوان بۆوە. بە گوڵێی گوت:« خوا حافیز و من لێرە ڕۆیشتم.»

گوڵێ گوتی : « ئەوە کارێکی باش نیە، بۆ کوێ دەڕۆی؟» هەر چەندی خواهیشتی کرد، فایدەی نەبوو. نەمایەوە.

گوڵێ گوتی : « ئێستا کە هەر دەڕۆی. ئەوەی لەو ماڵە دایە حەلاڵی منی کە.»

عەلی پێی سەیر بوو گوتی :« چی حەلاڵی تۆ بکەم. هەموو ماڵی خۆتە. من هیچ شتێکم نە هێناوەتە ئێرە.»

گوڵێ گوتی:« پاش ئەوەی شەوێک لە گەڵ من نوستووی، هەموو شتی ئەو ماڵە بۆتە هی تۆ.»

عەلی گوتی : « باشە. هەموو ماڵ و ئاژەلی ئەو ماڵەت حەلاڵ بێ.»

سێ هەنار لە ژوورەکەی گوڵێ بوو، عەلی ئەواتی نە بینی بوو ناوی نە برد

بوون. بەم پێیە عەلی ئەو سێ هەنارەی حەڵاڵ نە کرد بوو. عەلی خوا حافیزی کرد و کەوتە ڕێ.

بەڵام گوڵێ! هەر ئەو شەوە منداڵی وەسگی کەوتبوو. شەوێک لە خەو هەستا و ئیشتیای چوە ترشی. خزمەتکارەکەی گەڕا هیچی نە دیتەوە. پاشان هەناری بیر کەوتەوە، گوتی: «ئێستا هەنارت بۆ دێنم.»

گوڵێ گوتی «نابێ، عەلی ئەو هەنارانەی لە من حەڵاڵ نە کردوە. ناتوانم بیانخۆم. خزمەتکار فیکرێکی کردەوە و گوتی:

– کە وابوو کارێکی دیکە دەکەین. یەک لەو هەنارانە کون دەکەین تۆ بیمژە. بەمجۆرە هەم هەنارەکە لەت نەکراوە و ساخە، هەمیش تۆترشێت مژتوە. وایان کرد. پاش نۆ مانگ و نۆ ڕۆژ گوڵێ کوڕێکی بوو.

با گوڵێ و کوڕی لە وێ بن، بزانین عەلی چدەکات. ئەو حەوت ساڵ گەڕا و ئاخرەکەی بڕیاری دا بچێتەوە کن گوڵێ. لە ماڵەکەی ئیزیک بۆوە دیتی گوڵی لە باڵەخانە وێستاوە و تەماشای جادە دەکات. گوڵێ عەلی بینی کەیف خۆش بوو، چوە پێشوازی، ئەسبی لێ وەر گرت و بردیە تەویلە و عەلی بردە ژوور وخواردنی دایە و جێی بۆ چاک کرد. عەلێ کوڕێکی لە ماڵەکەی بینی و پرسی:

– ئەو کوڕی کێیە ؟

گوڵێ گوتی: «کوڕی تۆیە. عەلی تەماشای کرد بە ڕاستی زۆر لەو دەکات، هیچی نەگوت. چوو درێژ بوو، بەڵام ژنەکەی ڕێ نەدا بچێتە لای. گوڵێ پرسی: «بۆ ناهێڵی بێم لە گەڵ تۆ بخەوم ؟

عەلی گوتی: «تا دڵنیا نە بم کە ئەوە کوڕی منە، لە کەڵت نانووم. هەر چەند بە ڕواڵەت لە من دەکا، بەڵام هیچ لە ئەخلاقی نازانم. ئەگەر ڕەفتار و کردەوەشی وەک من بێ، دیارە کوڕی منە.

عەلی بەیانی لە خەو هەستا و کوڕەکەی لە گەڵ خۆی بردە ناو شار. سەریان لە دوکان و بازار دا، کوڕەکە دەستی بۆ هیچ شتێ نە برد و داوای هیچ شتێکیشی لە بابی نە کرد. عەلی لە دڵی خۆیدا گوتی: «بەڵێ، لە باری ئەخلاقیشەوە لە من دەکا.» چوونە بازار، کوڕەکە دەستی لە هیچ میوەیەک نەدا،

داوای هیچ شتی له باوکی نه‌کرد. عه‌لی ئه‌مجاریش بیری کرده‌وه‌که» به ڕاستی کوڕی منه»

بۆ ماڵ گه‌ڕانه‌وه. دیتیان کابرایه‌کی دیهاتی مه‌شکه‌یه‌کی شه‌راب به پشتیوه‌یه له پێش ئه‌واندا ده‌ڕوا. له پڕ کوڕه‌که سه‌یری زه‌وی کرد و له شتێک ده‌گه‌ڕا. بزمارێکی دیته‌وه، هه‌ڵیگرت و ده مه‌شکه‌ی کابرای ڕاکرد و شه‌ڕابه‌که‌ی لێ ڕژا. عه‌لی وشک بوو. گوتی:

« نا ئه‌وه کوڕی من نیه » که‌یشتنه‌وه ماڵ و به ژنه‌که‌ی گوت:

– کوڕه‌که له هه‌موو بارێکه‌وه چاک ده‌ر چوو. به‌ڵام کارێکی منی په‌ڕێشان کرد. ڕوو داوه‌که‌ی بۆ گوڵێ گێڕایه‌وه. گوڵێ گوتی:

ده‌زانم کوڕه‌که‌مان بۆ وای کردوه. له بیرته کاتێ هه‌موو ماڵه‌که‌ت له من حه‌لاڵ کرد، سێ هه‌نار له زه‌وی که‌وتبوون تۆ ئه‌وانت نه دیبوو، شه‌وێک ترشیم ده‌ویست، ئه‌موێرا ده‌ست له هه‌ناره‌کان بده‌م. ته‌نیا کونم کرد و مژتم. من به تۆم گوتبوو هه‌موو شته‌کان ناو به‌ره، به‌ڵام تۆ گوتت: من هیچم نه هێناوه‌ته ئێره. ئه‌وه‌یه له کوڕه‌که‌ت دا ده‌ر که‌وتوه. عه‌لی بڕوای به قسه‌ی گوڵێ کرد و هه‌ر سێکیان به خۆشی و شادی ژیانیان برده سه‌ر.

## میرزا مەحمود و هەزاران بلبل ٥٠

شەوێکیان پاشا و وەزیر بە لیباسی گۆڕاو لە نێو شاردا دەگەڕان. بە ژێر پەنجەرەی ماڵێکدا تێدەپەڕین گوێیان لە دەنگی سێ کچ بوو کە پێکەوە قسەیان دەکرد. کیژەکان سێ خوشک بوون. پاشا و وەزیر ڕاوەستان و گوێچکەیان هەڵخست کە ئەوان دەڵێن چی.

یەکەمیان دەیگوت: « ئەگەر پاشا بمهێنێ، لە خۆشیان وەک باڵندە لە حەوا دەفڕم.»

دووەمی دەیگوت:« ئەگەر پاشا بمهێنێ خواردنی وا خۆشی بۆ ساز دەکەم قامکی خۆی پێوە بخوا.»

سێیەمی دەیگوت:« ئەگەر پاشا بمهێنێ کوڕێکی کاکۆڵ زێڕ و کچێکی موو زەردی بۆ دێنم»

پاشا بە وەزیری گوت:« بیستت ئەوانە چییان گوت؟» هەر سبەی ئەمر دەکەم هەر سێکان بێننە کۆشک. بەیانی هەر سێ کیژیان هێنانە کن پاشا و هەر سێکی مارە کردن. شەوی هەوەڵ چوە کن ژنی یەکەم و شەوی دووەم کن ژنی دووەم و شەوی سێیەم چوە کن ژنی چووکتر و لێی پرسی:« لە سەر بەڵێنی خۆت ماوی؟»

ژنەکە گوتی: « دیارە لە سەر بەڵێنی خۆم ماوم نۆ مانگ و نۆ ڕۆژ و نۆ سەعاتان ڕاوەستە، تا ببینی. لە ڕاستیشدا لە کاتی خۆیدا ژنی گچکە دوو منداڵی بوون، کوڕ و کچ کە هەر تک موو زەرد بوون.

خوشکە گەورەکان دژی خوشکی چوکیان فیکری خەرابیان بۆ هات. پیرێژنێکیان ناردە لای و پێیان گوت: بە نهێنی منداڵەکان بدزێ و دوو گجولە

سەگان لە جێی وان دابنێ. پیرێژن وایکرد. کوڕ و کچەکەیان دە سندوقێ نا و خستیانە دەریاوە.

خەبەریان بە پاشا دا کە« ژنت دوو توڵە سەگی بوە» پاشا بە نۆکەرانی گوت:« ژنەکەم لە گەڵ گجولە سەگان لە دەروازەی کۆشک لە کۆڵەکە ببەستن و هەر کەس بەوێدا تێپەڕێ لێیان بدا . لە جیاتی خواردنیش پاشماوەی خواردن و ئێسکیان دە پێش کەن.»

با ئەوان لە جێی خۆیان بن، بزانین سندوقەکە چی بە سەر هات. شەپۆلی دەریا سندوقەکەی برد و تا کەوتە داوی ماسیگرێک. ماسیگر تۆڕی لە ئاو هێنا دەر و دیتی سندوقێکی گەورەی تێدایە. زۆر خۆشحاڵ بوو لە دڵدا بیری کردەوە کە :« بێگومان لە پاپۆرەوە کەوتۆتە دەریا. خوا دەزانێ چی تێدایە. لە وانەیە پڕ بێ لە ئاڵتون و جەواهێرات.»

سندوقی بردەوە ماڵ و بە ژنی پیری خۆی گوت:« بزانە لە دەریا چیم گرتوە »

سندوقیان کردەوە و دیتیان کوڕ و کچێکی تازە لە دایک بوو لە شەمەدێکی سپیدا نوستوون.– هەر تک موو زەرد – توکی سەریان دەدرەوشا. پیرێژن شاد بوو، بە مێردەکەی گوت: « ئێمە چیمان لە خوا دەخواست؟ کوڕێک و کیژێک. ئیمڕۆ خودا ئاواتی ئێمەی بە جێ هێناوە. کوڕ و کچێکی بۆ ناردووین، کە هەر تکیان موو زەردن.

منداڵەکانیان ڕاگرت و ئاگاداریان کردن تا گەورە بون. کوڕەکەیان ناو نا میرزا مەحمود و کیژەکەش گوڵیزار.

چەند ساڵ بێچوو. منداڵەکان گەورە بوون. ڕۆژێک پیرە مێردی ماسیگر میرزا مەحمودی بانگ کرد و گوتی :

– ئەی میرزا مەحمود، ئێمە پیر بووین زۆری نەماوە بمرین. کاتێ من مردم تۆ ناتوانی لێرە بژی. ئەو دار دەستەی من کە لە پەنا وەتاغە هەڵیدەگری و بە هەموو تواناوە بەرەو ئەم چیایە فڕێی دەدەی، لە هەر شوێنێ بکەوێتە عەردی لەو شوێنە کۆشکێکی جوان پەیدا دەبێ. تۆ و گوڵزار بچن لەو کۆشکە بژین.

بەلام دار دەستەکە ڕابگرە، هەر جارەی بچیە ڕاو. بە کارت دێت.

کاتی پیرەمێرد و پیرێژن مردن، میرزا مەحمود دار دەستی هەلگرت و بە هەموو تواناوە بەرەو چیا هەلیداشت. پاشان تەواوی شرە وبڕەی خۆی کۆ کردەوە و لە کەل گولیزار چوە سەر چیا. تەماشای کرد بە ڕاستی کۆشکێکی جوان لەوێ ئامادەیە. میرزا مەحمود و گولزار لەوێ نیشتە جێ بوون. میرزا مەحمود هەموو ڕۆژێ بەیانی دەچوە ڕاو، مامزێک و گا کێوییەکی ڕاو دەکرد و ئێوارە دەهاتەوە مالێ و ئاوا ڕۆژی دەبردە سەر.

ڕۆژێکیان کە میرزا مەحمود خەریکی ڕاو بوو، سوارێکی بینی کە بە غار وەدوای گاکێوییەک کەوتوە و نایگاتێ. میرزا مەحمود دار دەستی پێدا دا و کوشتی. هەلیگرت و بردیەوە مال. سوارەکە پێی سەیر بوو. ئەو کە سوار بوو نەیتوانی بیگاتێ، کوڕێکی پیادە ئەو حەیوانە ڕاو دەکا.

ئەو سوارە پاشا خۆی بوو. ئەو چەندە نارەحەت بوو، بەلام نەیدەزانی بۆ چی کوڕەکەی خۆش ویستوە، ئێوارە پاشا بە خەمگینی گەڕایەوە. وەزیر لێی پرسی: « قیبلەی عالەم بۆ چی وا خەمبارە؟

– ئیمڕۆ بە دوای گاکێویەکدا ئەسپم غار دەدا و هەر چی کردم نەی گەیشتمێ. لە نەکاو کوڕێک پەیدا بوو، گا کێوی ڕاو کرد و بردی. من بە سواری نەیدەگەیشتمێ، ئەو بە پێیان گەیشتێ. بەلام ئەی وەزیر، باوەڕ کە خۆشەویستی ئەو کوڕە کەوتە دلم و وەک کوڕی خۆم خۆشم ویست.

هەر تک ژنی پاشا بە نهێنی ئەم قسانەیان بیست و هەستیان کرد کە مندالەکان زیندوون. هەمان پیرێژنیان بانگ کرد و گوتیان: بچێ مندالەکان بدۆزێتەوە و بیان کوژێ. پیرێژن کەوتە ڕێ، کۆشکی میرزا مەحمود و گولیزاری دیتەوە. لە سەر ڕێی میرزا مەحمودی دانیشت و چاوە ڕوان بوو. تەماشای کرد میرزا مەحمودی لە دوورەوە دێت، چوە پێشی و دەستی بە گریان کرد و گوتی:

– من غەریبم وتەنیا ماومەوە. کەسم نیە. من بەرە مالی خۆت، تا ببمە خزمەتکاری تۆ و گولزار.

میرزا مەحمود بەزەیی پێدا هات و بردیەوە مالێ. گولیزار کە پیرێژنی

دیت ، گوتی :« ئەم جالجالۆکە پیرەت بۆ هێناوەتەوە، فەڕی خەرابە.» میرزا مەحمود گوتی:« پیاو بەزەیی پێدا دێت، ئاخر ئەویش ئینسانە. یارمەتیت دەکا. کاتێ من دەچمە ڕاوێ، تۆ بە تەنیا نابی. تۆ بە تەنیا لەو ماڵە دڵتەنگ دەبی.»

گولیزار ڕازی بوو. پیرێژن لە ماڵی واندا مایەوە. بە چالاکی هەموو کاری ماڵێی ئەنجام دەدا. میرزا مەحمود بە گولیزاری گوت:

- بزانە چەند باش بوو، کەمێک دەحەسێیەوە.. گولیزار لە گەڵ پیرێژن ڕاهات و بوو بە دۆستی. پیرێژنیش هەستی بەوە کرد و ڕۆژێک بە گوڵیزاری گوت:« داوا لە میرزا مەحمودی برات بکە« زەرد خەبەر»ت بۆ بێنێ. « زەرد خەبەر » کیژیکی جوانە و هاو تەمەنی تۆیە. لە گەڵ ئەو ڕۆژگاری خۆش ڕادەبوێری. من کە ناتوانم هەمیشە لای تۆ بم، دەبێ بچمەوە کن منداڵەکانم.»

پیرێژن ئەو قسانەی کرد و ماڵاوایی خواست و ڕۆی. میرزا مەحمود ئێوارە گەڕایەوە و دیتی گوڵیزار تەنیا دانیشتوە و خەمگینە و دەگری. پیرێژنیش لە ماڵێ نیە. میرزا مەحمود پرسی :

- گولیزار پیرێژن لە کوێیە؟ بۆ دەگری ؟

گولیزار گوتی: « پیرێژن لە ماڵی ئێمە ڕۆیشت و چۆوە ماڵی خۆی.»

میرزا مەحمود گوتی :« قەی ناکا. تۆ بە تەنیاش دەتوانی بژی.» گولیزار گوتی : « نا ناتوانم بە تەنیا بمێنمەوە. بڕۆ « زەرد خەبەر» م بۆ بێنە» میرزا مەحمود فیکری کرد کە بێگومان پیرێژنی جادوو گەر ئەم قسەی فێر کردوە. پاشان هەناسێکی هەڵکێشا و گوتی :

- باشە، نانی ڕێگام بۆ ساز کە تا بچم « زەرد خەبەر» بدۆزمەوە. بەیانی زوو نان و خواردنی ڕێگای هەڵگرت و خوا حافیزی لە گولیزار کرد و وەدوای « زەرد خەبەر » کەوت. ڕۆی ڕۆی تا گەیشتە چوار ڕێیانێک. میرزا مەحمود ڕاوەستا و نەیدەزانی بە کام ڕێدا بڕوا. دیتی پیرەمێردێک بۆ لای دێت. پیرە مێرد گوتی :

- ئەی میرزا مەحمودی برای گولیزار، سڵاو. بێگومان ئەو پیرێژنە ئاقڵی خوشکتی دزیوە و تۆشی ئاوا سەرگەردانی جیهان کردوە.

- بابە گیان! چبکەم. دەچم « زەردخەبەر » پەیدا بکەم.

- ڕۆڵە گیان گوێ بدە قسەکانی من و مەڕۆ. بەڵام ئەگەر هەر لە سەر ئەم بڕیارە پێ دادەگری، بچۆ سەر لوتکەی ئەو چیایە، باخێکی جوان دەبینی و گوڵی ڕەنگاو ڕەنگ لە ویدا شین بوون. لەو باخەدا کۆشکێکی سپی و جوان هەیە، بچۆ ناو کۆشک. پیرێژنێکی دەبینی، دانیشتوە و پرچی بڵاو کردوون. مەمکی ڕاستەی هاویشتۆتە سەر شانی چەپە و مەمکی چەپەی هاویشتۆتە سەر شانی ڕاستە. بچۆ لای ئەو. مەمکی ڕاستەی کە لە سەر شانی چەپەیەتی بیمژە. وریا بە بە هەڵە نەچی. دەنا پیرێژن پارچە پارچەت دەکا. پیرە مێرد ئەوەی گوت و بزر بوو.

میرزا مەحمود چوە سەر چیا و دیتی بە ڕاستی باخێکی جوان دەوری کۆشکێکی سپی بەرزی داگرتوە. میرزا مەحمود چوە ناو کۆشک و دیتی پیرێژن بە پرچی بڵاو دانیشتوە و مەمکی ڕاستەی هاویشتۆتە سەر شانی چەپەی و مەمکی چەپەی لە سەر شانی ڕاستیەتی. میرزا مەحمود چوە پێش و سڵاوی کرد و مەمکی ڕاستی مژی.

پیرێژن گوتی : « ئەی بەد زات. بێگومان کەسێک فێری کردووی. باشە. بڵێ بزانم بۆ هاتوویە ئێرە.؟

میرزا مەحمود گوتی :« هاتووم « زەرد خەبەر » لە کن تۆ بەرم.» پیرێژن هەستا و دەرگای کردەوە و بانگی کرد:« ئەی « زەرد خەبەر» بە دوای تۆ داهاتوون.» کیژێک لە بەر دەرگا دەر کەوت. کیژێکی ئەوەندە جوان کە مرۆ لە تەماشای تێر نە دەبوو.

پیرێژن گوتی : « ئەوەش « زەرد خەبەر » میرزا مەحمود چەند ڕۆژێک لەو کۆشکە مایەوە ورۆژێ بە کیژەکەی گوت:« دەبێ لێرە بڕۆین. گولیزار چاوی لە ڕێگای تۆوە.» زەرد خەبەر گوتی : « چبکەین. ئەگەر ڕێی حەوتساڵانیش لە پیرێژن وە دوور کەوین، دیسان دەمان دۆزێتەوە. بەڵام قەی ناکا ، بیرێک دەکەمەوە. ڕۆژی دوایە میرزا مەحمودی بانگ کرد و گوتی :

- سبەی بەیانی من و تۆ دەکەوینە ڕێ. من شانەی سەری پیرێژن و

سابونێک هەڵدەگرم و تۆش ئەو لەگەنە هەڵگرە کە بۆ شوشتن ئاوی تێدەکا. ڕۆژی دوایی سەر لە بەیانی ئەو شتانەیان هەڵگرت و کەوتنە ڕێ، کەمێک ڕۆیشتن ئاوڕیان داوە، دیتیان تۆز و گێژەڵوکەیەک هەستاوە. « زمرد خەبەر» گوتی : « ئەوە پیرێژنە وەدوای ئێمە کەوتوە. ئەوەی گوت و شانەکەی بۆ لای پیرێژن هاویشت. دەست بەجێ لەو شانە جەنگەڵێکی چڕ پەیدا بوو کە دارەکانی هەموو دڕک بوون. پیرێژن لە نێو جەنگەڵ دا حاسیە بوو، هەموو لیباسەکانی دڕ بە دڕ بوون. دەستەکانی بە خوێن بوون. بەڵام لە گەڵ ئەوەش توانی لە جەنگەڵ بێتە دەر.

« زەردە خەبەر» و میرزا مەحمود دیتیان کە دیسان لێیان وەنیزیک کەوتوە.« زەرد خەبەر» سابوونەکەی بۆ پشت خۆیان هاویشت. لە جێگای سابوون چیایەکی گەورەی سەهۆڵ پەیدا بوو. پیرێژن دەیویست لە کێوی سەهۆڵ سەر کەوێ، نەیدەتوانی و دەخلیسکا، نەیدەتوانی هەنگاوێک بچێتە پێش. بەڵام ئاخرەکەی بە هەر زەحمەتێک بوو لە چیاکەش سەر کەوت و کەوتە دوایان.« زەرد خەبەر» دیتی نیزیکە بیانگاتێ. بانگی میرزا مەحمودی کرد کە تەشتە ئاوەکە بۆ پشتەوە فڕێ بدا. میرزا مەحمود تەشتە ئاوەکەی هەڵداشت و بوو بە دەریایەکی مەزن و پیرێژنی تێدا نوقم بوو.

میرزا مەحمود و « زەرد خەبەر» بە سلامەتی و بێ ترس گەیشتنەوە ماڵ. گولیزار هەر لە هەوەڵەوە « زمرد خەبەر» ی خۆشویست و هەر سێک ژیانێکی خۆشیان هەبوو. ڕۆژێک پاشا دیسان چوە ڕاوی و توشی میرزا مەحمود بوو. پاشا ویستی بیدوێنێ. بەڵام میرزا مەحمود وەدوای مامزێک کەوت و بزر بوو. پاشا جارێکی دیکەش بە خەمباری گەڕایەوە. شەو بە وەزیری گوت:

– دیسان ئەو کوڕەم لە جەنگەڵ دیت. تا هاتم بانگی بکەم، ون بوو. وەختە دڵم بۆی بتەقێ.

دوو ژنی پاشا زانیان کە منداڵەکان زیندوون. جارێکی دیکە پیرێژنیان نارده کن میرزا مەحمود و گولیزار. پیرێژن هاتە کن گولیزار و کیژەکە خۆشحاڵ بوو. پیرێژن لە گولیزاری پرسی:« باشە، میرزا مەحمود« زمردخەبەر»

بۆ هێنای یان نا ؟»

کیژەکە گوتی: « بەڵێ هێناویە،» پیرێژن گوتی : « بلێ هەزار بلبلت بۆ بێنێ، ئەوەی گوت و گەڕایەوە. « زەرد خەبەر» پیرێژنی بینی و هەستی کرد کە زیانیان پێدەگەیێنێ. تیر و کەوانی میرزا مەحمودی هەڵگرت و پیرێژنی کوشت و گەڕایەوە. بەڵام دیتی گولیزار نایدوێنێ. « زەرد خەبەر» هەر چەند کردی و بیری کردەوە نەیزانی کە چی قەوماوە. ئێوارە میرزا مەحمود هاتەوە دیتی گولیزار کز و خەمگینە. لێی پرسی . چی قەوماوە ؟

گولیزار گوتی : دەمەوێ « هەزار بلبل» لێرە بن.

میرزا مەحمود گوتی : « زۆر باشە. تێشوی ڕێگام بۆ ساز کە، سبەی بەیانی وەڕێ دەکەوم. بەیانی خورجێنی تێشوی ڕێگای هەڵگرت و کەوتە ڕێ. دیسان توشی پیرە مێردی گۆڕین بوو. پیرە مێرد لێی پرسی:« دیسان گولیزار تۆی بۆ مردن نارد.»؟

میرزا مەحمود وەڵامی داوە:« بەڵێ بابە گیان، چی بکەم. دەچم هەزار بلبل پەیدا بکەم.

– کارێکی دژوارە. بەڵام من یارمەتیت دەدەم. بچۆ سەر ئەم کێوە. دەبینی بەردی زۆری لێن. ئەگەر باش تەماشا بکەی دەبینی کە ئەو بەردانە ئینسان و جانەوەر ومێگەلە ئاژەڵن کە هەزاران بلبل کردوونی بە بەرد. کاتێکی گەیشتیە وێ، بانگ کە« ئەی هەزاران بلبل، ئەی هەزاران بلبل» ئەو لە وەڵام دا دەڵێ:« نەفرین لە تو» ئەو دەم تا ڕانەکانت دەبنە بەرد. جاری دووەم بانگ کە؛« ئەی هەزاران بلبل» ئەو دیسان دەڵێ:« نەفرین لە تو» تا پشتت دەبێتە بەرد. جاری سێیەم بانگ کە و سەر تا پات دەبێتە بەرد. ئەگەر گولیزار بۆ دۆزینەوەت بێ، رزگار دەبی و دەنا بۆ هەمیشە بە بەرد دەمێنیەوە. پیرە مێرد ئەوەی گوت و بزر بوو.

میرزا مەحمود چوە سەر چیا و دیتی ئینسان و جانەوەر و مەڕ و ماڵاتی زۆر بوونە بەرد. میرزا مەحمود بانگی کرد:

– ئەی هەزاران بلبل !

هەزاران بلبل وەلامی داوە: « نەفرین لە تۆ»

میرزا مەحمود هەر ئەو دەم هەستی کرد کە لاقی بوون بە بەرد. جاری دووەم بانگی کرد و جاری سێیەم سەرتا پا بوو بە بەرد. با ئەو لە وێ بێت. بچین بزانین گولیزار و « زەرد خەبەر» چی دەکەن. ئەم دوو کیژە چاویان لە ڕێی میرزا مەحمود بوو کەی دەگەڕێتەوە. دیتیان نایەتەوە، خۆیان بۆ سەفەر ئامادە کرد و بە دوای ئەو دا کەوتنە ڕێ. هەمان پیرە مێرد لە سەر ڕێیان سەوز بوو گوتی :

– باشە، گولیزار میرزا مەحمودت ناردە جێیەک کە هیچ ئادەمیزادێک لەوێ ناگەڕێتەوە، ئێستا خۆت وەدوای کەوتووی. باشە یارمەتیت دەکەم. بچنە سەر ئەو چیایە، کۆمەڵێک ئادەمیزاد و جانەوەر و ئاژەڵ و چوار پێ دەبینن کە بوونە بەرد. لە نێو ئەواندا میرزا مەحمود دەناسیەوە. موە زەردەکانی با بڵاوی کردوە. ئەی گولیزار، بۆ لای ئەو بچوو، لە ئامێزی گرە و هەزاران بلبل بانگ کە. هەزاران بلبل کیژێکە و کیژی خۆش دەوێن. لە وەلامی تۆ دا دەڵێ:« گیان » لە کەڵکوو ئەوەی گوت تەواوی ئینسان و لاوەکان تا پشت زیندوو دەبنەوە. سێ جار بانگی کە تا هەموویان زیندوو دەبنەوە. ئەو دەم هەموو ڕا دەبن و بۆ ئەملا ولا ڕادەکەن. ئەگەر میرزا مەحمود نە گری و ڕاینەگری، ئەویش ڕادەکا و ئیتر نایبینیەوە. توند بیگرە تا لە دەستت ڕانەکا.

کچەکان وە سەر چیا کەوتن و دیتیان هەر چی پیرەمێرد گوتی ڕاست بوە. گولیزار میرزا مەحمودی ناسی و بۆ لای چوو لە ئامێزی گرت و سێ جار بانگی کرد:« هەزاران بلبل ». سێ جاریش وەلامی « گیان» ی بیست. جاری سێیەم تەواوی ئەوانەی ببوونە بەرد، گیانیان هاتەوە بەر و بۆ ئەملا ولا ڕایان کرد و تا ئێستاش هەر وا ڕادەکەن. بەلام گولیزار توند میرزا مەحمودی گرت، تا ئەقڵی هاتەوە سەر. ڕۆژی سێیەم هەر سێکیان چوونە کۆشکی هەزاران بلبل. سێ ڕۆژ لەو کۆشکە میوان بوون و پاشان بەرەو ماڵ کەوتنە ڕێ، هەزاران بلبل- یش لە گەڵیان چوو. لە ڕێگا توشی پیرەمێردی گۆڕین بوون و گوتی :

– من یارمەتی ئێوەم دا تا بە ئاوات گەیشتن. ئێستا ئێوە دوعا بکەن کە من گەنج ببمەوە.

هەموو تێکڕا دوعایان کرد و پیرە مێرد لە بەر چاوی ئەوان بوو بە لاوێکی قۆز و لە گەڵ ئەوان هاتە ماڵیان. بەیانی میرزا مەحمود ویستی بچێتە ڕاو. هەزاران بلبل پێی گوت :« ئیمرۆ هەمان سوار دەبینی کە وەدوای مامزێک کەوتوە، نایگاتێ. تۆ ڕاوی کە و بیدەیە. پێت دەڵێ:« ئیمرۆ تو میوانی من بە» قبوڵی کە. کە چوویە کنی، دەسکە گوڵێک لە گەڵ خۆت بەرە و بۆ ژنێکی باوێ کە لە پەنا دەروازەی کۆشک لە دار بەستراوە. لە هەر شوێنێ دانیشتی، لە جێی خۆت هەڵمەستە. کاتێ خواردنیان لە پێش دانای، کەمێکی بدە بە پشیلە. ئەگەر خواردی و هیچی لێ نەهات، بێ ترس بیخۆ. ئەگەر پشیلەش مرد، دەستی لێ مەدە و هەستە و خوا حافیزی بکە و وەرەوە.

میرزا مەحمود قسەکانی هەزاران بلبلی بە وردی ئەنجام دا. کاتێکی خزمەتکار خواردنیان لە پێش دانا، کەمێکی هاویشتە پێش پشیلە. خواردی و لە وێ وشک هەڵات. میرزا مەحمود دەستی بۆ خواردن نە برد ، هەستا و بۆ ماڵێ گەڕایەوە. .ڕۆژی دوایە هەزاران بلبل بە میرزا مەحمودی گوت:

– ئەگەر ئیمرۆ پاشات لە سەر ڕێگای خۆت بینی، ئەو جاریش مامز ڕاو کە و بیدەیە، پاشان داوەتی بکە بۆ میوانی.

میرزا مەحمود گوتی : ئاخر ماڵی من بچوکە و هیچم نیە. بۆ کوی داوەت بکەم. هەزاران بلبل گوتی :

– لەم بارەوە نیگەران مەبە. من هەموو شت جێ بە جێ دەکەم. میرزا مەحمود چوە ڕاو. دیتی پاشا دیسان بە دوای مامزێکدا ئەسب لنگ دەدا و نایگاتێ. میرزا مەحمود مامزێکی ڕاو کرد و بە دیاری دای بە شا و گوتی :

– قیبلەی عالەم! ئیمرۆ میوانی من بە!

کاتی ڕۆژ ئاوا پاشا و وەزیر لە گەڵ هاو ڕێیانیان هاتنە ماڵی میرزا مەحمود. تەماشایان کرد کۆشکێکی بەرز و جوان و لە هەموو لاوە نۆکەر لە هاتوو چۆ دان. میرزا مەحمود خۆی یارمەتی کرد پاشا دابەزێ و پاشا ن

ئەسبەکەی بردە تەویلە. هەموو هاتنە ژوور. خواردنیان هێنا. هەر یەکەی دەورێکی ئاڵتونی پڕ لە خواردنیان لە پێش دانان. بەڵام بۆ وەزیر و پاشا تەنیا یەک دەوری ئاڵتونیان دانا. هەزاران بلبل بە میوانانی گوت:« کە نانتان خوارد و تێر بوون، دەورییەکان بۆ خۆتان هەڵگرن، پێشکێشتان دەکەین.

هەموو خواردیان و تێر بوون. پاشا و وەزیر لە سەر دەوریەکە لێیان بوو بە کێشە. پاشا دەیگوت؛ دەوری ماڵی منە» وەزیر دەیگوت: نا « ماڵی منە » کەمی مابوو لە دمی یەک بدەن.

هەزاران بلبل رووی کردە میوانان و گوتی :« ئەی میوانینە تەماشا کەن چۆن قیبلەی عالەم و وەزیری لە سەر دەوری کێشە دەکەن.» هەموو پێکەنین.

پاشان هەزاران بلبل گوتی :« ئەی پاشا دەورییەکە بدە بە وەزیر، ئێمە بۆ تۆ دیاری زۆرمان ئامادە کردوە. باشترە وەبیر خۆت بێنیەوە کە چۆن بە قسەی ژنەکانت باوەڕ کرد کە ژنە کچکەکەت دوو کجولە سەگی بوە. پاشان هەزار بلبل تەواوی حکایەت و روو داوەکەی بۆ پاشا گێڕاوە و گوتی: ئەوانە میرزا مەحمود و گولیزاری مو زەردی منداڵی تۆن.»

پاشا زۆر شاد و کەیف خۆش بوو، میرزا مەحمود و گولیزاری ماچ کرد و لە گەڵ میرزا مەحمود و گولیزار وهەزاران بلبل و « زەردە خبر» بۆ کۆشکی خۆی گەڕایەوە.

کاتێ گەیشتنەوە کۆشک، پاشا ئەمری کرد کە دوو ژنەکانی بێنن. دوو حوشتریان هێنا، ماوەیەک تفاقیان نەدا بە یەکیان و ئاو بە ئەویتریان. هەر تک ژنیان لە حوشتران بەستن . حوشترەکان یەک بۆ تفاق و یەک بۆ ئاو، هەر یەکە روویان دە لایەک کرد و ژنەکانیان لە بەر یەک هەڵدڕی. ئەو جار ئەمری کرد کە ژنە کچکەکەی لە دار بکەنەوە و بیبەنە حەمام و لیباسی جوان و شازی دەبەر کەن، دایکی ئەو دوو منداڵە لە پەنا پاشا لە سەر تەخت دانیشت. پاشان دوو زەماوەندیان بە جارێک ساز کرد. گولیزاریان دا بەو لاوە کە هەزاران بلبل تەلیسمی وی شکاند بوو، گەنجی کرد بۆوە.« زەرد خەبەر» و هەزاران بلبل-یشیان دا بە میرزا مەحمود و هەمویان بە ئاواتی خۆیان گەیشتن.

## ڕۆستەمی زاڵ ٥١

زاڵ و خوشکی هەتیو بوون و کەس نە بوو نانیان بداتێ. کەوتنە ڕێ تا بە دەوری دنیا دا بگەڕێن. ماوەیەکی زۆر گەڕان، ماندو بوون، زەحمەتێکی زۆریان کێشا، ئاخرەکەی گەیشتنە وڵاتی قەراڵی کافر. زاڵ و خوشکی لە پەنا حەساری شار دانیشتن، سەرمایان بوو، باڵیان وێک دا و خەویان لێکەوت. وەزیری قەراڵی کافر بە لایاندا تێپەڕی تەماشای کرد دوو منداڵ لە پەنا حەسار لە ئامێزی یەکتردا خەوتوون. وەزیر تەماشایکردن و دیتی موسڵمانن. چۆوە دیوانی قەراڵ و گوتی :« دوو موسڵمان هاتوونە شاری ئێمە لە پەنا حەسار خەوتوون، چی یان لێبکەین ـ»

قەراڵ گوتی : بڕۆ هەر دوکیان بکوژە تا تۆرەمەی موسڵمانان نەمێنێ.

وەزیر گوتی :« دوو منداڵی بچوکن. سەریان لە هیچ دەر ناچێ. با گەورەیان بکەین، ڕۆژێ بە کارمان دێن.»

قەراڵی کافر ڕازی بوو گوتی:« باشە، بە نۆکەرێکیان بسپێرە و بڵێ ئاگای لێیان بێت ، با گەورە بن.»

سەرتان نەیێشێنم زاڵ و خوشکی گەورە بوون پازدەساڵیان تەواو کرد. ڕۆژێ قەراڵی کافر گوتی :« لاوەکە بێننە کن من وکیژەکەش بچێتە ژوور. کاتێ قەراڵ زاڵی بینی ئاقڵی لە سەر دا نەما. دیتی زاڵ بە ڕاستی پاڵەوانێکە. تاقیکردەوە و بە سەر هەموو پاڵەوانەکاندا زاڵ بوو. قەراڵ پاڵەوانێکی هەبوو بە ناوی قەمبەر کە سەر کردەی هەموو پاڵەوانەکانی بوو. زاڵی بەو سپارد و قەمبەر بۆ هەر شەڕێک دەچوو. زاڵیشی لە گەڵ خۆ دەبرد.

لە وڵاتی قەراڵی کافر ، شارێک لە ڕۆخی دەریا بوو. لەو شارە جانەوەرێکی

سامناک پەیداببوو کە هەموو کەسی دەکوشت و دەیخستە دەریاوە. قەرالیان ئاگادار کرد. هەموو خەڵک و پاڵەوانەکانی کۆ کردەوە و گوتی:
– هەر کەس بە سەر ئەم جانەوەرە سامناکەدا زاڵ بێ، ئەم شارە دەبێتە ملکی وی حکوومەتی بەسەردا بکا و باج و ماڵیات بۆ خۆی وەر گرێ.
هەموو پاڵەوانەکان کەوتنە فیکر و ئەوەندەیان سەبیلە کێشا کە سوتووی سەبیلەکانیان کێوێکی لێ کەوتەوە، بێدەنگ بوون. زاڵ لە ناویاندا هەستا و گوتی :» پاشا ئەم کارە بە من بسپێرێ. نە دایکم هەیە و نە باب. من و خوشکم بێکەسین. ئەگەر بشکوژرێم کەس نیە تازیەم بۆ دابگرێ.«
قەرال زاڵی خۆش دەویست، گوتی :» من ئەو هەموو پاڵەوانەم هەنە، یەکیان ئامادە نەبوو بچێتە شەڕی ئەم جانەوەرە. ئافەرین بۆ تۆ کە ئامادەی بچی.«
زالیان بۆ شەڕ ئامادە کرد و چەک و ئامرازی پێویستی هەڵگرت و لە گەڵ خوشکی ڕێیان داگرت. ڕۆیشتن تا گەیشتنە ئەو شارە. زاڵ تەماشای کرد دوکان هەموو کراونەوە، بەڵام کەس دیار نیە. زاڵ خانوێکی جوانی هەڵبژارد و لە گەڵ خوشکی کردیانە مەنزڵ و تێیدا دانیشتن. پاشان چوە شار و لە دوکانان خواردنی جۆر بە جۆری هەڵگرت و بردیەوە ماڵ. خوشک و برا نانیان خوارد. پاشان چەکی هەڵگرت و چوە ناو شار بسورێتەوە. دیتی هەموو شوێنێ هێدی و ئارامە. لە دڵی خۆیدا گوتی:» هەر بەڵایەکی بێ لە لای دەریاوە دێت و ڕووی کردە دەریا.
تەواوی شەو لە ڕۆخی دەریا دەگەڕا و هیچی نەدیت. لە پڕ بینی لافاوی دەریا وەک کێو هاتە بزووتن و جانەوەر هاتە قەراخ و یەکسەر ڕووی لەو کرد و دەیەوێ پەلاماری بدات. زاڵ بە گژ جانەوەر داچوو. جانەوەر دەیویست زاڵ بۆ دەریا ڕاکێشێ و ئەویش دەیویست جانەوەر بۆ وشکی بێنێ. تا بەیانی لە مل بە ملە دا بوون، هیچ کامیان سەر نە کەوتن. زەوی لە ژێر قاچیان وەک کێڵراوی لێهاتبوو. جانەوەر لە دەست زاڵ دەر چوو لە دەریادا بزر بوو. زاڵیش چۆوە ماڵ. لای ڕۆژ ئاوا زاڵ جارێکی دیکەش بۆ لای دەریا چوو. سێ شەو جانەوەر و زاڵ لە شەڕ دابوون. بەیانی شەوی سێیەم زاڵ جانەوەری لە عەردی دا و

هەڵیکێشا خەنجەر کە سەری ببڕێ، لە پڕ جانەوەر وە قسە هات و گوتی :
– ئەی زاڵ مەمکوژە. پێستم لێ بکەوە بزانە چ دەبینی.
زاڵ پێستی جانەوەری تا سنگ و نێو قەدی دڕی، سنگ و مەمکی ژنێک دەر کەوت. زاڵ لە سەر بەردێک دانیشت و گوتی: « موبارەک نە بێ، سێ ڕۆژ لە گەڵ ژنێک شەڕم کردوە، خۆشم بە پیاو دەزانم» ڕودابە کە ناوی کیژەکە بوو، پێستی جانەوەری دڕاند و بوو بە کیژێکی چاردە ساڵە و لە کن زاڵ دانیشت و گوتی :
– ئەی زاڵ خەمێ مەخۆ. من کیژی شای پەریانم. هێشتا شیرە خۆرە بووم دایکم دوعای لێکردم و گوتی :« تۆ دەبیە جانەوەرێکی سەیر و لە دەریادا دەژی. زاڵ بەسەرت دا سەر دەکەوێ. دوعای دایکم گرتمی و ئێستا دەبێ تۆ بمهێنی.»
زاڵ ڕودابەی بردە دوکان ولیباسی بۆ هەڵگرت. لیباسی شازی کردە بەر و ئەوەندە جوان بوو بە مانگ و ڕۆژی دەگوت، من دەر کەوتووم، ئێوە دەر مەکەون. چوونەوە ماڵ.
زاڵ بە خوشکی گوت:« ئەوە هەمان جانەوەرە کە لە دەریا دەهاتە دەر.ناوی ڕودابەیە و کیژی شای پەریانە و من دەیهێنم.»
زاڵ ڕودابەی هێنا و پاش ماوەیەکی پێی گوت:« دەبێ هەموو شت بە قەرالی فەرمنگ بێژم»
– بۆ چی ؟
– بۆ چی کامەیە ؟ قەرال بەڵێنی داوە ئەم شارە بدا بەو کەسە کە بەسەر جانەوەردا زاڵ بێ. وەرە بچینە کن قەرال و بزانین دەڵێ چی.
– چ قەیدیە با بچین. سواری ئەسپان بوون و کەوتنە ڕێ. زاڵ لە پێش و ڕودابە لە دواوە. زاڵ ئاوڕی داوە و تەماشای ڕودابەی کرد.
ڕودابە گوتی :« بۆ چی وا ئاوڕ دەدەیەوە و تەماشام دەکەی.؟
زاڵ گوتی: « تۆ زۆر جوانی. لەشکری کافران زۆرن. دەترسم لە منت بستێنن. ئاخر ئەوان زۆرن و من بە تەنیا، سەر دەکەون.»
ڕودابە گوتی : « نیگەران مەبە و مەترسە. با بڕۆین.»

ڕۆیشتن تا گەیشتنە شاری قەرالی کافران. زاڵ تەماشای رودابەی کرد، دیتی چاوی دەرپەڕیون وزاری گەورە بوە و هەر کەسێ چاوی لێ بکا دەترسێ. زاڵ خۆشی ترسا. کاتێ گەیشتنە شار، زاڵ پەیامی بۆ قەرال نارد کە وا جانەوەرم هێناوەتە ئێرە، ڕێگا بدە بیهێنمە کۆشک. قەرال ئیجازەی دا و چوونە کۆشک. قەرال کە چاوی بە جانەوەر کەوت ترسا و لە پشت کورە خۆی شاردەوە و هاواری کرد:

– ئەی زاڵ. زووتر لێرە بیبە دەرێ.

زاڵ رودابەی بردە دەر و بە قەرالی گوت:« تەواوی خەڵک کۆ بکەوە تا هەر کەسێ دەیەوێ لە گەڵ من بێ و هەر کەسیش دەیەوێ با لای تۆ بمێنێتەوە.»

قەرال خەڵکی بانگ کرد و گوتی :« هەر کەس دەیەوێ بچێتە کن زال لە لای چەپە بوێستێ و هەر کەس دەیەوێ لای من بمێنێتەوە لە لای ڕاستە بوەستێ.»

ئێستا با بزانین پاڵەوانگەل چیان کرد. سەر کردەی پاڵەوانان قەمبەر چوە کن زاڵ. خەڵک و پاڵەوانگەلی تر کە دیتیان سەر کردەی پاڵەوانان بۆ لای زاڵ ڕۆیشتوە، ئەوانیش چوونە کن زاڵ. بەڵێ چوون و لە گەڵ قەرالی کافر کردیان بە شەڕ و شکاندیان. کلیسایان وێران کرد و مزگەوتیان لە جێ دانا. ئایینی ئیسلامیان دامەزراند. پاشان زاڵ و لایەنگرانی چوونەوە شاری خۆیان. زاڵ لە شاری خۆی بە کار و باری خەڵک ڕادەگەیشت، خوشکیشی دا بە قەمبەری پاڵەوان. زاڵ و پاڵەوانگەل هەموو ڕۆژێ دەچوونە ڕاو و ئێواران دەگەڕانەوە. لە کۆشکی زاڵ کۆ دەبوونەوە و تا نیوە شەو داستانیان دەگێڕانەوە و پاشان بڵاوەیان دەکرد.

چەند ساڵ پێچوو ، رودابەی ژنی زاڵ ژانی هاتنێ و بەڵام منداڵەکەی نەدەبوو. زاڵ کەوتە فیکرەوە کە چی بکات. پشتیوانی بنە ماڵەیان سیمرغ بوو. سیمرغ فڕی و هاتە کن زاڵ و گوتی:« کاتی بیر کردنەوە نیە . ئەگەر تۆزێ ڕاوەستی، رودابە دەمرێ.»

– چی بکەم؟

– ڕۆستەمێک لە سکی ڕوو دابە دایە و شەرم دەکا بە ڕێگای ئیعتیادی دا بێتە

دەر. دەست دە شیر و سگی بدڕە و ڕۆستەم بێنە دەرێ. دوایە سگی دایکی بدروونەوە. من پەڕێکی باڵی خۆمت دەدەمێ، دە ئاوی هەڵکێشە و بە سەر برینەکەی دابێنە، چاک دەبێتەوە.

زاڵ بە قسەی سیمرغ بزووتەوە. دوازدە پیرێژن دەوری رودابەیان دا. نێوکی رۆستەمیان بڕی لە تەشتێکی ئاو دا شوشتیان. رۆستەم دەستی ڕاوەشاند و پیرێژن بڵاو بوون و هاواریان کرد:« ئەی زاڵ! ئێمە بە رۆستەم ناوەستین.»

زاڵ هاتە کن رۆستەم و گوتی :«رۆستەم ئارام بە، دانیشە. لێگەڕێ سەر و لەشت بشۆن. رۆستەم ئارام بوو. پیرێژن شوشتیان و دە بێشکەیان نا.

ئێستا باسی قەمبەر بکەین. خێزانی قەمبەر کوڕێکی بوو، ناویان نا بەدران. منداڵی خەڵک ساڵ بە ساڵ گەورە دەبن. بەڵام رۆستەم و بەدران رۆژ بە رۆژ و سەعات بە سەعات گەورە دەبوون.

سەرتان نەیێشێنم. ئاخر زمان ئێسکی نیە کە هەر چەندی ببزوێ و بپەیڤێ هیلاک نەبێ. بەڵێ. رۆستەم گەورە بوو لاوێکی بە هێز. زاڵ قەمبەری بانگ کرد و رۆستەمی پێ ئەسپارد و گوتی :

– ئاگات لە رۆستەم بێ. هەر چی خۆت دەیزانی فێری کە. با لە هەموو شوێنێ لە گەڵ تۆ بێ. تەنیا ئاگادار بە نەچنە سەر ئەو کێوە، بەڵاییکتان بە سەر دێت. قەمبەر و رۆستەم لە کوێستانەکان دەگەڕان. رۆستەم چوە کن ئاسنگەر و گوتی :« گورزێکی چل مەنی بۆمن دروست کە.»

ئاسنگەر گورزی بە دڵی رۆستەمی دروست کرد. رۆستەم هاتە کن بابی و دیتی پاڵەوانگەل هەموو لەوێ کۆبوونەوە. پاڵەوانگەل گورزی خۆیان لە قوژبنێک دانا بوو. رۆستەم گورزی خۆی هاویشتە سەر گورزی پاڵەوانەکان. ئەوان ویستیان بڕۆنەوە و گورزەکانی خۆیان هەڵبگرن. نەیانتوانی. گورزی رۆستەم لە سەر گورزی ئەوان دانرا بوو. ئەوەندە قورس بوو کە هیچیان نەیانتوانی بیبزێون. پاڵەوانگەل توڕە بوون و هاتنە کن زاڵ و گوتیان :

– گورزی کوڕی تۆ تەواوی گورزەکانی ئێمەی ورد کردوە. زاڵ دیتی ڕاستە. ڕووی کردە رۆستەم و گوتی :

– ئەی رۆستەم ئەو کارە چیە ؟ هێشتا بۆنی شیرت لە زاری دێت، دەتەوێ هێزی خۆت بە چاوی پاڵەوانگەل دابدەیەوە.؟
– هێز بە چاو دادانەوە نیە. پاڵەوانگەل گورزی خۆیان لە سەر یەک داناوە. منیش گورزی خۆم لە سەر وان دانا. ئێستا هەڵیدەگرم و دەڕۆم. گرژ بوونی ناوێ.
رۆستەم گورزی خۆی بە سانایی هەڵگرت، دەتگوت هەر قورس نیە. پاڵەوانگەل –یش بە دوای ئەو داگورزی خۆیان دەست دایە و بڵاوەیان کرد. چوونەوە ماڵی خۆیان و بەلام قینی رۆستەمیشیان لە دڵ گرت. زاڵ دیتی پاڵەوانگەل ئێرەیی بە رۆستەم دەبەن. هەموو پاڵەوانەکانی بانگ کرد و گوتی :
– ئەو مەزرایەی کە دەیبینن، پێش سەت ساڵ باپیرم گورزی خۆی بە عەردی داداوە. گورزە کە چۆتە خوار لە عەرد و تەنیا ئاڵقەکەی دیارە. ئەگەر رۆستەم توانی ئەم گورزە بێنێتەوە دەر، دەبێ دان بەوە دابنێن کە لە ئێوە بە هێز ترە. ئەگەر نەیتوانی بیکوژن.
پاڵەواانگەل رۆستەمیان بردە مەزرا و گوتیان:» ئەو گورزەی ئاڵقەی دیارە، بیهێنە دەر. ئەگەر هێناتە دەر، سەر کردە و سەر وەری ئێمەی. ئەگەر نا، دەتکوژین.
رۆستەم قامکی گچکەی خۆی دە ئاڵقەی گورزەکە کرد و هێنایە دەر و بۆ حەوای هەڵدا و گرتیەوە وەک یاری بکات و گوتی:
– چەند گورزێکی باشە. ئەگەر پەنجا مەنی دیکە قورس بایە خەراب نە دەبوو. رۆستەم باش و پێشی کرد و گورزەکەی هەڵداشت و وەها چوە دەزەوی کە ئاڵقەکەشی دیار نەبوو.
حکایەتەکەیان بۆ زاڵ گێڕایەوە. بە پاڵەوانانی گوت: چار نیە دەبێ لە ژێر فەرمانی رۆستەم دابن.
رۆستەم و قەمبەر چوونە ڕاو و ساڵێک نەگەڕانەوە. ئاخرەکەی قەمبەر رۆستەمی بە زۆر هێناوە ماڵ. زاڵ و قەمبەر دیتیان کە کاتی ئەوە رۆستەم ژن بێنێ. ژنیان بۆ هێنا و شایی و زەماوەندیان ساز کرد. مانگێک تێپەڕی،

رۆستەم و قەمبەر جارێکی دیکەش چوونە ڕاو. یەک دوو مانگ خەریکی ڕاو بوون ئاخری گەیشتنە سەر ئەو چیایە کە زاڵ گوتبووی نەچن.

رۆستەم گوتی :« وەرە با بچینە سەر کێو.

قەمبەر گوتی:« بچین چی بکەین.؟ باشترە بچینە جێیەکی دیکە.

رۆستەم پێکەنی و گوتی: « بێژە دەترسی.! ئاخر چووینە هەموو شوێنێ و ڕاومان کرد سەری ئەم کێوە نە بێ. قەمبەر نەیتوانی رۆستەم قانیع بکا، و چوونە سەر چیا. دیتیان هەمووی پڕە لە گوڵ و گوڵزار. وەک بەهەشت وایە و کار مامز تێیدا دەسوڕێنەوە. قەمبەر و رۆستەم دوو مامزیان ڕاو کرد و خێوەتیان لێ هەڵدا، کەبابیان ساز کرد و خواردیان.

رۆستەم درێژ بوو بە قەمبەری گوت :« درێژ بە و بنوو.

قەمبەر گوێ نەدایە و نە نوست و کێشکی دەکێشا. شەو کردیە هەور و باران باری. قەمبەر شیرێ دەست دایە و لە خێوەت چوە دەر. دیتی عەزیایەکی سامناک لە پێش خێوەتە و ئاگری لە زاری دێتەدەر. قەمبەر شیرەکەی لە پێش خۆ ڕاگرت و عەزیا هەناسەی هەڵکێشا و قەمبەری قوت دا. بەڵام شیری قەمبەری ئەوەندە تیژ بوو کە عەزیای دوو لەتکرد. قەمبەر لە زاری عەزیا هاتە دەر و گوێچکەکانی بڕی دە گیرفانی نا و چۆوە خێوەتێ. کاتێ ڕووناک بوو قەمبەر خواردنی ئامادە کرد. رۆستەم هەستا، نانی خوارد و قەمبەر گوتی :

- با لێرە بڕۆین.

- بۆ بڕۆین؟ جێی باشتر لێرە لە کوێ پەیدا بکەین؟

دیسان لە بەیانیەوە چوونە ڕاو، دوو کار مامزیان ڕاو کرد، کەبابیان ساز کرد و نانیان خوارد. رۆستەم نوست و قەمبەر کێشکی کێشا. نیوە شەو دەنگی هەرا و هاواری بیست. لە خێوەت وەدەر کەوت. دیتی دێوێکی بە سام لە بەرانبەری وێستاوە و دەسبیحێکی بە دەستەوەیە دەنکەکانی بە قەدرایی بەرداشێکن. بەردەکان وێک دەکەون و دەنگیان دێت.

دێو هاواری کرد: « ها، ها، حەوت ساڵە دانم دێشێ و گۆشتی تولە سەگێکی وەک تۆ چاری دەکا. تۆم لە ئاسمان دەویست ولە زەوی پەیدام کردی. ئێستا لە

سەر دانمت دادەنێم تا نەختێک هێدی بێت»
قەمبەر گوڕاندی و گوتی :« ئەی منداری پیس، لە پێشدا بخۆ و دوایە بزانە چیە
دێو تورە بوو دەسبیحەکەی بە قەمبەری دادا. قەمبەر خۆی لە بەر لادا و
دەسبیح لە عەردی چوە خوار و دێو وای زانی قەمبەری کوشتوە. هاواری کرد:
بە، بە، خۆڵە مێشیشی نەماوە کە لە سەر دانمی دابنێم.
قەمبەر بانگی کرد و گوتی: وا لێرەم. هەڵیکێشا شیر و بە زەبرێک سەری دێوی
پەڕاند، هەرتک گوێچکەی بڕی و خستیە گیرفانی و چۆوە خێوەتێ. کە ڕووناکی
کرد دیسان نانی بۆ ڕۆستەم ساز کرد و خواردیان و دیسان چوو نەوە ڕاو.
کاتی نیوە ڕۆ بە ڕۆستەمی گوت:« ئەی ڕۆستەم. وەرە لێرە بڕۆین.»
- بۆ کوێ بڕۆین. لە کوێ شوێنی باشتر لەم جێیە بدۆزینەوە؟
قەمبەر گوتی : دوێشەو تۆ خەوتبووی و من خەوم لێ نەدەکەوت. تەواوی شەو
کێشکم دەکێشا.
- بۆ چی ؟
- چۆن بۆ چی؟ شەوی هەوەڵ عەزیا هات و دەیویست ئێمە بخوا. من کوشتم و
شەوی دووەم دێو هات، دەیویست بمان کوژێ. سەرم بڕی ئەوەش گوێچکەی
عەزیا و دێو، هەڵم گرتبوون کە نیشانت بدەم.
ڕۆستەم تورە بوو گوتی :« بڕۆ بابە، گوێچکەی مشکم نیشان دەدەی و فیشال
دەکەی کە عەزیا و دێوت کوشتوە.
قەمبەر دڵێش بوو. ڕۆستەمی بە جێ هێشت و ڕۆیشت و بە خۆی گوت:«
ئەوەندە دەڕۆم تا خێوەتی ڕۆستەم لە بەر چاوم بزر بێ.» ماوەیەک ڕۆی، ئاوڕی
داوە دیتی خێوەتی ڕۆستەم دیار نیە. هەر لە وێ ڕاوەستا و خێوەتێکی هەڵدا و
حەسایەوە.
ئێستا بزانین ڕۆستەم چی بە سەر هاتوە.
ڕۆستەم شەو خەوی بینی. لە نیوە شەو دێوێکی بە سام کە ناوی هنگرمەنە،
هاتە پەنا خێوەت. خێوەت و زەوی دەور و بەری لە زەوی هەڵکەند و گرتیە
دەستی. ڕۆستەم نیوە شەو خەبەری بۆوە و دیتی لە دەستی دێو دایە. دێو

جادووی کرد بوو، دەست و لاقی نە دەبزووت.
هنگرمەنی دێو لە ڕۆستەمی پرسی:« بۆ کوێت فڕێدەم. لە ئاخری زەوی کە پاشای کافرانی لێیە، یا بتخەمە قولایی دەریاوە.
ڕۆستەم فیکری کردەوە و دیتی ئەگەر دێو وا بە داماوی بیهاوێتە خاکی کافران، کیژەکان دێن گاڵتەی پێدەکەن. بە دێوی گوت:
- نا، باشترە لە دەریادا نوقمی بکەی.
دێو بردیە ڕۆخی دەریا. دەور و بەری خیز و چۆل بوو، تەنانەت باڵندەش لەوێ نە دەفڕی. نە دەکرا کەس ڕۆستەم لە وێ بدۆزێتەوە. هنگرمەنی دێو ڕۆستەمی بردە قولایی ژێر زەوی لە ساردوایک بەندی کرد و دەست و پێی زنجیر کرد بە جۆرێ کە توانای بزوتنی نەبوو. دێو ڕۆیشت. ئەوەش بڵێین کە هنگرمەنی دێو، حەوت ڕۆژ دەنوست و حەوت ڕۆژ بە خەبەر بوو.
ئێستا بزانین قەمبەر چ دەکا. ئەو بەیانی وەخەبەر هات و فیکری کردەوە کە بچێ لە حاڵ و ڕۆژی ڕۆستەم ئاگا دار بێت. چوو دیتی نە ڕۆستەم هەیە و نە خێوەت. دەتگوت جێگای خێوەت هەڵکەنراوە. ڕۆستەم چۆتە کوێ، چۆن لە حاڵی ئەو ئاگادار بێ.؟ قەمبەر لە کردەوەی خۆی پەشیوان و نا ڕەحەت بوو. بۆ کۆشکی زاڵ گەڕایەوە و داستانی بۆ ئەو گێڕایەوە. زاڵ غەیب گۆی بانگ کردن و گوتی:« بزانم ڕۆستەم لە کوێیە؟» غەیب گۆیان لە وەڵامدا گوتیان:« هنگرمەن لە قولایی دەریا ئەوی بەند کردوە»
ئێستا کەمێک باسی بەدران بکەین.
بەدرانی کوڕی قەمبەر ئاگا دار بوو کە باوکی ڕۆستەمی بە تەنیا بە جێهێشتوە و هنگرمنی دێو ڕۆستەمی بردوە. بەدران سوێندی خوارد کە « باوکم دەکوژم و تۆڵەی خاڵۆزامی لێ دەستێنمەوە!» کاتێ قەمبەر لەو نیەتەی بەدران ئاگا دار بوو، خۆی شاردەوە تا کوڕەکەی نەیکوژێ. بەدران سواری ئەسپ بوو وەدوای ڕۆستەم کەوت. ڕۆی. زۆر ڕۆی. ئاخرەکەی گەیشتە شارێک کە قەرالی کافر لەوێ حکوومەتی دەکرد. هەموو خەڵک بێگانە بوون. ئەو نە کەسی دەناسی و نە ئاگای لە هیچ هەبوو. بەدران چوە ماڵی پیرێژنێک و گوتی :

– دایە گیان میوان ڕادەگری؟
– ڕۆڵە گیان، کەسێکی وەک تۆ دەبێ لە ماڵی دەوڵەمەند و گەوران میوان بی. لە ماڵی من تەنانەت بۆ حاوانەوەی تۆش جێ نیە، تا دەگا بە ئەسپەکەت.
– دایە گیان خەمێ مەخۆ! ئەم پارەیە وەر بگرە و بچۆ بازاڕ و بۆ خۆت و بۆ من پێخەف و خواردن بکڕە تا ڕۆژ دەبێتەوە بزانین خوا چدەکا. پیرێژن پارەکەی وەر گرت و چوو هەموو شتی کڕی و گەڕایەوە. نانیان خوارد و بەدران ڕووی کردە پیرێژن و گوتی :
– دایە گیان، جێگای من لە سەر بان ڕابخە. دەمەوێ لە ژێر ئاسمانی خوا بخەوین.
پیرێژن لە سەر بان جێگای بۆ ڕاخست. بەدران چوە ناو جێ و خەوت. دوای چەند سەعات وەخەبەر هات و دیتی ڕوناک بوە. بەدران بە پەلە هەستا و بە خۆی گوت: « عەیب و شەرمە خەڵک من لە سەر بان ببینێ.»
زوو لیباسی کردە بەر، بەڵام زوو بوو بە شەو. جارێکی دیکەش چۆوە دە جێ. دیسان ڕۆژ ڕوناک بوو. سەرتان نەیێشێنم تا بەیانی حەوت جار ئاسمان تاریک داهات و ڕوناک بۆوە.
کە بوو بە بەیان، بەدران جێگای خۆی هەڵگرت و لە سەر بان هاتە خوار. پیرێژن نانی ساز کرد، خواردیان و بەدران پرسی:
– دایە گیان، لە شاری ئێوە شەو و ڕۆژێک چەند ڕۆژە و چەند شەوە.؟
– ڕۆڵە گیان، شەو و ڕۆژێک یەک شەو و یەک ڕۆژە.
– ئەدی بۆ چی دوێنێ شەو حەوت جار تاریک داهات و ڕوناک بۆوە.؟
– ها، وەبیرم هاتەوە، ئاخر تۆ لەم شارە غەریبی. لە هیچ شتێ ئاگادار نی. ئەوە کاری « گۆرمیلک» کیژی قەرالی کافرە. هەموو جار کە دێتە باڵە خانەی کۆشک، ڕوی لە هەر لایک بێ ڕوناک دەبێ و ڕووی خۆی دە لایەک دەکا کە بۆنی بەدرانی بۆ بێت. بۆنەکە هەڵدەمژێ و دڵی ئارام دەگرێ. بێگومان بەدران لەو نیزیکانەیە ، بۆیە کیژەکە حەوت جار هاتۆتە سەر بان.
بەدران گوتی:« دایە گیان من بەدرانم. تۆ دەتوانی ئەم ڕازە لە دڵت دا ڕابگری؟»

پیرێژن گوتی : « کورِم، کاری من ڕاز دارییه.!»
- که وا بوو به هیچکەس مەڵێ که من لێرەم. تەنیا به « گورمیلک» بڵێ. بەڵام چۆن دەتوانی بیبینی.؟
پیرێژن گوتی:« من هەمیشه دەچم سەری دەشۆم. به هەڵکەوت بەیانی دەبێ بچم و پێشی دەڵێم تۆ لێرەی. بەدران مستێکی زێڕ دایه و پیرێژن کەیف خۆش بوو. بەیانی ڕۆژی دوایه چوه کن « گورمیلک» و گوتی:« ئەو کەسەی له دوای دەگەڕێی له ماڵی منه.»
« گورمیلک» گوتی: « بێژه پێی هەر ئیمشەو، نیوه شەو بێته لای من.
پیرێژن نیوه شەو بەدرانی ڕێنوێنی کرد. بەدران چوه کن « گورمیلک». ناو براو له خۆشیان لاقی وه عەرد نەدەکەوت. تەواوی شەو به خۆشی ڕایانبوارد و بەیانی بەدران چۆوه ماڵی پیرێژنێ. مانگێکی تەواو هەموو شەو ده چوه کن « گورمیلک» و ڕۆستەمی له بیر چوو بۆوه. بەڵام قەرالی کافر ئاگادار بوو که بەدران دەچێته کن کیژەکەی. هەموو پاڵەوانگەلی خۆی بانگ کرد و گوتی :
- له پێش دەرگای وەتاغی « گورمیلک» بوێستن و که هاته دەر بیگرن و بیکوژن.» بەیانی بەدران هاته دەر و دیتی پاڵەوانگەل دەوریان داوه. بەدران هەمووی کوشتن و پاشان به ئاشکرا دەچوه کن « گورمیلک». قەرالی کافر دیتی که بەدران له نێو خەڵک دا ریسوای کردوه. غەیب گۆ و جادوگەری بانگ کردن و پرسی :« چی بکەم و چۆن له دەست بەدران نەجاتم بێت.؟
- قوڵکێکی له بەر دەرگای وەتاغی « گورمیلک» هەڵکەنه و سەری داپۆشه. کاتێ بەدران بێته دەر لەو قوڵکه بکەوێ. پاشان پاڵەوانان بنێره بیکوژن.
قەرالی کافر به قسەی وان قوڵ کەیان هەڵکەند و بەدرانی بێ خەبەر بەیانی پێی لێ ناو تێکەوت. پاڵەوان گرتیان و به ڕاکێش ڕاکێش له شار گێڕایان. له شار دا چالاوێک هەبوو به ناوی چالاوی « هەشتا گەز» بەدرانیان ده و چالاوه هاویشت و بەرداشێکیان له سەر زارکی دانا . کونێکی تێدا بوو. قەرالی کافر ئەمری کرد سەری « گورمیلک» بتاشن و سەر و چاوی به دوکەڵ ڕەش کەن و بەره و پشت سواری کەری کەن و به شاردا بێگێڕن. به خەڵکی شاریشی

ڕاگەیاند کە « ئەگەر گورمیلک داوای سەدەقە بکا، نەیدەنێ. تەنیا ئەگەر بڵێ: «
بەدران لە چاڵاو دایە و برسییەتی بیدەنێ»
باشـە، با « گـورمـیلک» سـواڵێ بکا و خـواردن بۆ بەدران بەرێ. بزانـین ژنی
ڕۆستەم چدەکات.؟
ژنی ڕۆسـتـەم کوڕێکی بوو نـاویان نا ئەرنج. ئەوەندە جـوان بوو دەتگوت نوری لە
ڕومەت دەبارێ. بابە گەورەی ڕوو پۆشێکی لە چەرم بۆ دروست کرد تا دە چاوە
نەچێ. ئەرنج گـەورە بوو، بوو بە پازدە سـاڵ. دایکی پێی نـەگوت کە ئـەو کوڕی
ڕۆسـتـەمـە. هەمیشـە پێی دەگـوت کە تۆ کوڕی زاڵی. ڕۆژێ ئەرنج لە گەڵ دایکی
هاتە کن زاڵ و بە زاڵی گـوت « بابە» دایکیـشـێ بە زاڵی دەگـوت : بـابە. ئەرنج
بیری کردەوە کە دایکی شتێکی لێ دەشارێتەوە.
لە دایکی پرسـی : « بابی من کێیە ؟»
دایکی گـوتی : « بابی تۆ زاڵە » ئەرنج گوتی: ئـەدی بۆچی تۆش پێی دەڵێی بابە.
ڕاستی بێژە. بابی من کێیە.؟
دایکی گـوتی: « تا بەیانـی ڕاوەسـتـە. بەیانی بچـۆ کن زاڵ. هەمـوو شـتـێکت بۆ
باس دەکا. پاشان دایکی ئەرنج چوە کن زاڵ و گوتی :
– ئەی بابە، ئەرنج هەمـوو شـتی زانـیوە.» پاشـان ئەرنج چوە کن زاڵ و ئەویش
هەموو شتیکی بۆ باسکرد.
ئەرنج سـوار بوو چەکی هەڵگرت و سـوێندی خـوارد کـە: تـا بابم نە دۆزمـەوە
گۆشـتی مەڕ لە من حەرام بێت.» ئـەوەی گوت و ماڵاوایی لە دایک و باپیری کرد
و کەوتە ڕێ.
درێژەی پێنەدەم و هیلاکتان نەکەم، ئەرنج گەیشتە شارێک. مـاوەیەک لەو شارە
سوڕاوە تا توشی پیرێژنێکی بوو. داوای لە پیرێژن کرد کە بە میوان ڕایبگرێ.
پیرێژن قبوڵی کرد، جێگای بۆ داخست و ئەرنج چوە ناو جێگا، بەڵام خەوی لێ
نەدەکـەوت. مـاڵی پیرێژنـێ پڕ لە مێـشـولە بوو. ئەرنج هەسـتـا وچوە نێو شـار
بگەڕێ. لە کوچەیەک توشی دێوێک هات. ئەرنج گوتـی : « من کوڕی ڕۆستەمم.
توشی دێو بوم چۆن دەبێ نەیکوژم. شیـرێکی لە ملی داو سەری پەڕاند. پاشـان

هەر تک گوێچکەی بڕین و دە گیرفانی نان و هاتەوە ماڵی پیرێژن. بەیانی پیرێژن هەستا دیتی میوانەکەی شیری خوێناوی پاک دەکاتەوە. پیرێژن هیچی نە گوت و خەریکی کاری خۆی بوو.
ئێستا باسی خەڵکی شار بکەین. بەیانی کە خەڵک وەخەبەر هاتن و لە ماڵی خۆیان هاتنە دەر، دیتیان دێو لە کۆڵان کوژراوە و رێگای هاتوو چۆی سوار و پیادەی خەڵکی بەستوە. پاشایان ئاگادار کرد، ئەویش خەڵکی لە کۆشک کۆ کردەوە و گوتی:
- هەر کەس دێوی کوشتوە خۆی بناسێنێ و چی دەوێ لێم بخوازێ.
هەموو هاواریان کرد: من کوشتوومە ، من کوشتوومە....
پاشا گوتی: « گوێچکەی براوی دێو لە کوێیە، نیشانی بدەن.». بەڵام گوێچکەی دێو لە کوێ بێنن،؟
پاشا پرسی: « لە شاردا کێ ماوە کە نەهاتبێ.؟ گوتیان: میوانێک لە ماڵی پیرێژن هەیە.
پاشا گوتی: بیهێننە کن من. چوونە ماڵی پیرێژن و ئەرنج- یان هێنا. ئەرنج هات و پاشا کە چاوی پێکەوت لە جوانی ئەو سەری سور ما و پرسی:« ئەی لاو، ئایا تۆ دێوت کوشتوە؟
- ئەرنج گوتی: بەڵێ من کوشتوومە. گوێچکەی دێوی کوژراوی لە گیرفان هێنا دەر و نیشانی دا.
پاشا گوتی:« کیژەکەم دەدەم بە تۆ.»
ئەرنج گوتی:«با ئاڵقەی دەزگیرانی من جارێ لە قامکی کچەکەت دابێ. پێم بڵێ جێگای هنگرمەنی دێو پێدەزانی .؟»
پاشا گوتی: تا ئێستا ناوی ئەوتۆم نە بیستوە. خەڵک بڵاوەیان کرد. ئەرنج ماڵاوایی لە پاشا کرد و سوار بوو کەوتە رێ.
رۆی تا گەیشتە شارێک. هەوا دەهات تاریک دەبوو. ئەرنج لە بەنا خانوێک ڕاوەستا، لە ئەسپ دابەزی و لە دەرگای دا. پیرێژنێک دەرگای لێکردەوە
- دایە گیان میوان ڕادەگری.؟

– میوان خۆشەویستی خودایە، کورم وەرە ژووری. ئەرنج وەژوور کەوت. پیرێژن ئەسبەکەی بردە تەویلە و پاشان نانی بۆ هێنا و نانیان خوارد. پیرێژن جێگای بۆ داخست و ئەرنج چوە سەر جێ و داوای ئاوی کرد.

پیرێژن ئەملا و لای کرد ئاو لە ماڵێ نە بوو. قاپێکی هەڵگرت و چوە دەری. میزی تێکرد و بۆی هێنا.

ئەرنج گوتی:« دایە گیان ئەم ئاوە بۆ سوێرە.»؟

– ڕۆڵە گیان بمبەخشە. لای خوا شاراوە نیە چی لە تۆ بشارمەوە. ئێمە ئاومان نیە. میزم دە قاپ کردوە و بۆم هێناوی.

– بۆ چی ئاوتان نیە.؟

– عەزایایەک لە سەرچاوی ئاوی ئێمە خەوتوە. هەموو ڕۆژێ دەبێ کچێکی دەس لێ نەدراو و مەنجەڵێکی پڕ لە پلاو وگایەکی برژاو و دە مەن نانی بۆ بەرن. تا ئەو کیژ و گاو پلاو و نانەکە دەخوا، خەڵک دەرفەت دەهێنن بەشی حەوت ڕۆژ ئاو دێنن و دایدەنێن. من پیرم تا دوو گۆزە هەڵدەگرم عەزیا جارێکی تر دێتە وە سەر کانی و درێژ دەبێ.

ئەرنج پرسی: کەنگێ هەینییە.؟

– سبەی.

ئەرنج تکای لێکرد کە :« چۆتە بەیانی منیش لە گەڵ خۆت بەری، دەمەوێ بزانم عەزیا کچەکە چۆن دەخوا.

پیرێژن گوت: قەی ناکا، لە گەڵ من وەرە. بەیانی بۆ حەفتا و دوو میللەت و بۆ ئەرنج-یش بوو بە ڕۆژ. پیرێژن گۆزەی هەڵگرت و لە گەڵ ئەرنج بەرەو کانی. ئەو ڕۆژە نۆرە کیژی پاشا بوو کە بیبەنە سەر کانی و عەزیا بیخوا. لە ماڵی پاشا شین و گریان بوو. بەڵام خەڵک شاد بوون کە ئاویان وەگیر دەکەوێ. لە یەک جێ هەم گریان و هەم شادی. خەڵک لە پەنا کانی کۆبوونەوە. کیژی پاشایان بە دەست و پێ بەستراوی بە عارەبە هێنایان. گایەکی برژا و دە مەن نان و پلاویشیان هێنا و لە پەنا کانیان دانا. دارێک لە پەنا کانی بوو، کیژەکەیان لە دارێ بەست. عەزیا لە کەمین هاتە دەر. لە پێشدا دەستی کرد بە خواردنی

گۆشت و پلاو ونـان. خەڵکیش بە پەلە دەستیان بە ئاو کێشـان کرد. ئاخرەکەی عەزیا بۆ لای کیژەکە چوو کە بیخوا. کچ هاواری دەگەیشتە ئاسمان.
ئەرنج بە خۆی گوت:« خۆڵم بە سـەر، پاڵەوانی من فایدەی چیە کە لە بەر چاوی من عـەزیا ئەو کیـژە بخوا.؟» عەزیـا وردە وردە لە کیژەکە وەنیزیک کەوت. ئەرنج هەڵیکێشـا شیر و خۆی گەیاندە عەزیا و بە شیر لەت لەتی کرد. ئاوی کانی خوێناوی بـوو. خەڵک بێ خەبەر لە خـوارەوە ئاویان هەڵدەگـرت. ئەرنج چوە کن کیژەکە و لە داری کردەوە و گوتی:« برۆوە ماڵی خۆت.»
کـیژەکـە دەسـتی دە خـوێنی عـەزیا ڕاکـرد و لە پشـتی ئەرنجی دا وبەرەو مـاڵ ڕایکرد. دایک و بابی چوونە پێشوازی و گوتیان:
- کچم بۆ ڕات کرد. ئێستا عەزیا هەموو خەڵکی شار دەخوا.
- نا، بابە گیان، لاوێک کە هەر دوکمان بە قوربانی بین، عەزیای کوشت.
پاشا پرسی: پیم بڵێ کێ عەزیای کوشت؟
کچ گوتی :« لاوێکی نە ناس بوو. نای ناسم. ئەو عـەزیای کوشت. من دەسـتم بە خوێنی عەزیا کردوە و لە پشتی لاوەکەم داوە.»
بەڵام لەم ناوە دا ئـەرنج چۆوە مـاڵی پیـرێژن. پیـرێژن گـۆزەکـانی پڕ لـە ئاو کرد، دیتی نیوەی ئاوەکە خوێنە.
ئەرنج گوتی:« برۆ ئەم ئاوە برێژە و ئاوی خاوێن بێنە.»
- نا، عەزیا لە وێیە، ناڕۆم.
ئەرنج گوتی :« لاوێک عـەزیای کوشتوە.! پیرێژن شـاد بوو، گۆزەی هەڵگرت و بە غـار بۆ کـانی چـوو. دیتی ڕاست دەکـات. کەلاکی عـەزیا لە پەنا کـانی کـەوتوە. پیرێژن گۆزەی پڕ کرد لە ئاو، هێنایەوە ماڵ.
بەڵام پاشـا خـەڵکی کـۆ کـردەوە و گـوتی:« لە نێو ئێوەدا ئـەو کـەسـەی بە شـیـر عـەزیای کوشـتـوە، شـایانی کیـژی منە. بێـتـە پێش و چی دەوێ داوا بکا.» لە ئامادە بوان هەر کەس گوتی من کوشتوومە..
کـیژی پاشـا لە باڵە خـانە وێسـتـا بوو سـەیری دەکـرد. بە بـاوکی گـوت:« ئەوانە هیچیان عەزیایان نە کوشتوە.»

- داخوا کەس لە شار دا ماوە کە نەهاتبێتە ئێرە؟ لە وەڵامدا گوتیان : میوانی پیرێژنێ نە هاتوە
پاشا ناردی ئەرنج... یان هێنا کۆشکی شا. کیژەکە لە دوورەوە ناسی و بە باوکی گوت:« ئەوە هەمان لاوە.»
پاشا پرسی :« بێگومان چونکە زۆر جوانە بۆیە پێت وایە کە هەوە.
کیژەکە گوتی :« نا، وا نیە، من نیشانم لە پشتی داوە. بە تۆم گوتبوو. ئەرنج هاتە کۆشک و کچەکە پشتی کراسەکەی وەرگێڕا و هەموو دیتیان کە شوێنی قامکی کچی پاشای پێوەیە.
پاشا بە ئەرنجی گوت:« ئێستا تۆ بە زۆری شیر بوویە خاوەنی کیژی من. ئێستا چیت دەوێ داوای بکە.
ئەرنج گوتی : « تەنیا یەک شتم دەوێ، ئەویش جێگای هنگرمەنی دێوە و هیچی تر.
پاشا خەمگین بوو گوتی : « هەوەڵ جارە ناوی وا دەبیسم، ڕەنگە سیمرغ بزانێ. ڕێگای دۆزینەوەی ئەوت پێ نیشان دەدەم.» پاشان پاشا جێگای سیمرغ و ڕێگای دۆزینەوەی وی بۆ ڕوون کردەوە. دوایە میوانی ساز کرد و حەوت شەو و ڕۆژ شایی و زەماوەند ساز کرا . ئەرنج حەوتوێک لە کۆشکی پاشا دا ژیانی بردە سەر، بەڵام پاشا لای وابوو چرکەیەک لە وێ ماوەتەوە. پاش حەوتوێک ئەرنج خۆی بۆ سەفەر ساز کرد. پاشا لێی پرسی:« ئەی ئەرنج! بوکی خۆت لە گەڵ خۆت نابەی .؟
ئەرنج ئاڵقەی دەزگیرانی دە قامکی کچی پاشا کرد و گوتی: کە گەڕامەوە دەیبەم.
پاشا گوتی:« سێسەت سوار لە گەڵ خۆت بەرە تا سەر سنوور و دوایە ئەوان بگەڕێنەوە. سوار کەوتنە ڕێ. ئەرنج ئەوەندە قسە خۆش بوو، سوارەکان نەیاندەویست بگەڕێنەوە. ئاخرەکەی گەیشتنە وڵاتی جادوو. سیحر و جادوو کاری لە ئەرنج نە دەکرد. بەڵام سوارەکان تا دەهات کەم دەبوون، لە پێشدا دەیان ون بوون. پاشان بیستیان بزر بوون. ئەوانی مابوون بێیان عەیب بوو بە

ئەرنج بڵێن کە ڕەفیقەکانیان بوون بو بەرد. لە نەکاو ئەرنج ئاوڕی داوە، دیتی کەسی لە گەڵ نەماوە. لە دڵدا گوتی:« ئەی بێ ویژدانینە. تەنانەت خوا حافیزیشیان لێم نە کردوە.بە تەنیایان هێشتوومەوە و ڕۆیشتوون.

ئەرنج نەیدەزانی کە ئەم وڵاتە تەلیسم کراوە. گەیشتە دەشتێک، دیتی دارێک لەو دەشتە یە.. گوتی با بچم لە بن ئەم دارە تاوێک بحەسێمەوە. گەیشتە نیزیک دارەکە و دیتی عەزیایەک لە دارەکە هاڵاوە و دەچێتە سەر. هێلانەیەک لە سەر دارەکەیە و جوجەڵە داعبا لە هێلانەکە دان. دەستیان کرد بوو بە جیکە جیک. کەمی مابوو عەزیا بگاتە جوجەڵەکان و بیانخوا. ئەرنج عەزیای پەلامار دا و کوشتی. پارچە گۆشتێکی عەزیای بە نووکی شیرەوە کرد و دای بە جوجەڵەکان. ئەوان خواردیان تا تێر بوون. ئەرنج لە بن دارەکە درێژ بوو، خەوی لێکەوت. بەڵام جوجەڵەکان بێچووی سیمرغ بوون. هەر ئەو سیمرغەی کە پشتیوان و پارێزەری بنە ماڵەی زاڵ بوو.

سیمرغ دەنگی جوجەڵەکانی بیست، لە بەرزایی ئاسمانەوە هاتە خوار. حەوت ساڵ بوو جوجکەی دەبوون و عەزیا دەیخواردن. قەت بە ئاوات نە گەیشتبوو، جوجەڵەکانی گەورە نە دەبوون. سیمرغ بە تورەیی بۆ لای بێچوەکانی هاتە خوار ودیتی ڕەشاییەک لە بن دارەکە دیارە. ویستی پەلاماری بدا و بۆ ئاسمانی بەرێ. جوجەڵەکان هاواریان کرد: مەیکوژە، مەیکوژە، ئەو ئێمەی نەجات داوە.

سیمرغ لە هێلانەکە نیشت و تەماشای خوارەوەی کرد. دیتی ئەوەی لە بن دار خەوتوە، ئەرنجی کوڕی ڕۆستەم و نەوەی زاڵە. سیمرغ باڵی لێک کردنەوە و سێبەری لێکرد.

ئەرنج لە خەو هەستا دیتی دەور و بەری تاریکە. تەماشای کرد، سیمرغی بینی. سیمرغ بانگی کرد:

– ئەی ئەرنج! تۆ کوڕی ڕۆستەم نی؟ من پشتیوانی بنە ماڵەی ئێوەم. تۆ ئاواتی منت بە جێ گەیاند و بێچوەکانت لە شەڕی عەزیا نەجات دان. ئێستا چیت دەوێ، داوام لێبکە.

ئەرنج گوتی:« تەنیا دەمەوێ جێگای هنگرمەنی دێوم پێ بڵێی.»
سیمرغ بە ئەرنجی گوت:« خۆزیا حەوت ساڵی دیکە عەزیا بێچوەکانی خواردبام و تۆ شـوێنی هنگرمنی دێوت نە پرسـیبایە. بەڵام چونکە سـوێندم خـواردوە بەڵێنی خۆم دەبەمە سەر. دەبێ هەرچی پێت دەڵێم وابکەی.»
ئەرنج گوتی : ئامادەم. سیمرغ گوتی:« ئێستا بچۆ ڕۆخی دەریا و چاوە ڕوان بە تا من بۆ وێ دەفرم.
ئەرنج چوە قەراخ دەریا، کاتێ گەیشتە وێ . شوانێکی بینی مەڕدەلەوەڕێنێ.
ئەرنج سڵاوی لێکرد و پرسی:« ناوت چیە؟»
شوان گوتی :« زرزانی شوانم پێ دەڵێن.» ئەرنج تەواوی ڕووداوەکانی بۆ شوان گێڕایەوە. زرزان گوتی:
– فێرت دەکەم چبکەی. بڕۆ ئەو بەردەی قەراخ دەریا وەر بگێرە. لغاوێک لە بن بەردەکە دەبینی. هەڵیگرە و بیشارەوە. کاتێکی چوویە ڕۆخی ئەو بەری دەریا. کۆشکێک دەبینی. ئەوە کۆشکی هنگرمەنی دێوە. ئێستا هنگرمەن خەوتوە. چوار ڕۆژی دیکەش لە خەودا دەبێ. تۆ هەوڵ بدە وەخەبەری بێنی. بەڵام ئەو خەبەری نابێنەوە. ئەو دەم خەنجەری لە بەری پێی ڕۆکە و خوێ بە برینەکە دابکە. کاتێ دێو وەخەبەر هات، لغاوەکەی پێ نیشان بدە. دەست لە جێ دەبێتە ئێستر. لە حەساری ببەستەوە و بچو ڕۆستەمی بدۆزەوە. ڕۆستەم لە سارداودا بەند کراوە. دێو تەلەسمی کردوە و بە زنجیر بەستوویەتەوە.
لەو کاتە دا سیمرغ هات. ئەرنج پێی گوت: من بەرە ئەو بەری دەریا،
– تا ئێستا هنگرمن سێ جار باڵەکانی منی هەڵکەندوە. بەڵام چونکە تۆ ئاواتی منت بە جێ گەیاندوە، چارم نیە دەتبەمە وێندەرێ. کاتێکی فریم و ڕۆیشتم، باڵێکی من هەڵکەنە، کاتێکی پێویستت بە من هەبوو، ئەو باڵە لە بەرد بدە، کورج دەگەمە لات.
سـیـمـرغ ئەرنجی بردە ئەو بەری دەریا. ئەرنج چوە ناو کۆشک و دیتی دێو نوستوە. شیری دە بەری پێی ڕاکرد، وەخەبەر نەهات. خوێ بە برینەکەی وەر کرد، دێو خەبەری بۆوە. ئەرنج لغاوەکەی نیشاندا، دێو بوو بە ئێستر. ئەرنج

لغاوی کرد و له دار بەستیەوە. خۆی چوە سارداو، دیتی رۆستەم لەسەر پشت به زنجیر بەستراوەتەوە.
رۆستەم دیتی که ئەرنج هاتوە نەجاتی دەدا. بەلام ریشی ئەوەندە هاتوە وەک ریشی ئاخوندان. ئەرنج تیغێکی هێنا دەر کە ریشی بتاشێ. رۆستەم پرسی چدەکەی؟
- دەمەوێ ریشت بتاشم تا خەلک نەڵێن کە رۆستەم پیر و لاواز بوە، بۆیە دێو به سەریدا زاڵ بوە. ئەگەر ریشت بتاشم خەلک ئێژن:« رۆستەم گەنج بوە، ئاقلی کەم بوە، دێو بە فێڵ گرتوویەتی.»
رۆستەم تووڕە بوو، دەنگی دا و گوتی: برۆ لە بەر چاوم ون بە.
ئەرنج لە سارداو هاتە دەر و سواری ئێستر بوو ڕێی داگرت. لە پڕ دەنگی پساندنی زنجیری رۆستەمی بیست، دەتگوت هەوری بەهارە گرمەی دێت. ئەرنج گەڕایەوە دیتی بابی لە کۆشک هاتۆتە دەر و کۆشکی دێویشی وێران کردوە.
ئەرنج لە ئێستر دابەزی و دای بە بابی. پاشان پەڕی سیمرغی هێنا دەر و لە بەردێکی دا. سیمرغ گورج پەیدا بوو بە ئەرنجی گوت:« با باوکت بە ڕێگای وشکیدا بڕوا، من دەتگەیێنمە ئەو بەری دەریا.
رۆستەم سواری ئێستر بوو کەوتە ڕێ. سیمرغیش ئەرنجی هەڵگرت و بردیە ئەو بەری دەریا دیتیان رۆستەم لە وێ ڕاوەستاوە. سیمرغ خوا حافیزی کرد و چوە کن بێچوەکانی. ئەرنج چوە کن زرزانی شوان، ئەسبی خۆی هەڵگرت و ویستی بڕوا، شوان گوتی: « ڕاوەستە، من ئێستا دەمرم، بمنێژە و دوایە برۆ.
زرزانی شوان مرد، لەوێ ناشتی و پاشان لە گەڵ بابی کەوتە ڕێ. گەیشتنە شارێک هەر تکیان ئەوەندە برسی بوون زمانیان نەدەگەڕا. ئەرنج بە باوکی گوت:« هەر لێرە چاوە ڕوانم بە، بەلام ئاگات لێ بێ لغاوی لە سەر نەهێنیە خوار. چونکە لغاو لە سەری بێنیە خوار، دەبێتەوە هنگرمن و دەرۆستی نایەین. منیش دەچمە شار. خواردنێک پەیدا کەم.
ئەرنج بۆ شار چوو دیتی لە جێیەک شین و گریانە و لە شوێنێ شایی و زەماوەندە. لە گەنجێکی پرسێ:« لەو شارە چ باسە. چ قەوماوە.؟

- هەموو شەوێ کیژی پاشا بە شو دەدەن. لە ماڵی پاشا دە بێتە شایی و زەماوەند. لە ماڵی زاوا دە بێتە شین و گریان. چونکە ڕۆژی دوایی زاوا بە مردوو دەبینن. کچەکەش هیچی لێ نایە.»

ئەرنج گوتی:« دەکرێ منیش بۆ شایی بەری.»

- بۆ ناکرێ، وەرە با بچین. چوونە مەجلیسی شایی. ئەرنج دیتی کۆشکێکی جوان و ڕووناک و بوک لە پەنا زاوا دانیشتوە. زاوا خەمبار و داماوە و بوک پێدەکەنێ. ئەرنج چوە کن زاوا و پێی گوت:« بوکی تۆ وەک خوشکم وایە. با ئیمشەو لە جیاتی تۆ بچمە کنی. تۆ لە مردن رزگار دەبێ و من دەکوژن. من غەریبم لێرە و قەی ناکا.

زاوا ڕازی بوو، دایک و بابی زاوا کەیف خۆش بوون کە کورەکەیان زیندوو دەبێ. ئەرنج گوتی :« تەنیا ئێستا هێندێ خواردنم بدەنێ. بابم برسیەتی بۆی بەرم و بێمەوە. خواردنی جۆر بە جۆریان بۆ هێنا، ئەویش خواردنەکانی بۆ رۆستەم برد و دیتی رۆستەم ئێسترەکەی کوشتوە. لێی پرسی؛« ئێسترت بۆ کوشت.؟ هیچ ئەسپێک تۆ ناتوانێ هەڵگرێ، ئەو ئێسترە بە زەحمەت دەیتوانی تۆ بە ڕێوە بەرێ.

رۆستەم گوتی :« ئاخر ئێرە بەشێک لە وڵاتی قەرالی کافرە، هەموو جادوگەرن. لە وانەیە لغاوەکە بە جادو لە سەری ئێستر بکەنەوە. ئەو کات چ بکەین. منیش کوشتم.

ئەرنج بابی بردە مەجلیسی شایی. هەوا دەهات تاریک دەبوو. ئەرنج چوە کن بوکێ. کیژەکە جێگای چاک کرد و لە پەنا ئەرنج درێژ بوو. ئەرنج شیری لە کالان هێنا دەر و لە نێوان خۆی و کیژەکە درێژی کرد و گوتی :« تۆ لە جێگای خوشکی منی.»

کیژەکە خەوت و ئەرنج لە جێ هەستا و لە قوژبنێک خۆی شاردەوە. نێوە شەو دەنگی تەق و تۆق و هەرا لە سەر بان دەبیسرا و لە پڕ لە کولانەی میچی خانوو دەستێک هاتە دەر و نێو جێگا دەگەڕا. لە سەر جێی کیژەکە کەسی نەدیتەوە. پاشان ئەو دەستە لە ژورەکە دەستی بە گەڕان کرد. ئەرنج دیتی کە

ئەو باسک و دەستە لە پۆلایە. شیری هەڵگرت و باسکی پەڕاند. پاشان شانی خاوەن باسکی گرت و کێشایە خوار دێو بوو. کەم کەم لە کولانە هاتە دەر و خوشکیشی لە گەڵ بوو. خوشکی دێو دەنگی ئەرنجی دا و گوتی :
– دوو برای منت کوشتن. ئێستا دەستی سێیەمیشت پەڕاند. ئەوی مەکوژە. ئەگەر بەرەڵای بکەی، ئەو سێسەت سوارەی کردبومن بە بەرد، زیندوون و دەیانهێنمەوە.
ئەرنج بەڵێنی لە خوشکی دێو وەر گرت و دێوی ئازاد کرد. با دێو و خوشکی لە وێ بن، بزانین سوارەکان چیان بە سەر هاتوە. خوشکی دێو سوارەکانی ئازاد کرد و چوونەوە ماڵی خۆیان.
لەم ناوە دا پاشا بە نۆکەرانی گوت:« بێگومان ئێستا مەیتی زاوا ئاوساوە، بیهێننە دەر و بیبەنەوە ماڵی خۆیان. کیژەکەش بێننە ئێرە. نۆکەر چوون دیتیان لاوەکە لە جێگادا خەوتوە و دەستێکی پۆلایی لە ژورەکە کەوتوە. حەوت جوت گایان هێنا تا دەستەکەیان ڕاکێشا دەرێ. ئەرنج زاوای بانگ کرد و گوتی:« بڕۆ بوکت بەرە و بە ئاواتی خۆت بگە.
ئەرنج و ڕۆستەم سواری ئەسبان بون و بۆ ماڵی خۆیان کەوتنە ڕێ. گەیشتنە ئەو شارە کە ئەرنج لەوێ عەزیای کوشتبوو. پاشا حەوت شەو و ڕۆژ جێژنی بوکێنی کیژەکەی بەر پا کرد و پاشان کاروانێک جیاز و دیاری دا بە کیژەکەی، ئەرنج و بوک خواحافیزیان لە پاشا کرد و کەوتنە ڕێ تا سەفەری خۆیان درێژە پێبدەن.
گەیشتنە شارێک کە ئەرنج لەوێ دێوی کوشتبوو. پاشای وێش شایی و زەماوەندی بۆ کیژەکە ساز کرد و دای بە ئەرنج و کاروێنێک جیاز و دیاری دایە و کەوتنە ڕێ. ئێستا بچینەوە بۆکن زاڵ.
زاڵ دیتی دە ساڵ تێپەڕی، ڕۆستەم و بەدران و ئەرنج هیچ خەبەریان نەبوو. خۆی بۆ سەفەر ساز کرد تا لە گەڵ خاو وخێزانی خۆی بە دوایان بکەوێ. ڕۆیشتن تا گەیشتنە ئەو شارە کە بەدران لە وێ لە چاڵاودا بەند کرا بوو. ڕۆستەم و ئەرنج-یش گەیشتنە ئەو شارە، هەموو بە دیداری یەک شاد بوون.

بەلام بەدران لە کوێیە، نەیاندەزانی. زاڵ گوتی :
- وەرن خانوێکی خێرات ساز بکەن، بەڵکوو خەبەرێکی بەدرانمان وەگیر کەوێ.
خانوێکی خێراتیان ساز کرد. لە هەموو دنیا  فەقیریان بانگ کرد ن و خواردن و لیباس و پێڵاوی بە لاشیان دا بە خەڵک.
ئێستا بابچینە کن «گورمیلک». گورمیلک چوە کن پیرێژنێک تا داوای سەدەقەی لێ بکات و گوتی:« بەدران لە چاڵاو دایە، برسییە، هێندێ نانم بدیە.
پیرێژن گوتی :« برۆ لەوێ خانوی خێراتیان کردۆتەوە، خۆت چەندت دەوێ بخۆ و خواردن لە گەڵ خۆشت بەرە.
گورمیلک چوە خێرات خانە. ئەرنج تەماشای کرد و دیتی ژنێکی جوان و شرە پۆش سەری دانواندوە و داوای خواردن دەکا. ئەرنج لەگەنێکی مسی پڕ لە پلاو و نان و گۆشت هەڵگرت و دای بەو ژنە. نۆکەرێکیشی بە دوای دا نارد، بزانێ بۆ کوێ دەچێ.
گورمیلک دیتی کە یەکێک بە دوای دا دێت. بە نێو کۆڵاناندا گەڕا تا نۆکەر ونی کرد. پاشان چوە پەنا چاڵاو و لەگەنە خواردمەنیەکەی دە چاڵاوێ هاویشت.
بەدران هەستی کرد کە بۆنی ماڵی وانی لێدێت. خواردنەکەی خوارد و لەگەنەکەی لە بن ئەژنۆی دانا و خواری کردەوە و بە گورمیلکی گوت:« دیسان بۆم بێنە.
گورمیلک گوتی: شەرم دەکەم دوو بارە بچمەوە.
بەدران گوتی : « تۆ حەوت ساڵە خواردنم بۆ دێنی. داخوا دەکرێ ئەو جار بۆم نەهێنی.
گورمیلک دیسان چۆوە خانووی خێرات. ئەرنج دیتی کە ئەو ژنە جارێکی دیکەش هاتەوە. هەموو خواردنێک دایە و خۆی وەدوای کەوت. گورمیلک بە کۆڵانێک دا دەڕۆی و ئەرنج بە کۆڵانێکی دیکە دا وە پێشی دەکەوتەوە.
بەڵێ هیلاکتان نەکەم، هەر تک گەیشتنە پەنا چاڵاو. ئەرنج هاواری کرد و گوتی:
- بەدران تۆی ؟

بەدران وەڵامی دایەوە گوتی :« بەڵێ منم. ئەوە تۆی ئەرنج.؟

ئەرنج لە بەدرانی پرسی: « چۆنە کە تا ئێستا نەت توانیوە لە وێ بێیە دەرێ ؟

– دیارە دە متوانی دەر پەڕم و بەرد ئاشەکە فرێ بدەم ، بەڵام لە وانە بوو دانم بشکێن و پێم حەیف بوو.

ئەرنج بەڵێنی دا کە هەر ئەمشۆ دێم و دەتهێنمە دەرێ.

بەدران هاواری کرد:« ئەگەر قەمبەری بابم لە گەڵ ئێوەیە دەبێ بیکوژم. چونکە سوێندم خواردوە.

ئەرنج بۆ ماڵێ گەڕایەوە و گوتی :« بەدرانم دۆزیوەتەوە. شەو تەناقیان هەڵگرت و تێکڕا بۆ لای چاڵاو ڕۆیشتن. بەرداشیان لە سەر چاڵاو لادا و تەنافیان هاویشتە خوار. بەدران تەنافی لە قەدی خۆی قایم کرد و هەڵیان کێشا. تا نیوەیان هێنا بوو، بەدران چاوی بە قەمبەر کەوت و هاواری کرد و گوتی :« هەر ئێستا دەیکوژم»

ڕۆستەم بە بەدرانی گوت:« ئێستا کە سوێندت خواردوە گورزێکت دەدەمێ، بەڵام گورزەکە بە دەستی چەپ بگرە و بە قەمبەری دادە. لێی بدەی و لێی نەدەی سوێندەکەی خۆت بردۆتە سەر. گورزێکیان دا بە دەستی چەپی بەدران. قەمبەر ڕایکرد و لە پشت دارێک خۆی قایم کرد. گورز وە دارەکە کەوت و دارەکەی لە بن هەڵکەند و قەمبەر زیانی پێنەگەیشت. بەدرانیان لە چاڵاو هێنا دەر و باب و کوڕ یەکتریان لە ئامێز گرت و ئاشت بوونەوە. لیباسێکی تازە و جوانیان کردە بەر گورمیلک و ئەوەندە جوان بوو بە ڕۆژی دەگوت: « تۆ دەر مەکەوە تا من دەر کەوم.» پاشان چوونە شەڕی قەڕالی کافر و کافرەکانیان لە بەین برد و کلیساکانیان وێران کرد و لە جێی وان مزگەوتیان دروست کرد و پاشان چوونەوە وڵات و ماڵی خۆیان. شایی و زەماوەندیان بۆ گورمیلک و بەدران ساز کرد.

ئەوان بە ئارەزووی خۆیان گەیشتن و حیکایەتی ئێمەش کۆتایی هات.

# شا سمایل وعەرەب زەنگی ٥٢

ئەمیری عەرەب لە تایفەی خۆی تورە بوو لە گەڵ خاو و خێزانی ڕووی کردە بارەگای ئەسڵان پاشای کورد. ئەسڵان پاشا ڕۆژێک تەماشای کرد حوشتری بێگانە لە مەزرای ئەو دەلەوەڕێن. بە نۆکەرانی گوت:

- بڕۆن سەری ئەو کەسانە ببڕن کە وێراویانە حوشتران لە مەزرای من بەرەڵا بکەن. حوشترەکانیش بێننە ئێرە.

نۆکەر چوون. گولیزاری کیژی ئەمیری عەرەب لە خێوەت هاتە دەر. نۆکەر بە دیتینی وی ئاقڵیان لە سەر دا نەما. چونکە گولیزار فرە جوان و دڵگر بوو. یەک لە نۆکەران هاتە کن ئەمیری عەرەب و لای ئەو مایەوە. ئەوی ددیکەیان چۆوە کن ئەسڵان پاشا و گوتی :

- مزگێنیم دەیە. کیژێکم دیوە شایانی شا سمایلی کوڕی تۆیە. شا سمایل سوار بوو چوە خێوەتی ئەمیری عەرەب. کە چاوی بە گولیزار کەوت بە یەک دڵ و نەک هەزار دڵ ئاشقی بوو. گەڕاوە ماڵ و بە بابی گوت:« ئەو کیژەم بۆ بخوازە.»

ئەسڵان پاشا لە گەڵ وەزیر و وەکیلی خۆی چوە کن ئەمیری عەرەب و داوای گولیزاریان کرد بۆ شا سمایل.

ئەمیری عەرەب مانگێک مۆڵەتی خواست و گوتی:« دەبێ جیاز بۆ کچەکەم ئامادە بکەم.»

شا سمایل زۆر جار دەهات و چاوی بە گولیزار دەکەوت، ئاڵقەی دەزگیرانیان گۆڕیەوە. ڕۆژێک شا سمایل هاتە هەواری ئەمیری عەرەب و دیتی خێوەت لە وێ نەماوە. شا سمایل گریا، چوە ئەو شوێنە کە خێوەتی گولیزاری لێ هەڵدرا بوو،

دیتی نامەیەک لە بن بەردێک دانراوە. شا سمایل نامەکەی هەڵگرت و خوێندیەوە. نامەی گولیزار بوو تێیدا نووسیبووی: « بابم لێرە باری کرد و ئێمە ڕۆیشتین. چل ڕۆژ ماوەت هەیە، ئەگەر لەو چل ڕۆژەدا هاتی، ئەوا من هی تۆم، دەنا قەت مەیە. بابم فیکری کردوە ئەگەر کچی بدا بە کوڕی ئەسڵان پاشا، تایفەکەی وا دەزانن کە گولیزاریان بە تۆبزی ئەستاندوە، هەر بۆیەش لێرە باری کرد.

شا سمایل فرە دڵتەنگ بوو. ئەسڵان پاشا دیتی کوڕەکەی بە جارێک داما و خەفەتبارە. ئەمری کرد: کە تەواوی خەڵکی خۆ جێ، کچەکانیان بڕازێننەوە و لیباسی جوان و شازیان دەبەر کەن و بیانهێننە باخی کۆشک تا شا سمایلی کوڕی یەکیان هەڵبژێرێ و بیهێنێ.»

ڕۆژی دوایی تەواوی کیژانی پیاو ماقوڵان لیباسی جوانیان دەبەر کرد و هاتنە باخی کۆشک. شا سمایل- یش هات و سەیری هەموانی کرد و گوتی :« هێندێ سووریان دەبەر کردوە و هێندێ سپی. بەڵام هیچیان نابنە گولیزار. شا سمایل لە باخ وەدەر کەوت و بڕیاری دا بچێ گولیزار بدۆزێتەوە. ئەسبی شا سمایلیان ئامادە کرد، سوار بوو، کەوتە ڕێ. دەڕۆی و شیعری دڵداری دەخوێندەوە.

بەڵێ شا سمایل ڕۆی ڕۆی تا گەیشتە شوێنێ دیتی کۆشکێک هەیە و حەسارێکی ئاسنی بە دەورەیدا کێشراوە. کیژێکیش لە کۆشک دا دانیشتوە.

شا سمایل هاواری کرد:« ئەی حەسار بکرێوە تا بێمە ژوور.»

کیژەکە ناوی گولپەری بوو، گوێی لە قسەکانی وی بوو گوتی :« ئێرە پردێکە لە موو باریکتر و لە شیر تیژ ترە. ئەگەر تواناو غیرەتت هەیە لێی وەبەڕە و وەرە لام.

شا سمایل شیری زولفەقاری هەڵکێشا و لە حەساری دا. حەساری ئاسن تێک قرما و شا سمایل چوە کن گولپەری.

گولپەری گوتی :« وا دیارە کە عیزرائیل لوتفی کردوە هاتوویە دیدارم.»

شا سمایل گوتی :« من هێشتا پاروە نانێکم لە ماڵی تۆ نە خواردوە و قومە ئاوێکم نە خواردۆتەوە. بەمحاڵە تۆ خەمگین بووی.

- ئەگەر من خەمبار نە بم، کێ خەمبار بێ؟ حەوت برام هەبوون. چوونە شەڕ، دوویان کوژراون و پێنجیان زیندوون.
- لە بۆ کێ شەڕ دەکەن ؟
- لە بەر من. ئەمیری عەرەب دەیەوێ مێرد بە کوڕی وی بکەم. بەلام براکانم نایانەوێ. ئەو دیوارە ئاسنەیان لە دەوری کۆشک کێشاوە کە دەستی کەسی پێڕانەگات.
شا سمایل پرسی :« بە چی دەزانی دوو برات کوژراون.؟»
- فالم گرتۆتەوە و زانیومە.
شا سمایل جارێکی دیکەش پرسی: « لە کوێ شەڕ دەکەن ؟» گولپەری لای ڕۆژ هەلاتی نیشان دا. شا سمایل سوار بوو بە کۆمەکی براکانیەوە چوو. گەیشتە مەیدانی شەڕ و دیتی لەشکری ئەمیری عەرەب لە لایەک سەفیان کێشاوە وپێنج برای گولپەریش لە لایەکی تر.
شا سمایل فیکری کردەوە کە :« من سلاو دەکەم. هەر لایەک وەلام بداتەوە. لە لای ئەو دەبم.» سلاوی کرد. لە تایفەی عەرەب کەس وەلامی نە دایەوە. بەلام پێنج براکە وەلامیان داوە و سلاویان بۆ نارد. شا سمایل ڕەگەڵ وان کەوت. بەیانی پێش مەیدان بە برایانی گوت:« ئێوە مەچنە شەڕ. من تەنیا دەچم. شا سمایل لە بەیانیەوە تا ئێوارە شەڕی کرد و عەرەبی لە بەین بردن. ئێوارە گەڕاوە لای براکان. پێنج برا گوتیان: « ئێستا دەچینە ماڵی ئێمە. کەوتنە ڕێ. برای گچکەیان لە بەراییدا نارد و گوتیان برۆ خواردن ئامادە بکەن تا ئێمە دەگەینێ.»
برای گچکە ڕۆی دیتی حساری دەوری کۆشک ڕوخاوە. گەڕاوە و بە براکانی گوت. براکانی گوتیان:« زوو برۆ خوشکمان بکوژە و خواردن ئامادە بکە. هاتە کۆشک و بە خوشکی گوت:« براکان ئەمریان کردوە تۆ بکوژم.
گولپەری گوتی:« مەمکوژە. لە سندوقێکدا بمشارەوە. پاشان ئەو پیاوەی لە گەڵتانە ڕوو داوەکەتان بۆ دەگێڕێتەوە، ئەو دەم دەمکوژن خۆتان دەزانن.
برای گچکە بە قسەی گولپەری کرد. برایان لە گەڵ شا سمایل هاتنە ژوور لە

سەر سفرەی خواردن دانیشتن. بەڵام شا سمایل دانەنیشت. برای گەورە بانگی کرد و گوتی :« وەرە لە گەڵ ئێمە نان بخۆ.
شا سمایل پرسی :« خانمی ماڵ لە کوێیە.؟
برای بچوک گوتی : من کوشتومە.
- بۆ چی ؟
- چونکە پیاوێکی ڕێدابوو بێتە لای. حەساری دەوری کۆشک ڕوخا بوو.
شا سمایل گوتی :« ئەم حەسارە من خەرام کرد. من دەستم بۆ گولپەری درێژ نە کرد، ئەو وەک خوشکی من وا بوو.
ئەودەم برای بچوک گوتی :« من نەمکوشتوە و گولپەری زیندوە. گولپەری لە سندوق هێنا دەر و هەموویان بەوە شاد بوون کە خوشکیان زیندوە.
برایان بە شا سمایلیان گوت:« گولپەری دەدەین بە تۆ و بیکە ژنی خۆت. شەو لە گەڵ گولپەری جێیان پێکەوە بۆ داخستن. شا سمایل پشتی دە گولپەری کرد و نوست.
گولپەری پرسی :« بۆ پشتت لە من کردوە؟
شا سمایل گوتی:« دەبێ لە پێشدا گولیزار بدۆزمەوە، پاشان لە گەڵ تۆ شایی بکەم. بەیانی زوو ماڵاوایی لە برایان خواست و کەوتە ڕێ. برایان تا سێ ڕێیانێک بە ڕێیان کرد و گوتیان:
- ڕێگای یەکەم دەچێتە شام. ئەگەر بە ڕێگای دووەم دا بڕۆی لە وانەیە بگەڕێیەوە. بەڵام ئەگەر بە ڕێگای سێیەم دا بڕۆی، هەر گیز ناگەڕێیەوە.
شا سمایل گوتی:« ژیان بۆ من نرخی نیە بە ڕێگای سێیەم دا دەڕۆم» ڕۆی ڕۆی دیتی لە ترۆپکەی چیا کۆشکێک هەیە و باخێکی جوان لە دەورەیەتی و لە نێو باخەکەدا حەوزێکی مەڕ مەڕی تێدایە. لە ئەسپ دابەزی و ئەسپی بەرەڵا کرد بلەوەڕێ. خۆی دانیشت بحەسێتەوە. لە نەکاو دەنگێکی بیست کە دەیگوت:
- کێیە وێراویە بێتە ئێرە، چما نازانی کە عەرەب زەنگی لێرە دەژی. هەر کەس بێتە ئێرە بە زیندویی ناگەڕێتەوە.
شا سمایل جوابی داوە، گوتی : « بە هەڵکەوت ڕێم دێرە کەوتوە، ڕێگام بزر

کردوه، نیشانم ده، چۆن دەچمە دەرێ، تا ڕێگای خۆم بگرم و برۆم.
– بزانە، من دوو قەلاّم دروست کردون، یەکیان لە لاشەی کوژراوان و یەکیان لە کەللە سەریان. لاشەیەک و کەللە سەرێکم کەم بوو. باشبوو ئێستا تۆ دەکوژم و ساختومانی قەلاکانیان پێ تەواو دەکەم. پاشان عەرەب زەنگی هاواری کرد:« وەرە دەرێ تا شەڕ بکەین.»
شا سمایل و عەرەب زەنگی شەڕیان دەستپێکرد. بە گورز شەڕیان دەکرد. ڕۆژێکی تەواو لێکیان دا. کاتی ئێوارە عەرەب زەنگی گوتی :
– بەسە با بچینەوە ماڵ. چوونەوە ماڵ و برینی یەکتریان برژاندەوە. ڕۆژی دوایی بە شیر شەڕیان کرد تا ئێوارە و دیسان گەڕانەوە. شا سمایل نیوە شەو وەخەبەر هات ، دیتی عەرەب زەنگی لە خەودا بزووتوە و لێفەی لە سەر لاچوە و مەمکی ڕووت بوونەوە، لێی ورد بۆوە، دیتی مەمکی ژنانە. ڕووی وەر گێرا و نوست. ڕۆژی سێیەم زۆرەوانیان گرت. شا سمایل دەستی گەیاندە سینگی عەرەب زەنگی و ئەوەندەی توانی مەمکی کوشی. عەرەب زەنگی ناڵاندی و کەوتە عەردی. شا سمایل خەنجەری دەرێنا و لە سەر سنگی عەرەب زەنگی ڕاگرت. عەرەب زەنگی سنگی ڕوت کرد و گوتی :« لەعنەت لە تۆ، چدەکەی، من کیژێک زیاتر نیم.
شا سمایل گوتی :« خۆڵ بە سەرم. سێ ڕۆژە ناتوانم بە سەر کیژێکدا زاڵ بم. لەو کاتە دا عەرەب زەنگی دەستی خستە ملی شا سمایل و لە عەردی دا و هاواری کرد و گوتی :
– بەد بەخت، من ڕۆژی هەوەڵ دەمتوانی بە زەبرێک لە بەینت بەرم، بەڵام خوشم ویستی و بەزەییم پێت داهات. پاشان لە سەر سنگی شا سمایل هەستا ولیباسی ژنانی کردە بەر و وەک ڕۆژ جوان بوو.
شا سمایل پرسی: « بۆ لیباسی پیاوانت دەبەر کرد بوو.؟
عەرەب زەنگی گوتی : « برایەکم هەبوو سەر کردەی چل ڕێگر بوو. هەر چلیان بە نۆرە دەچوونە ماڵی یەکتر و لە گەڵ ژنانی ماڵ. لە گەڵ خوشک و دایک و ژن و کچی یەکتر دەنوستن، کە نۆرەی من هات،لیباسی پیاوانم کردە بەر و لە

گەڵیان بە شەڕ هاتم. هەموویان و برای خۆشم کوشت. لەو دەمەوە لیباسی پیاوانم دانەکەندوە. بریارم داوە هەر کەسێ بمشکێنێ، دەبمە ژنی وی. تۆ منت شکاند، تۆم خۆش دەوێ و دەبمە ژنی تۆ.

شا سمایل گوتی :« دەبێ لە پێشدا بە ئاواتی خۆم بگەم و دوایە تۆ بێنم.»

- ئاواتی تۆ چیە ؟

- دەبێ گولیزار بدۆزمەوە و بیهێنم.

عەرەب زەنگی گوتی :« تۆ بە تەنیا ئەو کارەت پێ ناکرێ، من لە گەڵ تۆ دێم و یارمەتیت دەکەم. پێکەوە سوار بوون و کەوتنە رێ. گەیشتنە هۆبەی ئەمیری عەرەب، لە کن پیرێژنێک گیرسانەوە.

شا سمایل لە پیرێژنی پرسی:« دایە گیان، ئایا کیژیک لێرە هەیە بە ناوی گولیزار، کچی ئەمیری عەرەبە.؟

پیرێژن گوتی : « بەڵێ هەیە، من هەموو حەوتوان دەچم سەری دەشۆم. سبەی ڕۆژی بوکێنیەتی و لە وەزیری پیری مارە دەکەن.

شاسمایل گوتی:« دایە گیان ئەم ئەنگوستیلە بەرە و بیدەیە. بڵێ خاوەنی ئەم ئەنگوستیلە لە ماڵی تۆیە.»

پیرێژن ئەنگوستیلەی برد و چوە کن گولیزار. دیتی گولیزار دانیشتوە و کچی دۆستی دەوردیان داوە. گولیزار بە دەستێک خەنجەر و دەستێکیش پیاڵەیەکی ژاری پێبوو. پەیتا پەیتا دەیگوت:« هەر کەس بۆ لام بێ خۆم دەکوژم.»

پیرێژن چوە کنی و ئەنگوستیلەی نیشان دا. گولیزار ئەنگوستیلەی ناسی و لە پیرێژنی پرسی: « خاوەنی ئەم ئەنگوستیلە لە کوێیە ؟»

- لە ماڵی منە. گولیزار گوتي: « سبەی لە گەڵ کچان دەچمە سەیراني باخ و گوڵزار. بە شا سمایل بڵێ: بێتە وێندەرێ و بمبات.

پیرێژن هاتەوە و بۆ شا سمایلی گێڕاوە. ڕۆژی دوایی کاتێ گولیزار لە باخ دەگەڕا، شا سمایل گەیشتە وێ. دەستی گولیزاری گرت، سواری ئەسپی کرد و بە غار لەوێ دوور کەوتەوە. عەرەب زەنگی لە پەنا جادە چاوە ڕوانی بوو.

شاسمایل گوتی :« دەبێ لە پێشدا سەبارەت بە گولیزار شەڕ بکەم و پاشان

بیبەم. گولیزاریان لە کن پیرێژن دانا و خۆیان گەڕانەوە. لە بەیانیەوە تا ئێوارە لە گەڵ تایفەی ئەمیری عەرەب شەڕیان کرد و هوموویان قڕ کردن. ئەو دەم شا سمایل و عەرەب زەنگی گولیزاریان هەڵگرت و کەوتنە ڕێ. گولیزار لە پاش تەرکی عەرەب زەنگی سوار ببوو. لە ڕێگادا عەرەب زەنگی ڕانی گولیزاری دەقورنجی. گولیزار هاواری کرد. شا سمایل ئەسپی ڕاگرت و گوتی : چ قەوماوە وا هاوار دەکەی؟

گولیزار گوتی :« بزانە نۆکەرەکەت چدەکا؟

شا سمایل قاقا پێکەنی. گولیزار گوتی :« ئەو پێکەنینە چیە ؟ دیارە تۆ بە نۆکەرەکەت ناوێری.

عەرەب زەنگی پێکەنی و کڵاوی لە سەر کرد و پرچەکانی نیشان دا و گوتی: « بزانە منیش وەک تۆ ژنم.»

گولیزار هاتەوە سەر خۆ، بەڵام هەر لەوێ قەراریان دانا بە کەس نەڵێن کە عەرەب زەنگی ژنە. کەوتنە ڕێ و گەیشتنە کۆشکی گولپەری. گولپەری و پێنج براکەیان هەڵگرت و ڕۆیشتن تا گەیشتنەوە وڵاتی ئەسڵان پاشای بابی شا سمایل. لە دەرەوەی شار خانوێکیان بۆ خۆ دروست کرد و کردیانە مزڵی خۆیان.

.ڕۆژێ شا سمایل ئەسڵان پاشا و وەزیری بە میوانی بانگ کرد. ئەسڵان پاشا گولیزاری چاو پێکەوت و ئاشقی بوو، ئارامی لێ هەڵگیرا، کاتێ گەڕانەوە بە وەزیری گوت:« ئەگەر گولیزار نە بێتە هی من، لە داخان دەمرم.

وەزیر گوتی : شا سمایل بانگێشتن کە و ، ژاری بدەیە تا بمرێ و تۆ گولیزار بێنە.

ئەسڵان پاشا نۆکەرێکی ناردە کن شا سمایل و گوتی:« باوکت تۆی میوان کردوە.» شا سمایل گوتی:« تۆ برۆ، من سەعاتێکی دیکە دێم .»

نۆکەر رۆی. شا سمایل ژنەکانی خۆی بانگ کرد و گوتی : « ئەسڵان پاشا داوەتی کردووم.» گولپەری فاڵی گرتەوە و گوتی:

- ئەسڵان پاشا دەیەوێ ژار خواردوت کا، بەڵام مەترسێ، ئەنگوستیلەی من لە

دەوری خواردنەکت دابنێ، ژار کارت لێناکات.
شا سمایل وایکرد. ئەسڵان پاشا دیتی شا سمایل ژاری خوارد و هیچی لێنەهات. لە وەزیری پرسی: چی لە گەڵ بەکەم.؟
- جارێکی دیکەش بانگێشتنی کە و قوڵکێک لە بەر دەرگا هەڵکەنن تا دەوێ بکەوێ. پاشان پەلاماری دەدەین و دەیکوژین.
ئەسڵان پاشا جارێکی دیکەش بە دوایدا نارد و داوەتی کرد. گولپەری فاڵی گرتەوە و گوتی:
- ئەسڵان پاشا چاڵی بۆ هەڵکەندووی تاتێی بکەوی. بەڵام مەترسێ. سەگ لە گەڵ خۆت بەرە و با لە پێش تۆدا بڕوات، بە هەر جێیەکدا چوو بە دوای ویدا بڕۆ. شا سمایل وایکرد و ئەسڵان پاشا دیتی ئەمجاریش فێڵەکەی نەیگرت. هاواری کرد:
- خەریکە دیق بکەم. گولیزارم بۆ بێنن.. وەزیر پێی گوت:» دەبێ بزانی کە چۆن دەتوانی هێزی شا سمایل ببەستی.»
ئەسڵان پاشا جاریکی تریش شا سمایلی داوەت کرد و لێی پرسی: » چۆن دەکرێ هێزی تۆ ببەسترێ.»؟
شا سمایل گوتی:» لە کۆڵەکێک تەناف بێچم بکە تا بە سەر مندا زاڵ بی.»
ئەسڵان پاشا فەرمووی تا شا سمایل توند لە کۆڵەکێک ببەستن. پاشان بانگی جەلادی کرد و گوتی:» بڕۆ شا سمایل بکوژە.»
شا سمایل خۆی ڕاوەشاند و تەنافەکەی پچڕاند. ئەسڵان پاشا توڕە بوو گوتی: » تۆ درۆت لە گەڵ کردم. ئێستا پێم بلێ بە چی دەتوانم هێزت ببەستم و بە سەرت دا زاڵ بم.؟»
- تەنیا کاتێ دەتوانی بە سەر مندا زاڵ بی، کە قامکی گەورەی دەستم بە زێی کەوان ببەستی.
ئەسڵان پاشا ئەمری کرد زێی کەوانیان هێنا و قامکە گەورەکانی شا سمایلیان بەست. بانگی جەلادی کرد و گوتی : » لە سەری بدە.»
شا سمایل هەر چی کردی خۆی پێ نەجات نەدرا. ئەسڵان پاشا گوتی: » زوو

لە سەری بدە.»

دەور و بەری شا سمایل هاواریان دەکرد: نابێ شا سمایل بکوژرێ. ئەسلان پاشا لێیانی پرسی: « چۆن دەتوانم لە دەستانی رزگار بم.»؟

گوتیان : چاوەکانی دەر بێنە با کوێر بێ.. جەلاد چاوی شا سمایلی هێنا دەر و کوێری کرد و بردیان لە جەنگەڵ بەرەڵایان کرد.

پیرە مێردێک بە کەرێکەوە بە وێدا ڕادەبرد. شا سمایل دەنگی لاقی کابرای بیست و بانگی کرد:

– ئەی پیاوی چاک، من بەرە کن ئاو. پیرەمێرد سواری کەری کرد و بردیە پەنا کانی. شا سمایل لە پەنا کانی دانیشت و پرسی:

لە شاری ئێوە چباسە ؟

– دەڵێن ئەسلان پاشا چاوی کوڕی خۆی دەرهێناوە و کوێری کردوە. کوڕەکەیان لە شار دەر کردوە و کەس نازانی زیندوە یا مردوە و چی بەسەر هاتوە. هەمووی ئەم کارەساتەش لە بەر گولیزارە.

شا سمایل پرسی: باشە گولیزار دەبێتە ژنی کێ؟

پیرە مێرد گوتی: « عەرەب زەنگی هێناویەتی. ئەسلان پاشا لەشکری ناردۆتە شەڕی وی. عەرەب زەنگی هەموو لەشکرەکەی قڕ کردوە.

پیرە مێرد ڕۆی و شا سمایل بە جێ ما و لە بن دارێک دانیشت. دوو کۆتر هاتن لە سەر دارەکە نیشتن. یەکیان لە ویتری پرسی:

– خوشکێ، ئەم لاوە کێیە.؟ جوابی داوە: « شا سمایلە و کوێرە.»

– وەرە دوعا بکەین چاوی ببینێ و چا بێتەوە. کاتێ لێرە فرین و ڕۆیشتین، پەڕێکی ئێمە دەکەوێ. ئەگەر شا سمایل نە نوستوە. قسەکانی ئێمەی گوێ لێ دەبێ، ئەگەر نوستوشە لە خەو دەبینێ. دەبێ ئەو پەڕە هەڵگرێتەوە. دە ئاوی هەڵکێشێ و بە چاوی دابێنێ. دەبێ چاوەکانی دە ئاو دا ڕابگرێ . پاشان چاوی ڕاست لە کالانی چاوی چەپە دابنێ و چاوی چەپەشی بخاتە کالانی چاوی ڕاستەوە. پەڕەکەیان بە سەردا بکێشێ و چا دەبێتەوە و دەبینێ.

کۆترکان فرین. شا سمایل بە کوێرە کوێرە پەڕەکە ی دیتەوە و کۆترەکان

چییان گوتبوو، وایکرد. بەڵام خێل بوو. پاشان چوە شار و دیتیّ شوانێک مەڕ دەلەوەڕێنێ. چوە کن شوان و پێیگوت:« ورگێکم بدەیە.»
شوان ورگە مەڕێکی دایە. شا سمایل ورگە مەڕی بە سەر داگرت و وەک کەچەڵ و بێ مووی لێهات و زەحمەت بوو کەس بیناسێتەوە. هەم کەچەڵ و هەم خێل. پاشان بوو بە کرێکاری پیاوێکی پیر. ڕۆژێک پیرە مێرد بە کزی و داماوی هاتەوە. شا سمایل لێی پرسی:
- بابە گیان بۆچ وا خەمگینی، چ قەوماوە؟
پیرە مێرد گوتی: « کوڕم چۆن خەمبار نە بم. هەر کەسێکی ئەسڵان پاشا دەینێرێتە شەڕی عەرەب زەنگی دەکوژرێ. ئێستا تەنیا پیرە مێردی وەک من ماون. سبەی نۆرەی منە و دەبێ بڕۆم و لە گەڵ عەرەب زەنگی شەڕ بکەم.»
شا سمایل گوتی: « بابە گیان خەم مەخۆ، بچۆ کن ئەسڵان پاشا و بڵێ کوڕێکم هەبوو هەمیشە لە کن مامی دەژیا، ئیمڕۆ گەڕاوەتەوە و دەچێتە بەر بەرەکانی عەرەب زەنگی.»
پیرە مێرد وایکرد. ڕۆژی دوایی شا سمایل چۆە مەیدان و بەرەنگاری عەرەب زەنگی بوو. عەرەب زەنگی نەیدەزانی کە حەریفی شا سمایلە. تا ئێوارە مەیدان داریان کرد، هیچیان سەر نەکەوتن. عەرەب زەنگی گەڕایەوە و گوتی:
- ئیمڕۆ کوڕێکی خێل هاتە مەیدان، هەر چی کردم دەرۆستی نە هاتم. بێگومان سبەی بە دەستی وی دەکوژرێم.
کولبەرگ فاڵی گرتەوە و لە قاقای پێکەنینی دا.
عەرەب زەنگی توڕە بوو، گوتی:« ئەو پێکەنینە چیە ؟ دیارە تۆ دەبیە ژنی وەزیر و گولیزاریش دەبێتە ژنی ئەسڵان پاشا، بۆ ئێوە گرنگ نیە کە من بکوژرێم.»
کولپەری جوابی داوە کە :
- وا نیە. سبەی بە دڵنیایی بچۆ مەیدان. بەڵام شا سمایل بە ئەسڵان پاشای گوت: « تا لیباس و ئەسبی شا سمایلم نەدەیەی، ناچمە مەیدان.» ئەسڵان پاشا سوێندی خوارد کە لیباسی شا سمایل نە ماون، بەڵام ئەسبەکەی بەرە و بچۆ مەیدان.

شا سمایل سواری ئەسبی خۆی بوو ڕووی کردە مەیدان. لە گەڵ عەرەب زەنگی ملانییان گرت و عەرەب زەنگی لە عەردی دا و پێی گوت: « من شا سمایلم» ئەسلان پاشا دیتی کە عەرەب زەنگی وە عەردی کەوتوە، بەلام زۆر بە کەیفە.

ئەسلان پاشا هاواری کرد:

– ئافەرین کوڕی خێل. ئێستا بیکوژە.

شا سمایل گوتی :« بە من ناکوژرێ، وەرە بۆ خۆت بیکوژە. ئەسلان بۆ لای عەرەب زەنگی هات و کە لێی نیزیک بووە، کچەکە ریشی گرت و هاواری کرد:« تف لەو ڕیشەت کە بە زۆر دەتەوێ ژنی کوڕی خۆت بە زۆری بستێنی.»

عەرەب زەنگی سەری ئەسلان پاشای لە عەردی دا و کوشتی. شا سمایل کار و باری وڵاتی گرتە دەست و لایەنگرانی باوکی لە بەین برد، بەلام کاری بە خەڵکی دیکە نەبوو. هەر چوار یان بە خۆشی و شادی ژیانیان دەستپێکرد.

# تلی هەزار ٥٣

× تلی هەزار یانی « قامک هەزار» کیژێکی جوانی ئەفسانەیی کورد بوە کە دەڵێن بۆ دیتنی قامکێکی وی هەزار سکە زێڕیان داوە»

پاشـــایەک بوو سێ کـــوڕی هەبوون. کـــوڕەکـــان گـــەورە بوون و بوونە پیـــاو، گەیشتبوونە تەمەنێک دەبوایە ژن بێنن. وەزیر بە پاشای گوت:
– قیبلەی عالەم سلامەت بێ! کوڕەکانت گەورە بوون، دەبێ ژن بێنن، لەم بارەوە فیکری چیت کردوە؟
پاشا گـوتی :« ئەی وەزیر هەقتـە، با بڕۆم تەگبـیر بە خێزانم بکەم، بزانم ئەو دەڵێ چی.»؟
پاشا چوە کن خێزانی و گوتی:« وەزیرم دەڵێ دەبێ کوڕەکان ژن بێنن. بەڵام من لە دوو دڵی دام. ئێمە هێشتا تاقیمان نەکردوونەوە. دەبێ چبکەین.؟ ژنەکەی گوتی :
– ئەی پاشـا ! ڕێگای تاقـیکردنەوەی کـوڕەکـانمان ئەوەیە کـە هەر یەکـەی هەمبانەیەکی پڕ لە زێڕیان بدەینێ و دەسەڵاتیشیان بدەینێ کە بە ئاقڵ و مەیلی خۆیان ئەو پارەیە خەرج بکەن. بزانین چاکی خەرج دەکەن یان نا.
پاشا ڕازی بوو گوتی : ڕاست دەکەی. پاشـان هەر سێ کوڕی بانگ کرد و هەر یەکەی کیسەیەک زێڕی دایە وگوتی:« چۆنی دەتانەوێ ئەم پارەیە خەرج بکەن.»
کوڕی گەورە دوای پارچە زەوییەکی لە باوکی کرد. خـانوێکی باشی لێ دروست کـرد و کەل و پەلی پێـویست کـری و کـچی وەزیری هێنا و ژیانێکی ئاسـودەی دەست پێکرد

کوڕی نێونجی لاسای برای کردەوە. ئەویش خانوێکی دروست کرد و کچی وەکیلی هێنا و ژیانی ئارامی دەست پێکرد.
با واز لە وان بێنین و بزانین کوڕی گچکە چدەکا.
کوڕی گچکە کە ناوی سودین بوو قەستی سەفەر و گەڕانی کرد. گەیشتە وڵاتی دڕواسێ و دیتی حەیوان لە وێ زۆر هەرزانە. مێگەلێک مەڕی لاوازی کڕی و فیکری کردەوە کە تا دەیانگەیێنمەوە وڵاتی خۆم لە ڕێگا دەلەوەڕێن، قەڵە و دەبن و لە وێ دەیانفرۆشم و پارەیەکی زۆرم وە گیر دەکەوێ.» مێگەلی وەپێش خۆی دا. لە ڕێگا دیتی دێوێکی سامناک لە پەنا ئەشکەوتێک دانیشتوە و چاوێک لە نێو چاوانی شوق دەدا. سودین کەوتە فیکر کە چبکا لە دەست دێو نەجاتی بێت. چوە کن دێو و گوتی: « سڵاو مامە!»
دێو گوتی :« کوڕم سڵاو، تۆ لە کوێ منت ناسی ؟
- مامە گیان ئەو قسانە چیە؟ بابم زۆر جار تاریفی تۆی کردوە. بێگومان لە بیرت نەماوە کە تۆ دەستە برای باوکمی. ئەم مێگەلەش بابم بۆ تۆی ناردوە.
دێو گوتی : « باشە فەرموو بچینە ماڵێ ! سودین چوە ئەشکەوت و چەند مەڕی کوشتەوە و کردیە کەباب و دێو هەمووی خواردن و گوتی - بە بە. چەندە خواردنێکی بە لەزەتە، دەستە براکەم چ خواردنێکی باشی بۆ ناردووم . زۆر سوپاسی دەکەم.
سودین ئەو شەوە لە ئەشکەوت خۆی مات کرد و بەیانی ویستی بڕوا، گوتی : باشە. مامە گیان! ئێستا ئیتر مەرەخەستم کە بڕۆم.
دێو گوتی : « نازانی چت بدەمێ شایانی تۆ بێت.؟»
- هیچم ناوێ، هەر ئەوەندەی تۆم بە زیندویی دیت، بۆ من زۆرە.
- نا. نا. ئەم گۆزەیە هەڵگرە تا لە ڕێگا ئاوی تێکە ی و بیخۆیەوە. سودین گۆزەی وەر گرت و سوپاسی کرد و کەوتە ڕێ. لە بەر خۆی گوتی :« ئێستا چی بە باوکم بێژم.؟» ڕۆی ڕۆی توشی کۆشکێک بوو کە دەور و بەری باخ و لە باخەکەشدا حەوزێک دیارە. گوتی :« ماندو بووم و با لێرە کەمێ بحەسێمەوە و پاشان دەکەومە ڕێ.» چوە پەنا حەوزەکە، دەست و چاوی شوشت و گۆزەی

هەڵگرت کە ناوی تێکا، دیتی تەپ و تۆز زاری گرتوە. فووی لێکرد کە تۆزەکە بڕوا، لەشکرێکی عەرەبان لە بەرانبەری پەیدا بوو. سەر کردەی ئەو لەشکرە هاتە کن سودین و گوتی:
- ئەی سودین ئاغا، چ دە فەرمووی. دنیا خەراب بکەم یاناوەدان.؟
سودین گوتی :« دنیا لە جێی خۆیەتی و ئێمە تێدا دەژین، بۆ چی وێرانی بکەی؟ تەنیا بۆ دوری تۆ دڵم تەنگ ببوو، ویستم بێبینم. دەتوانی ئەو لەشکرە بگێڕیەوە جێی خۆی. لەشکر هەر دەست لە جێ ون بوو.
بەڵام ئەو کۆشکە، کۆشکی« تلی هەزار»ی جوان بوو. ئەو لە پەنا پەنجەرە دانیشتبوو هەموو رووداوەکەی دەبینی. خزمەتکاری خۆی نارده کن سودین و گوتی:
- بڕۆ بەو لاوەی بڵێ کە « تلی هەزار» داوەتت دەکا.» سودین چوە کۆشک و دیتی پەردەیەک بە نێو وەتاغێکی گەورەدا کێشراوە، تلی هەزار لە پشت پەردەکە دانیشتوە و پرسیاری لێکرد:« لاو! کێی، خەڵکی کوێی و بۆ کوێ دەچی «؟
سودین لە وەڵامدا گوتی :« تۆ لە کوێی.؟ بۆ چی هەر گوێم لە دەنگت دەبێ و ناتبینم»؟
- من لێرە لە پشت پەردە دانیشتووم. چۆن دەتوانی بمبینی؟ ئاخر بۆ دیتنی قامکێکی من هەزار سکەی زێڕ دەدەن.»
سودین گوتی:« ناوم سودینە و کوڕی پاشای وڵاتی دراوسێی ئێوەم.»
تلی هەزار پرسی:« ئەی سودین، لە بەرامبەر گۆزەی خۆت دا، چت لە من دەوێ «؟
- ئەگەر تا نێو قەد خۆت ڕوت کەیەوە و خۆت بە من نیشان بدەی ، گۆزەکەی خۆمت دەدەمێ.
- تەماعت زۆرە. خەڵک بۆ دیتنی قامکێکم هەزار سکە زێڕ دەدەن. سودین گوتی:« من هیچم لە تۆ نە ویست. تۆ خۆت پێشنیاری سەودات کرد. ناتەوێ، نەتەوێ. منیش ڕێگای خۆم درێژە پێدەدەم و دەڕۆم.»

سودین گۆزەی هەڵگرت و کەوتە ڕێ.
بەڵام تلی هەزار لە گەڵ خزمەتکار تەگبیری کرد و ویستی سودین بگێڕێتەوە.
فیکری کرد کە : چ قەیدییە با تا نێو قەد بە ڕوتی بمبینێ. هیچم لێ کەم نابێ.
لە بەرامبەر دا ئەگەر ئیرادە بکەم دەتوانم دنیایێک وێران بکەم .
سودین گەڕایەوە. تلی هەزار تا نێو قەد خۆی ڕوت کردەوە و سودین سەعاتێکی تەواو تەماشای کرد. پاشان گۆزەکەی دا بە تلی هەزار و ڕێگای ماڵی خۆی گرتە بەر.
خەبەریان دا بە پاشا کە « سودینی کوڕت گەڕاوەتەوە» پاشا بانگی کرد و لێی پرسی:
- باشە سودین گیان پارەکانت چۆن خەرج کرد؟ برا گەورەکانت خانویان دروست کرد و ماڵ و خێزانیان پێکەوە نا، بڵێ بزانم تۆ چت کردوە ؟
- بابە گیان، ئەوان هەر یەکەی یەک خانویان دروست کردوە، من سەتان خانوم دروست کردوە.
- ڕۆڵە گیان، بڵێ بزانم ئەو خانوانە لە کوێن و تۆ چونت ساز کردوون.؟
- لێرەوە تا حەڵەب هەموو خانوەکان ماڵی منن. من هەر پارەیەکی هەمبوو، بۆ دۆستانم خەرج کرد.
پاشا گوتی: « ئەم کارەی تۆم پێ خۆش نەبوو. سودین چوە کن دایکی و تکای لێکرد کە بە باوکی بڵێ: کیسەیەکی تریش زێڕی بداتێ.» پاشا بە ژنەکەی گوت:« ئیتر نامەوێ پارەی بدەمێ. کوڕێکی ڕێک و پێک نیە.»
- خوا دەوامت بدا و بنە ماڵەت بپارێزێ. ئاخر تۆ پاشای، بۆ چی پەرۆشی کیسە زێڕێکت هەیە.؟ پارەی بدەیە، بزانین ئەمجار چدەکات. سودین لە براکانی ئاقڵترە.
پاشا ڕازی بوو، کیسە زێڕێکی دیکەی دا بە سودین.
سودین دیسان چۆوە ئەم وڵاتە کە پێشتر مێگەلە مەڕی لێ کڕی بوو. ئەو جار کارانێک گوێلکی ئەرزانی کڕین. بە مەزراو لەوەڕگادا وەپێش خۆی دان و گەیشتەوە ئەشکەوتی دێوی یەک چاو.

دێو کەیف خۆش بوو گوتی:« سودین بە خێر هاتی، چت بۆ هێناوم.؟»
سودین گوتی : « ئێستا دەزانی چیم بۆ هێناوی.؟ پێت خۆش دەبێ. پاشان ئاگری کردەوە و گوێلەکەیەکی کردە کەباب. دێو خواردی و گوتی:« چەندە بە لەزەتە. خۆزیا لەو شتانە زۆرترت بۆ هێنا بام.
سودین لە ئەشکەوت مایەوە و بەیانی ویستی بڕوا. دێو پرسی: « ئێستا دیاری چیت بدەمێ ؟»
- مامە گیان. هیچم ناوێ. تۆ زیندو و سلامەت بی بۆمن بەسە. دێو سفرەیەک و دارێکی دایە و گوتی :
- ڕۆڵە گیان! هەموو جار کە برسی بووی. سفرە داخە و بەو دارە لێی بدە و دوعا بکە خواردنی جۆر بە جۆر ی بە دڵی خۆت بخوازە. لە سەر سفرە حازر دەبن.
سودین سفرە و داری هەڵگرت و مالاوایی لە دێو خواست و بەرەو کۆشکی تلی هەزار کەوتە ڕێ. چوە نێو باخ و بۆ لای حەوزی ئاو چوو، دەست و چاوی شوشت و سفرەی دەخست و دارێکی لێدا و دوعای کرد و خواردن و خواردنەوەی جۆر بە جۆر لە سەر سفرە دەر کەوتن. تا تێر بوو خواردی و سفرەی کۆ کردە وە. تلی هەزار لە پەنجەرەوە هەمووی دەبینی، خزمەتکاری بە دوای سودین دا نارد. سودین هات و تلی هەزار بە ناز و غەمزە لێی پرسی:« سودین لە جیاتی سفرەی خۆت. چ نرخێک دەخوازی.؟
- ئەی خانم! تۆ خۆت دەزانی من پیویستم بە پارە و سامان نیە. ئەگەر بە ڕاستی سفرەی منت دەوێ، دەبێ تەواو خۆت ڕوت کەیەوە و تەماشات بکەم. ئەو دەم سفرە و دارت دەدەمێ.
- ئەو قسانە چیە ؟ چۆن لە پێش چاوی تۆ خۆم ڕوت کەمەوە؟ خەڵک بۆ دیتنی قامکیکم هەزار سکە زێڕ دەدەن.
سودین گوتی:« ناتەوێ، نەتەوێ. منیش دەڕۆم .»
ویستی بڕوا. تلی هەزار فیکری گۆڕی و بیری کردەوە: « با ئەم لاوە شێتە بە ڕوتی بمبینێ. خۆ کەس لێرە نیە باسی بکا و خەڵکی تر تێبگەن. خۆشی

وادیاره شێته.»
بەڵێ. تلی هەزار خۆی ڕوت و ڕوت کردەوە. سودین سەعاتێک تەماشای کرد. پاشان سفرە و داری دایە و ڕێی داگرت.
کاتێ گەیشتەوە ماڵێ بە پارێز چوە کن دایکی. دەیزانی بابی جنێوی پێدەدا. دیسان تکای لە دایکی کرد و گوتی:» پارمەتیم بکە، دیسان پارەکەم خەرج کردوە، با بابم کیسەیەکی تر زێرم بداتێ.
دایکی ترسا و گوتی :» ڕۆڵە ئەم قسانە چن؟ بابت ئەگەر بزانێ تۆش دە کوژێ و منیش.»
سودین ماوەیەک لە دایکی پاڕاوە و ئاخری دایکی نارده کن وەزیر و وەکیلی پاشا و تەواوی ڕووداوەکەی بۆیان گێڕاوە. پاشان هەر سێکیان چوونە کن پاشا و تکایان لێکرد کە پارە بدا بە سودین. پاشا زۆر تورە بوو گوتی: » ئێستا دەیکوژم.»
وەزیر و وەکیل لە سەری ڕۆیشتن و تکایان کرد و پاشایان ڕازی کرد و گوتی:» باشە، کیسە زێرێکی دیکەی دەدەمێ، بەڵام نیتر نابێ چاوم پێی بکەوێ.»
سودین کیسە زێری وەر گرت و جارێکی دیکە بەرەو ئەو وڵاتەی کە مەڕ و کوێلکی لێ کڕیبوون، کەوتە ڕێ. ئەمجارە کاڕانێک کامێشی لاوازی کڕی و بۆ لای ئەشکەوتی دێو ڕێ کەوت. کامێشەکان لە ڕێگادا لەوەڕان و قەڵەو بوون.
دێو کە سودینی دیت زۆر خۆشحاڵ بوو گوتی :
– ئەی سودینی خۆشەویست، بە خێر هاتی، دیسان چیت بۆ هێناوم.»
– مامە گیان ئەمجاریش وەک جاری پێشوون، بەڵام گەورە ترن. سودین گامێشێکی سەر بڕی و ئاگری کردەوە و کردیە کەباب. دێو کامێشی خوارد و زۆری تاریف کرد و گوتی :» ڕۆڵە گیان، هەمیشە لەم شتانە بێنە.»
سودین شەو لە ئەشکەوت بردیە سەر و بەیانی ئامادەی ڕۆیشتن بوو. ئەمجارە دێو کاسەیەکی مسی بە دیاری دایە و گوتی:
– ئەو کاسەیە بگرە و لە ڕێگا ناوی تێدا بخۆوە.
سودین کاسەی وەر گرت و بۆ کۆشکی تلی هەزار ڕۆی. گەیشتە پەنا حەوز ،

کاسەی پڕ لە ئاو کرد و خواردیەوە، دیتی قاپێکی ئیعتیادییە. سودین گوتی؛ ئەمجار دێو فریوی داوم. ئەوەی تێیدا ما بوو فرێی دا، ئاوەکە بوو بە زێڕ. تلی هەزار ئەوەشی لە پەنجەرەوە دیت. خزمەتکاری نارد و سودینی داوەت کرد. سودین چوە کۆشک و تلی هەزار لێی پرسی:

- ئەی لاو! لە توڵەی ئەم کاسە چت لە من دەوێ کە بیدەم.؟

- کاسەی من قیمەتی تەواو نابێ. دەزانم تۆ کڕیاری نی. تلی هەزار پێی داگرت و گوتی:« هەر نرخێکی دەتەوێ، بیڵێ.»

سودین گوتی:« ئەگەر ڕێگا بدەی شەوێک لە گەڵ تۆ بنووم. کاسەکە دەبێتە هی تۆ.»

تلی هەزار جوابی داوە:« ئەو قسانە چیە. خەڵک بۆ تەماشای بەژن و بالام، بە قورسایی خۆم زێڕم دەدەنێ.

- خانم گیان. من گوتم تۆ کڕیار نی! من دەتوانم نەک هەر بە قورسایی تۆ، بەڵکوو بە قەدرایی کۆشکەکەت زێڕ بدەم. ئیتر قسەی ئێمە لە سەر ئەم سەودایە فایدەی نیە. سودین کاسەی هەڵگرت و بۆ لای دەرگا چوو.

تلی هەزار لە گەڵ خزمەتکاران تەگبیری کرد. خزمەتکاران گوتیان:

- ئەی خانم، بەو کاسەیە تۆ دەتوانی شارێکی تازە دروست بکەی. برۆ شەوێکی لە گەڵی بنوو، کێ دەزانێ؟ ئەو ئاقڵی لە سەر خۆ نیە. نابێ ئەو کاسەیە لە کیس بدەی.

تلی ئامادە بوو. سودینی گێڕاوە. ئەو شەوە لە گەڵی چوە دەجێ و سودین ئەو شەوە لە گەڵ تلی هەزار ڕایبوارد و بەیانی قەستی سەفەری کرد. تلی هەزار لێی پرسی:« ئەی سودین ئەگەر پێویستم بە تۆ هەبوو لە کوێ پەیدات بکەم ؟

سودین نیشانی خۆی بە درێژی دایە و کەوتە ڕێ. کاتێ گەیشتەوە ماڵێ، چوە کن دایکی. دایکی پرسی :

- باشە، سودین ئەمجارە چت کرد ؟

ئەمجاریش فریویان دام. پارەکەم خەرج کرد، بەلام لە جیاتیان یادگارێکی باشم لە خۆم بە جێهێشتوە.

- ڕۆڵە گیان ئێستا چی بە باوکت بڵێم.
- دایە. چبکەم. کارێکە کراوە و هیچی لە گەڵ ناکرێ. پاشا ئاگادار بوو کە کوڕەکەی گەڕاوەتەوە. بانگی کردە دیوان و پرسی:
- باشە، ئەوجار چت کرد؟
- بابە، پارەکەم خەرج کرد. لە گەڵ دۆستان هەموو شەرابم خواردەوە. پاشا بانگی جەلادی کرد و گوتی :
- جەلاد! ئێستا سودین بەرە و لە سەری بدە و لیباسەکانی بە خوێن کە و بێنە بە منی نیشان بدە .
وەزیر گوتی :« پاشا سلامەت بێ، گوێ بدە قسەی من. پارەی بە فیڕۆ داوە گوێ مەدەیە. سودین مەکوژە. من دەزانم کە ئینسانێکی بێکارە نیە. پاشان پەشیوان دەبیەوە.
پاشا گوتی: نا. دەبێ سەری ببڕم. گاڵتەی پێم کردوە.
وەزیر دیتی کە لە گەڵ پاشا هیچ ناکرێ. سودین و جەلادی لە گەڵ خۆ برد بۆ دەرەوەی شار. وەزیر لیباسی لە بەر سودین هێنا دەر و دای بە جەلاد و گوتی:« برۆ کار مامزێک بکوژە و ئەم لیباسە دە خوێنی وەر بدە و لێرە چاوەڕوانی من بە تا دێمەوە. وەزیر سودینی بردە شوێنێکی زۆر دووری شار و لە ماڵێک شاردیەوە و خواردن و خواردنەوەی بۆ برد و خۆی چۆوە کن جەلاد و گوتی:« وریا بە بە هیچ کەس نەڵێی. بە پاشا بڵێ کە سەرم بڕیوە و ئەمەش لیباسی خوێناوی.»
هەر تکیان چوونەوە کن پاشا و لیباسی خوێناویان نیشان دا و ئەویش ئارامی گرت.
بەلام وەزیر سودینی لەو ماڵە ڕاگرتبوو. ئێستا بزانین تلی هەزار چدەکات.؟
تلی هەزار منداڵی وەسگی کەوتبوو. بە خۆی گوت ئێستا دەبێ چبکەم. ئەگەر بابم بزانێ بێگومان دەمکوژێ. خزمەتکارەکانی سەر کۆنە کرد و گوتی:
- ئەم بەلایە ئێوە بە سەرمنتان هێنا. بە قسەی ئێوەم کرد. ئێستا باوکم بزانێ هەموانمان دەکوژێ. خزمەتکار گوتی:

- تەنیـا یەک ڕێگای دەرباز بوون هەیە. ئەویش ئەوەیە کـە مـێرد بە سـودین بکەی. بە شێتت دانا بوو دەر کەوت لە هەموو کەس ئاقڵترە.
- ئاقڵی چی.؟ کوێی ئاقڵە ؟
- ئاقڵی چی ؟ یەکەم تۆ ئێستـا لەوی سگت بڕە. دووەم ناچاری تۆ بچیـە کنی، نەک ئەو بێتە لای تۆ. سێیەم ئەوەیە گۆزە وسفرە و کاسە و خۆشت لە زیادی دەکەونەوە دەست ئەو. جا هەر بڵێ کوێی ئاقڵە .
- هەقتە. دەبێ بچینە کن سودین. ئەمری کرد ئەسب زین بکەن و گۆزە و سفرە و کاسـەی هەڵگرت و بەرەو وڵاتی سودین ڕێی داگرت. گەیشـتنە دەور و بەری شار. خێوەتیان هەڵدا و گۆزەی لە سندوق هێنا دەر و فوی پێدا کرد. دەست لە جێ لەشکرێک لە بەر دەمی ئامـادە بـوو. سـەرداری لەشکر پرسـی: « خـانم چ ئەمر دەکات. دنیا خەرا بکەم یا ئاوەدان.؟
- دنیـا ئاوەدانە و دەمانـەوێ لە ناویدا بژین. باشـتـرە شـار گـەمـارۆ بدەی و نە هێڵی هیچ کـەس لەم شارە دەر کەوێ. چاوە ڕوانی فەرمـانی من بە. شار دەست لەجێ گەمارۆ درا.
ڕۆژی دوایی تلی هەزار نۆکەرێکی ناردە کن پاشا و گوتی: بە پاشا بێژە ئێستا سودینم بۆ بنێرێ، دەنا شار و خەڵکەکەی نابوت دەکەم. ڕۆژێکیش مۆڵەتی بێ. نۆکـەر چوە بـارەگـای پاشـا و ئەمـری تلی هەزاری پێـڕاگـەیاند. پاشـا گـوتی: ئەمری وی ئەنجام دەدەم. پاشـان وەزیری بانگ کرد و ڕووداوەکەی بۆ باسکرد. وەزیر گوتی:
- ئەمگوت مـەیکوژە سودین وا بێکارە نیە. ئێسـتـا چبکەین؟ وەرە لە هـەیوانی کـۆشکەوە تەمـاشـا کە، دەوراندەوری شـار لەشـکر گـرتوویەتی نا هێـڵن کـەس دەربچێ.
پاشـا گـوتی :« وەرە کـوڕی گـەورەم بـەرە کن تـلی هـەزار. کـوڕی گـەورەی نارد و تلی هەزار لێی پرسـی:
- سودین لە کوێیە ؟
- من سودینم.

– تۆ من دەناسی؟
– بەڵێ دەتناسم. تۆ تلی هەزاری
– منت لە کوێ دیوە؟ هەتیو بێدەنگ بوو نەیدەزانی بێژێ چە . تلی هەزار دیتی کە دەیانەوێ فریوی بدەن و سودینی بۆ نەنێرن. بە نۆکەرانی گوت: دەستی ئەو کورەی ببەستن و بیبەنەوە کن پاشا.
پاشــا کــە وای دی. کــوڕی ناونجی خــۆی نـارد. تلی هــەزار ئەویشی ناردەوە. گوتی: بە پاشا بڵێن ئەگەر سودین نە نێرێ شار و دانیشتوانی لە بەین دەبەم، دوو سەعاتیشی مۆڵەتە.»
پاشا بە پەلە چوە کن وەزیر و گوتی:« بە قوربانت بم، فیکرێکی بکە.»
– کاتێکی قســەی حســابیم پێگوتی، بە گوێت نەکردم. ئێسـتـا کە سـودینت کوشتوە فیکری چی بکەم.؟
مۆڵەت تەواو بوو. تلی ئەمری بە سەرداری لەشکر کرد کە لە هەموو لاوە شار وێران بکات. لەشکر پەلاماری دەست پێکرد و خەڵکیان دەکوشت
عالەم ڕووی کردە کۆشکی پاشا و گوتیان:« چۆن شتی وات ڕێگا داوە، تەماشا کــە چیاســە. لە هەمـووی دەکـوژن و وێران دەکـەن. وەزیر گـوتی کـە وایە خـۆم دەچمە کن تلی هەزار. چوو سودینی لە خانوەکە هێنا دەر و گوتی :
– بە خێرایی بچۆ کن تلی هەزار تا شاریان هەموو وێران نەکردوە و خەڵکیان نە کوشتوە، بلێ دەست ڕاکرن.
سودین چوە ناو شار و سەرداری لەشکر ئەوی ناسی و دەستیان لە کوشتار و وێرانکردن هەڵگرت. پاشان سودین چوە کن تلی هەزار و گوتی :
– باشە، نیتر چت لە من دەوێ ـ گۆزە و سفرە و کاسەت ئەستاندوە، نیتر چت دەوێ.؟
– ئەی سودین من لە تۆ سگم پڕە دەبێ بمهێنی.
– بە سەری خۆت و باوکت من شایانی تۆ نیم. تۆ کە خەڵک بۆ دیتنی قامکێکت هەزار سکە زێڕ دەدەن، من شێت نەبووم لە کوێ بۆ تۆ دەبم.
تلی هەزار دیتی ڕێگا و چاری نەماوە گوتی : « کە وایە هەر چی پارە و سامانم

هەیە بۆ تۆ. لە جیاتیان بمکوژە و بمنێژە با ریسوای چاک و خەراب نەبم. با خەڵک بڵێن کە مێردی بە دەستی خۆی کوشتی و ناشتی.»
سودین گوتی: تا بابم ڕێگا نە دات، ناتوانم ئەو کارە بکەم.
تلی هەزار نۆکەری خۆی لە دوای شا نارد و خۆشی لە گەڵ خزمەتکار قەراری دانا کە خۆی بکاتە دایکي تلي هەزار و لە گەڵ پاشا مە سەلەی مێرد پێکردنی باس بکات، پاشا هات. خزمەتکار تەواوی داستانی بۆ باسکرد، پاشا زۆر کەیف خۆش بوو کە جوانێکی وەک تلی هەزار خۆی داخوازە ببێتە بووکی.
پاشا ڕازي بوو. بەیانی مەجلیسی شیرینی خواردنیان دانا و حەوت شەو و ڕۆژ شایی و زەماوەند ساز کرا. ئەوان بە ئاوات گەیشتن و ئیشەڵا ئێوەش پێدەگەن

# گولبرین ٥٤

کابرایەک بوو بە ناوی یوسوپ زۆر دەوڵەمەند بوو، ڕۆژێ خۆی بۆ سەفەری حەج ئامادە کرد. کیژێکی جوانی هەبوو، کیژەکە گوتی:« ئەگەر لە حەج بێیەوە و هەموو سەروەت و سامانت بە تالآن چوو بێ، فایدەی حەج چیە. حەسارێکی بەرز بە دەوری ماڵەکە دا بکێشە وجۆگەی ناوی بە نێوادا بێت و بەشی دوو سێ ساڵان ئازوقە و خواردەمەنی بۆ من دابنێ، سامانەکەت دەپارێزم.»
بابی قسەکانی وی ئەنجام دا و بەرەو مەککە کەوتە ڕێ.
لەو شارە ڕەژی فرۆشێک هەبوو بە ناوی ئەحمەد. ئەحمەد خەبەری زانی کە یوسوپ چۆتە حەج. رەفیقەکانی کۆ کردەوە وگوتی :« وەرن با بچین ماڵی ئوسیب تالآن بکەین.»
رەفیقەکانی ڕازی بوون. ئەحمەد چوە بازار بزماری درێژی کڕین و پاشان لە گەڵ رەفیقانی چوونە ماڵی یوسوپ. بزمارە درێژەکانیان یەک یەک لە دیوار دا و بە سەر واندا ڕاست چوونە سەربان.
بەلآم کیژەکە ، لە ژووری وەتاغێ دەست بە شیر لە پەناپەنجەرە وێستا بوو.لە گەڵگوو دزی هەوەڵێ سەری لە پەنجەرە هێنا ژوور، شیرێکی لە ملی دا و سەری پەڕاند. بەمجۆرە سەری هەموو دزەکانی پەڕاند، تەنیا ئەحمەدی ڕژی فرۆش مابوو. ئەحمەد لە سەر بانیەوە بە پارێز تەماشای پەنجەرەی کرد. کچەکە شیری داهێنایە، بەلام هەر کەمێک بریندار بوو. خۆی فڕێدا خوارێ و بە پەلە بۆ لای دوکتۆر و برینەکەی دەرمان کرد.
کاتێ یوسوپ لە سەفەری مەککە گەڕایەوە، ئەحمەد دیاری بە نرخی کڕین و پێیەوە چوو. بەم بیانوە مانگێک لە ماڵی یوسوپ ژیا. وەهاش دەبزووتەوە کە

یوسوپ خۆشی ویست.
ڕۆژێک ئەحمەد بە یوسوپی گوت:« کیژەکەت بدە بە من.»
یوسوپ گوتی :« زۆر باشە و پێشم خۆش دەبێ.» یوسوپ جیازی بۆ کیژەکەی ئامادە کرد وئەحمەد کچی هەڵگرت و بردیەوە ماڵی خۆی. بە جەنگەڵێک دا تێدەپەڕین، ئەحمەد کڵاوی لە سەر کرد و جێ برینەکەی بە کچەکە نیشان دا و گوتی:
- خۆشە ویستم هیچ دەزانی کە کێ ئەم برینەی دەسەرم کردوە.؟
کیژەکە وا ترسا کە زمانی گیرا. ئەحمەد تەنافێکی هەڵگرت، دەست و پێی کیژەکەی بەست و چوو دار و پوشکە کۆ بکاتەوە تا کیژەکە بسووتێنێ. ئەو دەمەی ئەحمەد خەریکی دار کۆ کردنەوە بوو، پیرە مێردێک بە جەنگەڵدا ڕادەبرد، بارە دارێکیشی لە کەرێک بار کرد بوو. پیرە مێرد کچێکی دەست و پێ بەستراوی دیت و پرسی:
- خۆشە ویستم، کێ دەست و لاقی تۆی بەستوە.؟
کیژەکە دەستی کرد بە پاڕانەوە وگوتی :« بابە گیان دز منیان بەستوە و رزگارم کە.»
پیرە مێرد تەنافی لە دەست و قاچی کیژەکەی کردەوە و سواری کەری کرد و داری لە دەور و بەری وەر گرت کە دیار نەبێ.
پیرە مێرد کەری ئاژواتا گەیشتە پەنا جەنگەڵێک. دیتی کاروانێک لەوێ خستویەتی. ئەویش لە پەنا کاروان دانیشت،
لەم ناوەدا ئەحمەد گەڕایەوە دیتی کچەکە نەماوە. زۆر گەڕا نەیدیتەوە. چاوی بە کاروان کەوت و لە گەڵ بازرگانی خاوەنی کاروان کردیە کێشە و گوتی: کیژەکە لە کوێیە .
بازرگان بە سەر سوڕ مانەوە جوابی داوە: کەسم نە دیوە، کچی چی، کچ لە کوێ بوو.؟
ئەحمەد هەموو کاروانەکە گەڕا، کچی نە دیتەوە. پاشان چاوی بە پیرە مێرد کەوت، پرسی:« بابە گیان کەست لێرە نە دیوە.؟»

– ڕەحمەت لە بابت. ئەوە من و کەر و دارەکانم. کەسم نەدیوە. توشی کەسیش نەبووم. ئەحمەد بە دەستی خاڵی ڕۆیشت.
کاتێ ئەحمەد وەدوور کەوت، پیرەمێرد دارەکانی لە دەوری کیژەکە لا برد و کچەکەی بە بازرگان نیشان دا. بازرگان بە دیتنی کیژەکە ئاقڵی لە سەر دا نەما و گوتی :« بیدە بە من تا لە کوڕی خۆمی مارە کەم.»
پیرە مێرد کیژەکەی دا بە بازرگان و خۆی لێیدا ڕۆیشت. بازرگان کیژەکەی بردەوە ماڵ و لە کوڕی خۆی مارە کرد و جێژن و زەماوەندیان ساز کرد. لە پڕ نیوە شەو کچەکە بە هاوار و قیژە لە وەتاغێ دەر پەڕی.
بەیانی کوڕ چوە کن بابی و گوتی: ئەو شێتە کێیە بۆ منت هێناوە. شەوێ بە هاوار و قیژە قیژ لە وەتاغی دەر پەڕیوە.
کیژەکەیان بانگ کرد. بازرگان لێی پرسی: چ بوە، بۆ چی نیوە شەو بە هاوار و قیژە لە ژووری هاتوویە دەر.
کیژ جوابی داوە: « شەوانە من زۆر دەترسم. تکا دەکەم دیوارێکی بەرز بە دەوری ماڵ دا بکێشن و شێر و پڵنگیش لە دەرگای ماڵ ببەستنەوە. ئەو دەم ئاسودە دەنووم.
بازرگان ویستی کچەکەی بە جێ گەیاند، ژن و مێردی لاو بە ئارامی دەژیان.
با ئەوان بە خۆشی بژین، بزانین ئەحمەد چی لێهات.؟
ڕۆژێکی ئەحمەد ڕێی کەوتە ئەو شارە و بە پەنا ئەو خانوەدا دەڕۆی کە کیژەکەی تێدا بوو. تەماشایەکی ئەو حەسارە بەرزەی کرد، ڕاست وە ئەو حاسارە دەچوو کە ئوسیب لە دەوری خانوی خۆی سازی کرد بوو. لە دڵدا فکری کردەوە کە:« ئەگەر کیژەکە لەو ماڵە نەبێ من ئەحمەد نیم» دیسان چەند بزماری درێژ ئاسنی کڕی و شەو لە دیواری دان و بە دیواردا چوە سەر بان و بە پارێز لە پەنجەرەوە تەماشای ژووری وەتاغەکە کرد و دیتی ژن و مێرد خەوتوون. کیژەکەی ناسی کە خۆیەتی. سەبروکە وەخەبەری هێنا و گوتی:« بە دوام دا وەرە.»
کیژەکە نەیویست مێردەکەی ناڕەحەت بکا، هەستا و بە کاوە خۆ وە دوای

ئەحمەدی کەوت. گەیشتنە پەنا پەنجەرە، کیژەکە دوعای کرد و گوتی :« یا خدر ی زیندە! منداڵی هەوەڵم کچ بێ یا کوڕ، نەزری تۆی دەکەم، لە شەڕی ئەو کابرایەم نەجات بدەی..» نازانم چۆن بوو، بەڵام لە پڕ دەستی ئەحمەد لەرزین و لاقی ترازا و کەوتە خوار. شێر و پڵنگی بەر دەرگا لەت و پەتیان کرد. بەیانی کە بازرگان لە ماڵ دەهاتە دەر، لەتە لەشی ئینسانێکی لە بەر دەرگا بینی. بە کچەکەی گوت:

– بزانە لە بەر خاتری تۆ، ئینسانێک نابوت بوە، شێر و پڵنگ خواردوویانە.

بوک جوابی داوە : ئەی بابە! دەتوانی شێر و پڵنگان بفرۆشی، من ئیتر لە کەس و لە هیچ شتێ ناترسم.

پاش ماوەیەک خوا کیژێکی پێ بەخشین، کچ گەورە بوو، ڕۆژێ لە باخ دەگەڕا، پیاوێک لە بەرانبەری دەر کەوت. ئەو پیاوە خدری زیندە بوو، لیباسێکی سەوزی لە بەر دابوو، بە کیژەکەی گوت:

– بڕۆ بە دایکت بێژە ئایا لە سەر بەڵێنی خۆی ماوە.؟ کیژەکە چوە کن دایکی و پەیامی خدری زیندەی پێ گەیاند. دایک گوتی:« دیارە لە سەر قەولی خۆم ماوم. بڕۆ ئەم وەڵامەی من بە پیرە مێرد بڵێ.»

کیژەکە چوو قسەکانی دایکی بە پیرە مێرد گوت. خدری زیندە بە کچەکەی گوت:

– باش قسەکانی من گوێ بدەیە. لە مەو دوا ناوی تۆ « گولبرین» دەبێ. هەموو جار کە پێبکەنی گوڵی سور لە دەورت بڵاو دەبنەوە. ئەگەر بگری، باران دەبارێ. هەموو جار کە بێیەوە ماڵێ هەمبانێکی پڕ لە زێڕ لە سەر دەرانەی دەرگا هەڵداوەسر ێ. گیانی تۆ لە مروارییەکدا دەبێ و ئەو مروارییەش لە دڵی ئاسکێکی بێ شاخ و نێو چاوان سپی دا دەبێ. خدری زیندە ئەوەی گوت و بزر بوو. کیژەکە چوو ئەو قسانەی بۆ دایکی گێڕاوە. دایک زۆر شاد بوو، ماچی کرد. کچەکە پێکەنی و هەموو دەور وبەری بوو بە گوڵ. ماوەیەک ڕابرد، کچ گەورە بوو. کوڕی ئەمیری عەرەب دیتی و ئاشقی بوو. ناردیە خوازبێنی. دایک و بابی کیژەکە ڕازی بوون. جیازیان بۆ ئامادە کرد و خۆیان بۆ جێژنی گواستنەوە ئامادە کرد.

کەلبرین پورێکی هەبوو بەد جسن و بە نەقە نەق. مێردی بەردڵای کرد بوو لە گەڵ کچێکی ڕەشی ناحەز دەژیا. گولبرین کیژێکی دڵچاک بوو، بڕیاری دا پوری و کچەکەی لە گەڵ خۆی بەرێ. زاوا لە گەڵ دۆستانی بۆ بوکێ هاتن. بوک گریا. تارایان بە سەر دادا و سواری ئەسبیان کرد و کەوتنە ڕێ. پوریش کچەکەی خۆی دە نێو لێفاندا شاردەوە.

لە ڕێدا لە جەنگەڵێک ڕاوەستان. پیا و ژن بە جیا لێکتر. پوری بەد جسن گولبرینی بردە نێو مێشەیەک و ڕووتی کردەوە. دەست و پێی بەست و چاوەکانی دەر هێنا و دە گیرفانی نا و بە ڕەڵای کرد. چوو کچە ڕەش و دزێوەکەی خۆی ڕازاندەوە و تارای بە سەر دادا و کەوتنە ڕێ. با ئەوان بڕۆن، بزانین گولبرین چی بە سەر هات.

گولبرینی کوێر و دەست و پێ بەستراو لە نێو جەنگەڵدا کەوتبوو. ڕۆژی دوایە پیرە مێردێک هاتە جەنگەڵ داران وەخڕ کات. گولبرین دەنگی لاقانی بیست، بانگی کرد و گوتی :

– بابە گیان هەر کەسی هەی، ببە. دەست و پێیانم بکەوە و بمبەوە ماڵی خۆتان.

پیرە مێرد گوتی : خوا دەزانێ من ئەو کارەم لە دەست نایە. خۆم سێ کیژم هەن کە هەر سێکیان وەک ئاگر وان، دەچمەوە لەوان دەپرسسم ئە گەر ڕازی بوون، دەتبەمەوە ماڵێ. پیرەمێرد چۆوە بۆ کیژەکانی باسکرد. کیژەکان دوویان ڕازی نەبوون کە ئەو کیژە بەرێتەوە ماڵ، بەڵام کچی گچکە گوتی:« بابە بیهێنە. من پاروە نانێکم هەبێ لە گەڵ وی دەخۆم.»

پیرەمێرد چوو گولبرینی هێناوە ماڵ. گولبرین دەستی گرت و گوتی : «ئەوە خوشکی منە و خۆم نانی دەدەمێ.»

گولبرین گوتی: کەمێک لە ماڵێ بمبە دەرێ. کیژە گچکەکە گولبرینی بردە دەر و لە گەڕانەوەدا دیتیان کیسە زێڕێک لە بەر دەرگا کەوتوە. گولبرین هەموو ڕۆژێ کە دەچوە دەرێ. لە گەڕانەوە دا کیسە زێڕێک لە بەر دەرگا دەبوو. پیرە مێرد دەوڵەمەند بوو. دوو خوشکەکەی دیکە ش کەم کەم گولبرینیان خۆش ویست و

هەموو پێکەوە بە خۆشی دەژیان.
بەڵام لەم بێنە و بەردە دا کوڕی ئەمیری عەرەب لەگەڵ ژنی ڕەش و ناحەز ڕۆژگارێکی تاڵی دەبردە سەر. هەموو ڕۆژێ دەچوە ڕاوێ. ڕۆژێکی خەسوی فاڵی گرتەوە و بە زاوای خۆی گوت:
- هۆی، دزێوی خێزانت، نەخۆشی ویە. دەبێ ئاسکێکی بێ شاخی نێوچاوان سپی لە جەنگەڵ ڕاو بکەی، ژنەکەت دڵی وی بخوا، دوو بارە چاک دەبێتەوە و جوانیش دەبێ.
کوڕی ئەمیری عەرەب ئاسکی بێ شاخی نێوچاوان سپێ ڕاو کرد و هێنایەوە ماڵ. سگیان دڕی و لەت لەتیان کرد و کە دڵیان لەت کرد، مرواریيەکی لێ هاتە دەر و خلۆر بۆوە بۆ قوژبنێک. ژنێ ڕەش و دزێوی کوڕی ئەمیری عەرەب دڵی ئاسکی خوارد و جوانیش نە بوو. ئێستا بزانین گولبرین چ دەکا.؟
ڕۆژێک لەو گوندەی کە ئەو لێی دەژیا، شایی و زەماوەند بوو. خوشکی بچوک دەستی گولبرینی گرت و بردی بۆ شایی. لە پڕ لە ڕێگادا گولبرین بزر بوو. لەو شوێنەی لە پیشتر لێی ڕاوەستا بوو، کێوێی بەرز قوت بۆوە. ئەوە ڕاست لەو کاتە دا بوو کە کوڕی ئەمیری عەرەب ئاسکی بێ شاخی نێو چاوان سپی ڕاو کرد بوو.
خوشکی بچوک چۆوە کن بابی و پێی گوت. پیرە مێرد پێمەڕەیەکی هەڵگرت و دەستی کرد بە هەڵکەندنی کێو. نیوەی چیاکەی هەڵکەند. دانیشت تۆزێ بحەسێتەوە، دیتی کێو وەک خۆی لێهاتۆتەوە. پیرە مێرد خەمگین بوو. چبکات ؟ مەڕێکی زۆری کردە قوربانی و میوانخانەی دروست کرد، بەڵام چیا هەر لە جێی خۆی بوو.
ڕۆژێ کوڕی ئەمیری عەرەب لەو دەور و بەر خەریکی ڕاو بوو. دیتی چیایەکی بەرز لە وێیە، چوە نیزیک چیاکە و دەرگایەکی چاو پێکەوت. دەرگای کردەوە دیتی کیژێکی جوان دانیشتوە، گورج ناسی و زانی گولبرینە. بانگی کرد و یەکتریان لە ئامێز گرت. کوڕی ئەمیری عەرەب دیتی کە گولبرین کوێرە و زمانیشی ناگەڕێ. دەستی بە گریان کرد بەڵام گریان فایدەی نەبوو.

کوڕی ئەمیری عەرەب هەموو ڕۆژێ دەچوە کن گولبرین. پاش نۆ مانگان خوا کوڕێکی دایە. کوڕەکەی بردەوە ماڵ و بە خەسوی ئەسپارد و گوتی باشت نا گا لێ بێت. ئەگەر داوە موییێک لە سەری کەم بێ، هەرتکانو دەکوژم.
کوڕ گەورە دەبوو. ڕۆژێ کە وەتاغیان کەسک دەدا، ئەو مروارییە بۆ قوژبنێک خلۆر بوە. کوڕەکە هەڵیگرتەوە و بە سنگیەوە نا.
ژنە ڕەش و دزێوەکە غاری دایە کە مرواریەکەی لێ بستێنێتەوە. کوڕەکە دەستی بە گریان کرد. بابی گوێی لە دەنگی گریانی بوو هاواری کرد:
- کێیە کوڕەکەم ئازار دەدا.؟
دایکی ژنەکەی جوابی داوە گوتی:« کەس کاری پێ نە داوە. ویستم لێی بستێنمەوە، گریا.»
بابی دەستی کوڕەکەی گرت و کوڕەکە بزەی هاتێ و دەورەی بوو بە گوڵی سوور. بابی مرواری لە کوڕەکەی وەر گرت و چوە کن گولبرین. کاتێ گەیشتنە وێ دیتیان گولبرین چاوی چاک بۆتەوە. کوڕی ئەمیری عەرەب زۆر کەیف خۆش بوو پرسی:
- چۆن بوو چاوت دەبینێ.؟ گولبرین نەیتوانی وەڵام بداتەوە. ئەو لاڵ ببوو.
کوڕی ئەمیر مرواریەکەی دایە و گوتی :« بزانە چەند جوانە.!
گولبرین مرواریەکەی وەر گرت و تەماشای کرد و بۆ زاری خۆی برد کە ماچی بکا. لە نەکاو لە دەستی کەوت و چوە دە زاری. گولبرین کەیف خۆش بوو، دەستی بە قسان کرد و بە کوڕی ئەمیری عەرەبی گوت:
- دەزانی بۆ چی چاوم چا بوونەوە.؟ کۆترێک هاتە لام و دوو چاوەکانی لە گیرفامن هێنا دەر و خستیەوە نێو چاوەکانم و باڵی خۆی بە سەر داهێنا و چاوم کرانەوە. پاشان ئەوەی بوره بەد جسنەکەی بە سەری هێنا بوو، بۆ کوڕی ئەمیری عەرەبی باسکرد. هەر ئەو دەم چیاکە نەما. زۆر شاد بوون کوڕی ئەمیری عەرەب و گولبرین بۆ ماڵی خۆیان گەڕانەوە و گوتی:
ژنە ڕاستی من ئەوەیە. ئەمری دا کە ژنە دزێوەکە و دایکی سزا بدەن، خۆشی بە شادی و خۆشی لە گەڵ گولبری ژیانیان دەست پێکرد.

## دەروێش ٥٥

ژن و مێردێکی پیر منداڵیان نە دەبوو. ڕۆژێک دەروێشێک هاتە ماڵیان. ژن و مێرد پێشوازیان لێکرد.

دەروێش گوتی: « بۆ خەجاڵەتم دەکەن؟ چما کوڕێکتان نیە پێشوازیم لێ بکات. بۆ چی خۆتان هەستاون و زەحمەتتان کێشاوە.

هەر تک گوتیان:« منداڵمان نیە و خەمی ئێمەش هەرئەوەیە.

دەروێش سێوێکی لە گیرفانی هێنا دەر و دوو لەتی کرد و هەر یەکە نیوێکی دانێ و گوتی:

– ساڵێکی دیکە خودا کیژێکتان دەداتێ. بە لام بە بێ من ناوی لێ مەنێن.

دەروێش ئەوەی گوت و ڕۆیشت.

پاش ساڵێک ژنەکە کچێکی بوو. چەند مانگی پێچوو، بێناو بوو. دایک و باب نیزیک بوو ناوی لێ بنێن. جیرانیان داوەت کرد و شیرینی و خواردنیان ئامادە کرد و لە سەر دەروێش ڕانەوەستان. لە نەکاو دەرگا کرایەوە و دەروێش وە ژوور کەوت. ئەویان لە باشترین جێگا دانا. دەروێش گوتی :

– ناوی کچەکە « بەسێ» بێت. دایک و باب ڕازی بوون و گوتیان :« با وابێت.»

ئەو شەوە دەروێش لە وێ مایەوە و ڕۆژی دوایی ڕۆی. پاش ساڵێک ژنەکە کچێکی دیکەشی بوو. ساڵێکی تر، کچی سێیەمیشی بوو. سەرتان نەیئێشێنم. هەموو ساڵێش کە دەهاتن ناویان لێ بنێن، دەروێش دەهات. کچی دووەمی ناو نا« خوسە» . کچی سێیەمیشی ناو نا« کولیلک»

ڕۆژێ کە کیژەکان گەورە ببوون، دەروێش پەیدا بوو و دوو« حۆقە» ماسی هێنا بوو. گوتی :

– ئەو ماسییانە ڕابکرن و تا من زیندووم دەستیان لێمەدەن. ڕۆژی دوایی کە دایک سفرەی داخست و نانی هێنا، کیژەکان هاواریان کرد کە: بێجگە لەو ماسییەی دوێنێ بابمان هێنای، چیتر ناخۆین. دایکیان مەجبور بوو ماسی ساز کا. لە ئێوارەدا دەروێش پەیدا بوو پرسی:« ماسی من لە کوێیە؟
دایکی کچەکان گوتی: « کچەکان خواردیان.»
دەروێش گوتی:« ئێستا کە وای لێهات بەسێ لە گەڵ خۆم دەبەم کە لە گەڵ من بژی.» بەسێ» یان ئامادە کرد و لە گەڵ دەروێش بە ڕێیان کرد. دەروێش« بەسێ»ی بردەوە ماڵ و لە سەر بەردێکی دانا و پلە گۆشتێکی دایە و گوتی« دەبێ ئەو گۆشتە بخۆی»
دەروێش ڕۆیشت. بەسێ گۆشتەکەی فڕێدا. دەروێش هاتەوە و پرسی:« ئەی گۆشت.. ئەی گۆشت لە کوێی.؟»
گۆشت لە قوژبنێکی ژوورەکە وەڵامی داوە:« لێرەم. لە نێو تۆز و پیسایدا کەوتووم.»
دەروێش یەخەی« بەسێ» ی گرت و ڕایکێشا بۆ عەمبار و سەرەو ژێر هەڵیاوەسی.
پاش ماوەیەک دەروێش جارێکی دیکەش هاتە ئەو ماڵە کە خوشکەکان لێی دەژیان و گوتی:
– بەسێ بەم زوانە منداڵی دەبێ و تەنیای بۆ دژوارە.« خوسە» بێت، یارمەتی بدا.
خوسە دەگەڵ دەروێش کەوت. چوە ماڵی دەروێش و دیتی خوشکی دیار نیە. دەروێش لە سەر بەردێکی دانا و پلە گۆشتێکی کاڵی دایە و گوتی :« بیخۆ»، پاشان خۆی وەدەر کەوت.« خوسە» گۆشتەکەی نە خوارد و فڕێی دا.
دەروێش هاتەوە و پرسی:« ئەی گۆشت ئەی گۆشت لە کوێی ؟»
– وا لێرە لە نێو تۆز و پیسایی دام. دەروێش « خوسە» شی بۆ عەمبار ڕاکێشا ولە پەنا « بەسێ» سەرەو ژێر هەڵیاوەسی.
ماوەیەک پێچوو دەروێش چوە ماڵی خوشکان و گوتی:« بەسێ» کوڕی بوە و «

خوسه» ش نیزیکه مندالی بێ. کەس نیه کاریّ مالّێ بکا. باشتره « کولیلک» بێ و یارمەتی خوشکانی بدا.
پیرێژن و پیره مێرد پێیان حەیف بوو ئەو کیژه شیان بروا. بەلام ناچار ئەویشیان له گەلّ دەروێش نارد.
کولیلک هاته مالّی دەروێش و دیتی کەسی لێ نیه. نه « بەسێ» دیاره و نه «خوسه» زانی کار خەرابه. دەروێش پله گۆشتێکی دایه و گوتی بیخۆ. خۆی رۆیشت. کولیلک پشیلەیەکی دیتەوه وگۆشتەکەی دایه. پشیله گۆشتی خوارد، کاتێ دەروێش گەراوه، بانگی کرد: « ئەی گۆشت له کوێی؟»
گۆشت وەلامی داوه: « ئەوەتا لێرەم له نێو گەده.»
دەرویش بیری کردەوه که : « ئەمەیان به کارم دێت!» نانی خوارد و نوست. دەروش عادەتی وا بوو که چل رۆژ دەنوست و چل رۆژ به خەبەر دەبوو. کاتێ دەرویش خه وی لێکەوت، کولیلک به مالّێدا گەرا و له عەمبار گوێێ له نالّین و هاوار بوو، بۆ لای عەمبار چوو، دەرگای کردەوه و دیتی خوشکەکانی دەست و پێ بەستراو سەرەو ژێر هەلاوەسراون.
کلیک له حەجبەتان واقی ورِ ما و گوتی:« خوشکه فەقیرەکانم ئەگەر بتانکەمەوه ده توانن به رێگا دا برۆن یان نا.؟
گوتیان ئازادمان که ده توانین برۆین. کلیک ئازادی کردن و هەموو شرِه و برِەی خۆیان کۆ کردەوه و له مالّی دەروێش وەدەر کەوتن و هەلاتن. رۆیشتن تا گەیشتنه ولاتێکی تر. دیتیان شوانێک مەرِ دەلەوەرێنێ. خوشکەکان تکایان له شوان کرد که:
– لیباسی پیاوانەمان بۆ ساز که و لیباسمان بگۆرِه. شوان خواهیشتی وانی پێک هێنا. لیباسی پیاوانیان کرده بەر و کەوتنه رێ. گەیشتنه شار و چوونه مالّی دەولّەمەندێک. له خاوەن مالّیان پرسی:« کرێکارت ناوێ ؟»
کابرای دەولّەمەند گوتی:« دەمەوێ، مەرِ و گارانم بۆ بلەوەرێنن. بەلام له پێشدا بچنه حەمام و خۆتان بشۆن که زۆر پیسن.!
ئەو پیاوه سێ کورِی هەبوون بانگی کردن و گوتی : « ئەوانه بەرنه حەمام،

یارمەتیان بدەن خۆیان بشۆن.
چوونە حەمام. بەلاّم خوشکەکان ڕاوەستا بوون، خۆیان ڕوت نە دەکردەوە. سێ براکان هەستیان کرد و چوونەوە کن باوکیان و گوتیان :« ئەوانەی ناردوتنە حەمام، کوڕ نین کچن.»
کابرای دەوڵەمەند سەری سوڕ ما و خێزانی بانگ کرد و ئەمری کرد کە کچەکان بەرێتە ژوور و لیباسی ژنانەیان دەبەر کا . لە گەڵ ئەوە لە ژنەکەی پرسی:« دەڵێی چی ؟ پێت چۆنە کە ئەوانە بۆ کوڕەکانمان بێنین؟
ژنەکەی گوتی :« قەیدی چیە. با ئەو کارە بکەین. ئەگەر تۆ بتەوێ، من قسەم نیە.
یەک جێ بۆ ئەو سێ خوشک و سێ برایە شایی و زەماوەندیان ساز کرد. پاش ساڵێک هەر سێ خوشک هەر یەکەی کوڕێکیان بوو. با ئەوان خەریکی ژیانی خۆیان بن، بزانین دەروێش چدەکات؟
دەروێش وەخەبەر هات، دیتی کولیلک دیار نیە. چوە عەمبار و دیتی دەرگا کراوەتەوە ، نە« بەسێ» دیارە ونە«خوسە». وەدوایان کەوت بیان دۆزێتەوە. ماویەکی زۆر سەر گردان بوو تا لە ئاخر دا گەیشتە ئەو شارە کە سێ خوشکی لێ دەژیان. ماڵی کابرای دەڵەمەندی دیتەوە، خوشکەکانی بینی و ناسینی. بەلاّم ئەوان ئەویان نەناسی. دەرویش چوە ماڵی کابرای دەوڵەمەند وداوای خێراتی کرد .« خوسە» پارەی دایە. دەروێش وەریگرت و ڕۆیشت. بەلاّم دوور نەکەوت و لە گۆشەیەک خۆی مات کرد. پاشان بە پارێز چوە ژوورێک کە منداڵەکانی ئەو سێ خوشکەی لێ نوستبوون سەری هەر سێکیانی بڕی و هەلاّت.
« بەسێ» چوە ژووری منداڵەکان و چوە سەر سەری منداڵەکەی خۆی، دیتی سەریان بڕاوە. هاواری کرد و خۆشکەکان هاتن و دیتیان سەری منداڵەکای وانیش بڕاوە. ئەوان با خەریکی شین و گریان بن، بزانین دەرویش چدەکات؟
دەروێش بە غار چوە کن مێردی ئەو سێ خوشکە و گوتی: زوو خوتان بگەیێننەوە ماڵ. ژنەکانتان سەری منداڵەکانیان بڕیوە.

هەر سێ برا بە پەلە چوونەوە ماڵ و نۆکەریان بانگ کرد و ئەمریان کرد:« ژنەکانی ئێمە بەرە جەنگەڵ و بیان کوژە. لیباسە خوێناویەکانیں بێنەوە بزانین کوشتوتن.
نۆکەر چاری نەبوو. خوشکەکانی بە گریان بردە جەنگەڵ. خوشکەکان مەیتی منداڵەکانیشیان لە گەڵ خۆ برد ، چوونە جەنگەڵێکی چڕ. نۆکەر بەزەیی بە خوشکەکاندا هات، ئازادی کردن. کەوێکی کوشت ، لیباسەکانی خوێناوی کرد و بۆ برایانی بردەوە.
بەڵام سێ خوشک! لە بن دارێک دانیشتن و دەستیان بە گریان کرد. سێ کۆتر لە سەر دارەکە نیشتن و دەستیان بە قسان کرد. یەکیان گوتی :« کاتێ ئێمە لێرە دەفڕین و دەڕۆین، پەڕێکمان دەکەوێ. ئەگەر پەڕەکە هەڵبگرن و دە ئاوی ئەو کانیەی هەڵبکێشن کە لە بناری چیادایە و بە گەردنی مردوی دا بێنن، ئەو مردوە زیندوو دەبێتەوە.
کۆترەکان لە شەقەی باڵیان دا و ڕۆیشتن. پەڕێک کەوتە زەوی. کولیلک زمانی باڵدارانی دەزانی. پەڕەکەی هەڵگرتەوە و بە خوشکانی گوت:« با بچین کانیەکە بدۆزینەوە. لە خوارەوەی چیا کانیان دیتەوە. کولیلک پەڕەکەی دە ئاوێ هەڵکێشا و بە ملی کوڕەکەی داهێنا . کوڕ چاوی لێک کردەوە و هەناسەی هەڵکێشا. « بەسە» و « خوسە»ش وایان کرد و منداڵەکانیان زیندوو کردەوە.
بڕیاریاندا کە هەر لەو جەنگەڵە دا بژین و نە چنەوە ماڵی خۆیان. لە سەر چیا کۆنە خانوێکیان دیتەوە و کردیانە مزڵی خۆیان. با ئەوان لەو کۆنە خانوە دا بژین و بچین بزانین براکان چدەکەن.؟
ئەوان لە دڵدا زۆر نارەحەت بوون. ڕۆژێ نۆکەری مەعموری کوشتنی ژنەکانیان بانگ کرد و گوتیان:
- ئێمە بەرە ئەو شوێنە کە ژنەکانت لێ کوشتن. ڕۆیشتن و لە ڕێگادا توشی دەوێش بوون. ئەویشیان لە گەڵ خۆ برد. گەیشتنە ئەو جێگایە و دیتیان لە سەر چیا خانوێک هەیە و کوڕێک لەوێ یاری دەکات.
کولیلک لە پەنا پەنجەرە وێستا بوو براکانی دیت و بە خوشکانی گوت:« ئێوە

بڕۆن خۆتان بشارنەوە، من بە تەنیا قسەیان لە گەڵ دەکەم. خوشکەکان بە منداڵەوە خویان شاردەوە. کولیلک کوڕەکەی خۆی بانگ کرد و گوتی:
– بچۆ پێشوازی میوانان و ئەگەر پرسیان:« کێ لە ماڵە»؟ بڵێ:« تەنیا من و دایکم »
کوڕ چوە پێشوازی برایان و ئەوان پرسیان: « ئایا کەس لە ماڵێ هەیە ؟»
– تەنیا من و دایکم، کەسیتر نیە.
برایان گوتیان: « ئێمە بەرە لای ئەو. چوونە ژوور. مێردی کولیلک ژنەکەی خۆی ناسی و لە ئامێزی گرت و پرسی:
– خوشکەکانت لە کوێن ـ ئەو دەم« بەسێ» و «خوسە» و منداڵەکانیان هەتنە دەر و هەموو شاد بوون و یەکتریان لە ئامێز گرت. کولیلک هەموو ڕووداوەکەی بۆ باسکردن، برایان هەڵیان کێشا خەنجەر و دەرویشیان لە ت و پەت کرد. نۆکەر کە ژنەکانی تەکوشت بوو خەلاتیان کرد و بە خۆشی و شادی گەڕانەوە و بە ئارەزووی خۆیان گەیشتن. حکایەتی ئێمەش لێرەدا تەواو بوو.

## حەوت برایان ٥٦

هەبوو نە بوو ، غەیری خودا کەسیتر نەبوو. ژنێک حەوت کوڕی بوون و کچی نەبوو گەلێک لە خەمدا بوو کچی نیە. جارێکی دیکەش سکی پڕ بوو، کوڕەکانی گوتیان دەچینە ڕاو. ئەگەر کچت بوو، هێلەکێک بە دەرگاوە هەڵاوەسە تا ئێمە بێینەوە، ئەگەر کوڕیش بووتفەنگێک هەڵاوەسە تا ئێمە نەگەڕێینەوە. ئێمە خوشکمان دەوێ.

ژن کچی بوو تکای لە براژنی کرد، هێلەکێک هەڵاوەسێ. بەڵام ئەو ئێرەیی پێبرد و چوو تفەنگی هەڵاوەسی. دایک کەیف خۆش بوو کە کوڕەکانی زوو دەگەڕێنەوە.

کچ گەورە بوو، براکانی نەگەڕانەوە. هیچ نەیدەزانی کە برای هەن. ڕۆژێک لە گەڵ کیژەی هەڤاڵی گەمەی دەکرد، بە کێشە هاتن. کیژە دۆستەکانی بە گیانی برایان سوێندیان دەخوارد کە ڕاست دەکەن. کچەکە سەری لەو سوێندە دەر نەدەچوو نەیدەزانی بێژێ چە. گوتی: « من کە برام نیە چبکەم؟ مەجبورم بە گیانی گوێلکەکەمان سوێند بخۆم.

هەڤاڵەکانی گوتیان:« بۆ بە گیانی گوێلک سوێند دەخۆی، تۆ کە حەوت برات هەنە. کچ دەستی بە گریان کرد و چۆوە ماڵ و لە دایکی پرسی:« دایە داخوا من برام هەن.؟»

- ئەرێ، کیژم، تۆ حەوت برات هەن. ڕۆژێکی تۆ لە دایک بووی، براکانت چوو بوونە ڕاو. بە منیان گوت: ئەگەر کچم بێ، هێلەگ لە پێش دەرگا هەڵاوەسم. تا بگەڕێنەوە، ئەگەر کوڕیش بوو تفەنگ هەڵاوەسم تا ئیتر نەگەڕێنەوە. بەڵام ژنی

خاڵت لە ئێرەیان تفەنگی هەڵاوەسی و براکانت نەگەڕانەوە.
کیژ گوتی: « من دەڕۆم براکانم بدۆزمەوە.» کچ ڕێی داگرت بڕوا بە دنیادا بگەڕێ و براکانی ببینێتەوە، ڕۆی ڕۆی ئاخری گەیشتە خانوێک. دیاربوو کەسێک لەو ماڵە دا دەژی، بەڵام کەسیشی لێ نە بوو. چوە ژوور و وەتاغەکانی گەسک دا و نانی دروست کرد و هەموو کارەکانی ئەنجام دا و خۆی شاردەوە.
ڕۆژ ئاوا بوو براکان گەڕانەوە پێیان سەیر بوو کە: ماڵەکەیان گەسک دراوە، چێشت لێنراوە و کەسیش دیار نیە. چەند ڕۆژ هەر وا ڕابرد و کچ خۆی نیشان نەدەدان. ڕۆژێ حەوت براکان پێکەوە تەگبیریان کرد و قەراریان دانا کە شەشیان بچێتە ڕاو، یەکیش لە ماڵێ بمێنێ و بزانێ مەسەلە چیە. لە ماڵێ خۆی شاردەوە.
کچەکە لەکولێنێ هاتە دەر، وەتاغی گەسک دا وچێشتی لێنا و ئاوی هێنا تا هەویر بشێلێ، برای هاتە دەر و پرچەکانی گرت و گوتی :« بێژە پێم، چکارەی، لە کوێوە هاتووی و لێرە چدەکەی؟
– حەوت برام هەبوون ڕۆیشتوون و ماڵیان بە جێ هێشتوە. بە دەوری دنیادا دەگەڕێم بیان بینمەوە.
براکەی کەیف خۆش بوو گوتی: « کە وابوو تۆ خوشکی مەی. ئێستا دەچەم بە براکانم دەڵێم. چوو براکانی دیتەوە ولە دوور هاواری کرد: مزگێنی، مزگێنی، خوشکمان هاتوە.»
برایان فرە خۆشحاڵ بوون و لە خۆشیان یەکتریان گرتە ئامێز و ماچ کردن و بە پەلە بۆ ماڵ گەڕانەوە و سەربردەیان لە خوشکیان پرسی.
خوشک حکایەتی بۆ گێڕانەوە و گوتی: خاڵۆژنم چوە تفەنگی هەڵاوەسیوە تا ئێوە نەگەڕێنەوە. براکان گوتیان:« ئێستا ئێرە خانووی تۆیە. ئێمە هەموو ڕۆژ دەچینە ڕاو.»
لەم بەینەدا خاڵۆژن زۆر خۆشحاڵ بوو کە باشبوو حەوت برا گۆڕیان گوم کرد و کچیش بە دوایاندا. شەو لە ماڵ وەدەر کەوت و لە مانگی پرسی:« بێژە بزانم تۆ جوانتری یا من ؟»

مانگ وەلامی داوە و گوتی:« نە من و نە تۆ. بەڵکوو خوشکی حەوت برایان لە هەموان جوانترە»
خاڵۆژن کە ئەوەی بیست بە دوای دۆزینەوەی کچەکە دا وێڵ بوو، دیتیەوە. چوو لە دەرگای ماڵەکەی دا. کچ دەرگای لێ کردەوە و بە دیداری خۆشحاڵ بوو، خواردن و شیرینی بۆ هێنا. میوان بە کیژەکەی گوت:« تینوومە ئاوم بۆ بێنە.»
کچ ئاوی بۆ هێنا و خواردیەوە و گوتی :« ئێستا تۆش بخۆوە.»
خاڵۆژن بە دزی ئەنگوستیلەی دە پیلەی ئاوەکە هاویشت. کیژەکە خواردیەوە ، کەوت ومرد. ژن بە تاڵوکە دەر کەوت ڕۆی. بە خۆی گوت؛ ئێستا ئاسودە بووم.
براکانی گەڕانەوە دیتیان خوشکیان لە قوژبنێک کەوتوە و مردوە. دەستیان کرد بە شین و گریان و گوتیان« بەخت ڕووی لە ئێمە وەر گێڕاوە. نەیانویست خوشکیان لە قەبریدا بنێژن. سندوقێکیان ساز کرد و خستیانە ناو سندوق. لایەکی سندوقەکەیان بە زێڕ و لایەکەی تریان بە زێو داپۆشی و بزمار کوتیان کرد و لە پشتی حوشترێکیان بەست و حوشتریان لە مەزرا بەرەلا کرد.
کوڕی پاشا لەو ڕۆژە دا چوە ڕاو و دیتی حوشترێک بێ خاوەن لەو سەحرایە بەرەلایە. حوشتری بردەوە کۆشکی خۆی و سندوقەکە لە پشتی کردەوە، دیتی کیژێکی مردووی جوانی وەک مانگ لەوێدا ئارامی گرتوە.
ئەمری کرد کیژە بشۆن و کفنی بکەن. کیژەکان شوشتیان و کفنیان کرد. کوڕێکی چکۆڵە هاتە پەنا مەیتی کیژەکە. دەنگیان دا کە : بڕواتە ئەو لا و دەستی لێنەدا. کوڕەکە دەستی بۆ زاری مردوو برد و ئەنگوستیلەی لە زاری هێنە دەر. کچەکە گورج چاوی هەڵێنان و هەستا و دانیشت. هەموو ترسان و گوتیان: چ قەوماوە؟
کیژەکە لە هەوەڵ تا ئاخر ڕووداوەکەی بۆ گێڕانەوە. کوڕی پاشا لێی پرسی: « دەتەوێ شو بە من بکەی ؟
کچەکە ڕازی بوو. حەوت شەو ورۆژ کردیانە جێژن و شایی و بە ئارەزوی خۆیان گەیشتن.

## میرزا مەحمود ٥٧

لاوێک بوو بە ناوی میرزا مەحمود. ڕۆی کە بە دنیادا بگەڕێ. چوە نێو جەنگەڵێک و لەوێ خانوێکی بۆ خۆ دروست کرد. هەموو ڕۆژێ دەچوە ڕاو، و بە گۆشتی ڕاو ژیانی دەبردە سەر. ڕۆژێ ڕێوییەکی گرت و گوتی دەیکوژم و کەوڵەکەی بۆ خاوێن کردنەوەی لاقانم بە کار دێت.

ڕێوی دەستی کرد بە پاڕانەوە و گوتی: « ئەی میرزا مەحمود مەمکوژە. ڕۆژێ بە کارت دێم. بمبەوە ماڵ و ئاگام لە ماڵەکەت دەبێ.»

میرزا مەحمود وازی لە کوشتنی ڕێوی هێنا و بردیەوە ماڵ. ئەو ڕۆژە دو ڕاوی کردن یەکێکیان بۆ خۆی خوارد و یەکی دا بە ڕێوی. ڕۆژی دوایە ڕێوی چوە جەنگەڵ و توشی گورگ بوو. گورگ گوتی:« ئەی ڕێوی دەڵێی چی بتخۆم؟»

ڕێوی گوتی:« دامنا منت خوارد، پاشان چی؟ دیسان برسی دەبیەوە. باشترە لە گەڵ من بێی و بچینە ماڵی میرزا مەحمود. ئەو هەموو ڕۆژێ ڕاو دەکا و بۆت دێنێ.»

گورگ ڕازی بوو. پێکەوە چوونە ماڵی میرزا مەحمود. ئەوێ ڕۆژێ میرزا مەحمود سێ ئاسکی کوشت. هاتەوە ماڵ تەماشای کرد گورگ هاتۆ تە وێ. خواردنی دا بە هەموان و خەوتن. بەیانی میرزا مەحمود چوە ڕاو و ڕێویش جارێکی دیکە چۆوە جەنگەڵ و توشی ورچ بوو.

ورچ ڕێوی گرت و گوتی :« ئێستا دەتخۆم.»

– دامنا منت خوارد، پاشان تۆ بە خواردنی من تێر نابی. باشترە بچینە ماڵی میرزا مەحمود تا ئەو هەموو ڕۆژێ گۆشتی ڕاوت بۆ بێنێ.

ورچ گوتی .« باشە با بڕۆین. بەڵام ئەگەر بتەوێ فریوم بدەی دەتخۆم. ئەو ڕۆژە میرزا مەحمود توانی چوار ئاسک ڕاو کات. لە بەر خۆیەوە گوتی:« مانای چی. بێگومان دیسان میوانمان هاتوە،. چۆوە ماڵێ و دیتی ورچ لە ژوورێ دانیشتوە. خواردنی دا بە هەموان و بەیانی چۆوە ڕاو. ڕێویش چوە جەنگەڵ توشی پڵنگ هات. پڵنگ پەلاماری دا و گوتی: دەتخۆم.

ڕێوی گوتی لە خواردنی من چیت وەگیر دەکەوێ. باشترە بچینە ماڵی میرزا

مەحمود. ئەو هەموو ڕۆژێ خواردن دەدا بە من و گورگ و ورچ. دیارە گۆشتی ڕاو دەدا بە تۆش.
پڵنگ ڕازی بوو گوتی:« باشە قەی ناکا، با بچین.»
ڕۆیشتن. ئەو ڕۆژە میرزا مەحمود پێنج ئاسکی ڕاو کرد و بە خۆی گوت:« بێگومان دیسان میوانی تازە هاتوە» هاتەوە ماڵ و دیتی بە ڕاستی پڵنگ لە ژووری دانیشتوە. گۆشتی بە سەر هەمواندا بەشکرد و خواردیان و خەوتن.
ڕۆژی دوایی ڕێوی دیسان چوە جەنگەڵ. دیتی سیمرغ بۆ لای ئەو دەفڕێ. سیمرغ ڕێوی پەلامار دا چنگی گەیاندێ و گوتی:
– ئەی ڕێوی تەمەنت کۆتایی هاتوە و ئێستا دەتخۆم.
ڕێوی دەستی کرد بە پاڕانەوە و گوتی :« ئەی سیمرغ من مەخۆ. باشترە بچینە ماڵی میرزا مەحمود. ئەو هەموو ڕۆژێ من و گورگ و ورچ و پڵنگ تێر دەکات، بۆ تۆش پاروێک هەر پەیدا دەبێ.»
سیمرغ ڕازی بوو، گوتی« با بڕۆین.»
ئەو ڕۆژە میرزا مەحمود شەش ئاسکی ڕاو کرد. گوتی « سەیرە، دیسان میوان زیادیان کردوە» هاتەوە ماڵ و دیتی سسیمرغیش هاتوە. خواردن بۆ هەموان هەبوو. خواردیان و تێر بوون و نوستن. بەیانی کە میرزا مەحمود چوە ڕاو، ڕێوی بە وانی گوت::« حەیا شتێکی باشە. میرزا مەحمود نۆکەری مە نیە. دەبێ جۆرێک تۆڵەی بکەینەوە..
– تێکڕا گوتیان: ڕاستە دەبێ تۆڵەی بکەینەوە، بەڵام نازانین چبکەین.
ڕێوی گوتی:« من دەزانم چبکەین. وەرن ژنێکی بۆ بێنین»
هەمووتێکڕا گوتیان ڕاستە. وەرن بچینە وڵاتی چین و ماچین و کیژی پاشا بۆ میرزا مەحمود بێنین. بریاریاندا کە ڕێوی وگورگ و ورچ و سیمرغ بچنە چین و ماچین، پڵنگیش بمێنێتەوە ئاگای لە ماڵێ بێت. کەوتنە ڕێ. دەریایەکی گەورە لە سەر ڕێیان بوو. سیمرغ ڕێوی بە چنگ هەڵگرت و پەڕاندیەوە. گورگ و ورچ بە قەراخێ دا ڕۆیشتن. هەموویان لە دەریا پەڕینەوە دیتیان جوتیارێک جوتی دەکا، کابرا ئەو دڕندانەی دیت ترسا و ڕایکرد. گایەکانیش بە گاسن و

ئامورەوە ترسان و هەڵاتن.
ڕێوی بە گورگ و ورچی گوت:« وەرن ئێوە دە جوتی بکەم و زەوی بکێڵم. خەڵک ئەگەر وا ببینن سەریان سوڕ دەمێنێ و هەموو دێنە سەیر و تەماشامان. کیژی پاشاش دێت تا تەماشای ئەو کارە بکا. ئەو دەم سیمرغ دەبێ هەڵیگرێ و بفڕێ، ئێمەش بە دوایدا.
بە قسەی ڕێویان کرد. خەڵک لە هەموو لایەکەوە کۆ بوونەوە و هاتنە سەیری وەی کە بزانن ڕێوی و گورگ و ورچ چۆن جوتی دەکەن. کیژی پاشایان ئاگادار کرد. ئەویش سواری ئەسبی خۆی بوو هات ئەو شتە سەیرە ببینێ. ڕێوی کە کیژی پاشای دی،
بانگی سیمرغی کرد و گوتی:« خۆیەتی. زوو بیگرە و ببیە.»
سیمرغ کیژی پاشای پەلامار دا و بە چنگ گرتی و فڕی و بەرەو ئاسمان بەرز بۆوە. خەڵک کردیانە هاوار: ئەی وای کیژی پاشایان برد، بە پەلە چوون پاشا ئاگادار بکەن.
کیژی پاشایان گەیاندە ماڵی میرزا مەحمود. ئەو ڕۆژە کە میرزا مەحمود چوو بوە ڕاو. حەوت ئاسکی ڕاو کرد و بە خۆی گوت:« بێگومان دیسان میوانێک هاتوە» میرزا مەحمود هاتەوە ماڵ، جانەوەران پێشوازیان لێکرد و لە پێشی سەمایان کرد. هەر یەکە ئاسکێکی دانێ و دوو ئاسک مانەوە. میرزا مەحمود گوتی:« کامتان بەشی خۆتان وەر نە گرتوە.؟
پاشان چوە ژوور و دیتی کیژێک لە وێ دانیشتوە وەک مانگی چاردە. میرزا مەحمود و گولیزاری کیژی پاشا هەر بە نیگای هەوەڵ ئاشقی یەکتر بوون و مارەیان بڕی و ژیانێکی خۆشیان دەست پێکرد.
با ئەوان خەریکی کەیف و شادی خۆیان بن، بزانین پاشا چدەکات. پاشا هەموو پیرێژن و فاڵگرەوەی کۆ کردنەوە و فەرمووی: بزانن کچەکەی لە کوێیە. پیرێژن فاڵیان گرتەوە و ڕەمڵیان هاویشت و هیچیان نەزانی. پاشا پرسی: « داخوا تەواوی فاڵگرەوەکان هاتوون و لێرەن،؟» لە وەڵامدا گوتیان یەک نە هاتوە کە لە گەڕەکی سەبەتە چنان دەژێ.

پاشا فەرمووی ؛ بیهێنن. پیرێژنی فاڵگرەوەیان هێنا و ڕەملی هاویشت و گوتی : « کیژی تۆ لە جەنگەڵێکدا لە ماڵی میرزا مەحمودە»
پاشا گوتی :« پیرێژن! ئەگەر کیژەکەم بۆ بێنیەوە، بە گرانایی خۆت زێڕت دەدەمێ.»
پیرێژن گوتی :« زۆر باشە. خەریک دەبم بزانم چدەکەم.»
پیرێژن کوپەیێکی گەورەی گڵی هەڵگرت و نێوەکەی بە شکڵی جۆر بە جۆر نەخشاندو دە ورگی گای دروو هاویشتیە سەر ئاو. خۆشی سواری بوو لە دەریادا کەوتە ڕێ. لە جیاتی پاڕۆ مارێکی گەورەی بەدەستەوە گرت. پیرێژن بەو لۆتکە ساختەیە لە دەریا پەڕیەوە و چوە قەراخێ. کوپەکەی لە بن دارێک شاردەوە و خۆی ڕووی دە ماڵی میرزا مەحمود کرد. گولیزار لە نیزیک ماڵێ دانیشتبوو، پیرێژنی بینی کە بۆ لای دێت. پێی گوت بۆ لام مەیە، من پیرێژنم خۆش ناوێن.
پیرێژن گریا و پاڕاوە و گوتی:« بەزەییت بە من دابێ. لە گەڵ زیارەتکەران هاو سەفەر بووم، بە جێماوم وڕێم بزر کردوە. جێ و ڕێیەکم بدەیە تا ئەوان دەگەڕێنەوە.
گولیزار دەنگی دا و گوتی :« بڕۆ. حەیواناتی دڕندە لە ماڵی من هەن و دەتخۆن.
پیرێژن ڕۆی لە سەر ڕێگا دانیشت و چاوە ڕوانی میرزا مەحمود بوو بگەڕێتەوە، ئاخرەکەی میرزا مەحمود لە ڕاوێ هاتەوە دیتی پیرێژنێک لە سەر ڕێگا دانیشتوە و دەگری. لێی پرسی: بۆ دەگری؟
پیرێژن گوتی : لە رفیقانم هەڵبڕاوم و لە جەنگەڵ ڕێگام بزر کردوە. چوومە ماڵی ئێوە، ژنەکەت دەری کردم.
میرزا مەحمود گوتی:« مەترسێ و لە گەڵ من وەرە. چەندی دەتەوێ لە ماڵی من بە. گەیشتنەوە ماڵ و میرزا مەحمود بە گولیزاری گوت:
– لێگەڕێ با پیرێژن لە ماڵی ئێمە بژی. کاری بە کاری ئێمە نەداوە. گولیزار گوتی:« شومە، بەڵایەکمان بە سەر دێنێ، ئاخری خۆت پەشیوان دەبیەوە. کەیفی خۆتە.»

پیرێژن لە ماڵی میرزامەحمود مایەوە. بەیانی زوو هەستا، وەتاغی گەسک دا و چێشتانەی ئامادە کرد و نانی دا بە هەموان و قاپەکانی شوشتن و دەستی کرد بە چێشت لێ نان بۆ نێوەڕۆ. میرزا مەحمود چوە ڕاو و گولیزار لە گەڵ پیرێژن مایەوە. ئەوەندەی داستان و قسەی خۆش بۆ گولیزارێ کرد کە دڵی بۆ لای خۆ ڕاکێشا. پاشان لیباسە چڵکنەکانی شوشت وبە گولیزاری گوت: « کچم بچینە قەراخ دەریا و لیباسەکان بە ئاو دادەین. بە تەنیا دڵم تەنگ دەبێ.

گولیزار لە گەڵ پیرێژن کەوتە ڕێ. کە گەیشتنە دەریا پیرێژن کوپەی لە پشتی دارەکە هێنا دەر و بە گولیزاری گوت:

کیژم زوو وەرە. لەو قوڵکەیە دا شتێک دەتروسکێ نازانم زێرە یا زیو. تۆ کچی پاشای باشتر دەزانی.

گولیزار بە غار چوو دیتی بە ڕاستی لە نێو قوڵکەدا شتێک دەدرەوشێ. نەیزانی کە قوڵکە نیە و کوپەیەکی گەورەیە. داهاتەوە سەری بردە نێو کوپەکە. پیرێژن لاقی گرت و خستیە نێو کوپە. پاشان زاری کوپەی بە ورگی گا بەست و دە ئاوێی هاویشت و خۆشی سواری بوو بۆ لایماڵی خۆی. گەیشتە ڕۆخی دەریا. پاشا و دار و دەستەی لە وێ چاوە ڕوانی بوون. پیرێژن بە پاشای گوت: « کیژەکەتم هیناوە.» پاشا خۆشحاڵ بوو، خەزێنە داری بانگ کرد و فەرمووی پیرێژن بکێشن و بە گرانایی خۆی زێڕی بدەنێ.. پاشای بە شادی بە جێ دێڵین، بزانین میرزا مەحمود چدەکات.؟

میرزا مەحمود ئەوێ ڕۆژێ شەش ئاسکی ڕاو کرد. لە دڵدا فیکری کردەوە بێگومان ژمارەی ئەهلی ماڵێ کەم بوونەوە.. هاتەوە ماڵ دیتی گولیزار دیار نیە و جانەور خەمبار وێستاون و ناتوانن هیچ بێژن. میرزا مەحمود خەمبار و دڵتەنگ چوە دەجێ و نوست. کاتێ میرزا مەحمود چوو بخەوێ، ڕێوی بە سیمرغی گوت:

– بڕۆ با بچین گولیزار بێنینەوە. کاری مە بەم جۆرە دەبێ: تۆ من هەڵگرە و لە سەر بانی کۆشکی پاشام دانێ. خۆت بفرە و بچۆ پەنا پەنجەرەی ژووری گولیزار. ئەو تۆ دەناسێ و دێتە باڵە خانە. تۆ بیگرە و بگەڕێوە بۆ ماڵێ.

سیمرغ ڕازی بوو، ڕێوی هەڵگرت و بەرەو چین و ماچین لە شەقەی باڵانی دا.
سەرتان نەیێشێنم هەر ئەو شەوە گولیزاریان هێناوە ماڵی میرزا مەحمود. ئەو دوو ئاشقە و ماشقە بە دیداری یەکتر شاد بوون و کەوتنە ئامێزی یەکتر.
پاشا ئەمری کرد تەپڵی ترس لێبدەن و لەشکری کۆ کردەوە وچوە شەڕی میرزا مەحمودی تا کیژەکەی لێ بستێنێتەوە. بەیانی کە میرزا مەحمود و جانەوەران وە خەبەر هاتن، دیتیان لەشکرێکی زۆر بۆ لای وان دێت.
ڕێوی هاواری کرد:» دەزانم دەبێ چبکەین. ئێستا دەچمە جەنگەڵ هەر چی ڕێوی و گورگ و ورچ و پڵنگ و باڵدار هەیە بانگیان دەکەم و دەیانهێنم. بە یارمەتی ئەوان دەتوانین لەشکری پاشا پەرش و بڵاو بکەین.
ڕێوی چوو تەواوی جانەوەرانی بانگ کرد. بە قەد ئەستێرەی ئاسمانان جانەوەر کۆ بوونەوە. لەشکری پاشا دیتی ئەو هەموو جانەوەرە دێنە شەڕی وان، ترسان و هەڵاتن. ئاخر شەڕ لە گەڵ جانەوەران دژوارە. باڵدار چاویان دێننە دەر، ورچ پشتی شەر کەران دەشکێنن، گورگ سگیان دەدڕن. هیچیان بە سلامەتی دەر ناچن.
پاشایان ئاگادار کرد. بە خۆی گوت: شەڕ لە گەڵ میرزا مەحمود فایدەی نیە بۆچی لە بەر کیژەکەم سەربازانم فیدا بکەم.؟ پاشا وازی لە شەڕ هێنا. میرزا مەحمود و گولیزار بە ئاواتی خۆیان گەیشتن و حیکایەتی مەش تەواو بوو.

## محەممەد و موقەدەم ٥٨

رۆژێ لە رۆژان پاشـایەک بوو وەزیـرێکی هەبوو. هـەر یەکـە کـورێکیـان هەبوو، کورِی پاشـا ناوی« موقەدەم» و کورِی وەزیر « محەممەد» بوو. هەر تک لە مـەدرەسـەیەک دەیانخوێند. کورِی وەزیر چاکی دەخوێند و بەڵام کورِی پاشـا نەیدەخوێند.

پاشا چوە کن مامۆستا و گوتی:« بۆ چاک دەرس بە کورِەکەم نالّێی.؟»

لەو کاتە دا منداڵان کاتی پشو دانیان هەبوو، چوو بوونە دەرێ. مامۆستا بە پاشای گوت، کەمێ بوێستە خۆت دەزانی. مامۆستا خشتێکی لە بن دۆشەکی « موقەدەم» دانا و پەرِە کاغەزێکیشی لە ژێر دۆشـەگی کورِی وەزیر دانا. زەنگ لێدرا و منداڵ هاتنەوە و هەر کەس لە سەر دۆشەگی خۆیان دانیشتن. موقەدەم دیتی بابی هاتوە، کتێبێکی هەڵگرت و دەستی بە خوێندنەوە کرد. هیچ هەستی بەوە نەکرد کـە وا خشـتێکی گەورە لە بن دۆشـەگی دانراوە. بەڵام محـەممەد هێشـتا دەسـتی بە خـوێندن نەکرد بوو، زانـی کە دۆشـەکی بەرز ترە و فـیکری کردەوە کە دەبێ شتێکیان لە ژێر دۆشـەگەکەی دانابێ.

مامۆستا لێی پرسی::« بۆ چی دەرس ناخوێنی.؟»

محەممەد گوتی: « دۆشەگی من بە قەد پەرِە کاغەزێک بەرزتر بوە. نازانم چییان لێ داناوە.

پاشا دیتی خەتا لە کورِەکەیەتی، مامۆستا تەخسیری نە کردوە. گوتی :

- بەڵێ، کـورِەکـەم ناتوانێ دەرس بخـوێنێ، لە مـەو دوا خـوێندی باشـە ، دەنا خەتای خۆیەتی.

چەند سـاڵ رِابرد، مـحـەممەد دەرسی خـۆی تەواو کـرد، مـوقـەدەم نەیخـوێند و

مایەوە، چەند ساڵی دیکەش ڕۆی ئەم دوو کوڕە توشی یەکتر بوون. محەممەد پرسی:« ئەی موقەدەم بۆ وا لاواز بووی؟
- لە خەودا ئاشقی کیژی پاشایەک بووم. لە داخی ئیشق ئازار دەکێشم. ئەگەر نەمگەیێنیە ئەو، دیق دەکەم.
محەممەد چەند دەقیقە ڕاما و گوتی :« هیچ بە دایک و بابمان ناڵێین. دوو ئەسپی باش و دوو خورجێن سکەی زێڕ هەڵگرە، پێکەوە دەڕۆین تا ئەو کیژە بدۆزینەوە،
کە هەوا تاریک بوو موقەدەم دوو ئەسپی لە تەویلەی بابی هێنا دەر و دوو خورجێن سکەی زێڕی لە ئەسپێکی بار کرد و خۆی سواری ئەسپێکی دیکە بوو. محەممەدیش سواری ئەسپێک بوو هێندێ دەرمان وخواردەمەنی و نۆقل و نەباتیان هەڵگرت و کەوتنە ڕێ. تەواوی شەو ڕۆیشتن تا بوو بە ڕۆژ. لە نەکاو دەنگی لووری جانەوەرێکیان بیست. محەممەد گوتی:
- ئەی موقەدەم. تۆ لێرە ڕاوەستە تا من بچم بزانم چ باسە.
موقەدەم ڕایگرت و گوتی:« بۆ چی تۆ بچی؟ نەکا ئەو جانەوەرە پەلامارت بدا و بتخوا.
محەممەد گوێی نەدا بە موقەدەم و ڕۆی. دیتی پلنگێک لە سەر بەرزاییەک کەوتۆتە خوار و دڕکێکی دە پەنجەی ڕاچوە و لە بەر ژانی ئەو دەناڵێنێ. محەممەد دڕکی لە لاقی پڵنگ دەر هێنا و مەلحەمی کرد و برینەکانی پێچا. ویستی بڕوا پڵنگ وە قسە هات و گوتی:« ئەی لاو تۆ وەدوای کاری خێر دەکەوی. پاشان چەند مووی لە سەری خۆی کردەوە و دای بە محەممەد و گوتی

- هەر کاتی پێوستیت بە من هەبوو، یەک لەو موانە دە ئاگر باوێ، کورج لە لات ئامادە دەبام
محەممەد موەکانی لە دەسرە بەست و دەگیرفانی نا و چۆوە کن موقەدەم و گوتی :« با بڕۆین »
ڕۆیشتن تاگەیشتنە شوێنێک دیتیان جۆگەلەیەک دەڕوا، لەلایەکی گەنم چانراوە،

له لایەکەی دیکە مێروله ده هاتوو چۆ دان.
محەممەد گوتی : « وەر پردێک دروست بکەین با مێرولەکان بپەڕنەوە و هێندێ گەنم بۆ خۆیان کۆ بکەنەوە. موقەددەم پرسی:
– دروستکردنی پرد پێمەرە و قوڵنگ و بیور و تەختەی گەرەکە، ئەوانە له کوێ بێنین.
محەممەد گوتی:» من پرد بۆ حوشتر دروست ناکەم ئەوانە مێرولەن. دەتوانن بە سەر دارێکدا بپەڕنەوە. چەقووی له گیرفانی دەر هێنا، قامیشێکی بڕی و له سەر جۆگەلەکەی دانا و مێرولەکان پەڕینەوە.
محەممەد به موقەددەمی گوت:« باشە، ئێستا بینیت کە پردم دروست کرد و مێروله پەڕینەوە.
مێرولەیەکی گەورە به دەنگی بەرز به محەممەدی گوت:« ئەی لاو تۆ کاری زۆر گەورەت له دەست دێت.»
پاشان مێروله مویەکی له سەری خۆی کردەوە و دای به محەممەد و گوتی :« هەر کاتێ پێویستیت به من هەبوو، ئەو مووەی ده ئاگر باوێ و من کورج دەکەمە لات.»
محەممەد موەکەی له دەسرەی دا شاردەوە و ده گیرفانی نا و ڕێگای خۆیان درێژە پێدا. دیتیان دووکەڵێکی باریک بۆ ئاسمان دەچێ. بۆ لای دووکەڵ ڕۆیشتن. دیتیان پیرێژنێک به تەنیا دانیشتوە. محەممەد گوتی:
– دایه گیان، ڕێگا دەدەی بێینه ماڵی تۆ.
– من پیرێژنێکی بێکەس و فەقیرم. ئەگەر هەژاری من نارەحەتتان ناکات، فەرمووون وەرنە ژووری.. چوونە ژوور، دیتیان به ڕاستی هیچی تێدا نیە.
پارەیان دا به پیرێژن و گوتیان:
– برۆ بۆ ئێمە و بۆ خۆت لێفە و دۆشەک و گۆشت و برنج و نان و ڕۆن بکڕە و به حەمباڵێک بیانهێنەوە ماڵ و وەردەوە.
پیرێژن چوو هەموو شتێکی کڕی دای به حەمباڵ و بردیەوە. نانی دروست کرد و پێکەوە خواردیان و تێر بوون.

محەممەد لە پیرێژنی پرسی:« دایە پیرە، داخوا پاشای ئێوە کچی هەیە.؟»
پیرێژن لە وەڵامدا گوتی:« باشترە هەر باسی نەکەن، زەحمەتە دەست بگاتە ئەوێ.

محەممەد و موقەدەم گوێیان نەدا بە پیرێژن و پرسیان :« چۆن دەکرێ لە کیژی پاشا خوازبێنی بکرێ.؟»
- ئەگەر بتانەوێ خوازبێنی بکەن، دەبێ بچنە باخ و کۆشکی پاشا. دەست بکەن بەگەسک لێدانی جادەکان و ئاو دانی گوڵ و
باخچە، ئەو دەم باخەوان دێ و دەوباتە کن پاشا.

ڕۆژی دوایی محەممەد چوە کن پاشا و موقەدەمیش لە کن پیرێژنێ بە جێما.
محەممەد چوە نێو باخ و یەکێکی بانگ کرد، دوو درهەمی دایە و گوتی:« باخەکە گەسک بدە و ئاوی دە. باخەوان هات دیتی باخ گەسک دراوە. چوە کن پاشا و گوتی:« پاشا سلامەت بێ دیسان خوازبێنیکەری کیژەکەت هاتوە.»
- برۆ بیهێنە نێرە. باخەوان هات محەممەدی بانگ کرد. محەممەد چوە کن پاشا. ئیزنی دا کە دانیشێ. پاشان پێی گوت:
- هێنانی کچی من بۆ تۆ زۆر دژوارە. سێ مەرجی هەیە، ئەگەر ئەنجامیان نەدەی لە سەرت دەدەم. باشترە واز لەو کارە بێنی. بەزەییم بە لاوێتیت دادێ.
محەممەد گوتی : « واز ناهێنم. یا دەمرم یا کیژەکەت دێنم.»
پاشا گوتی: « ئێستا کە واز ناهێنی، گوێ بدە مەرجەکانم. سەگێکم هەیە، تۆ دەبێ سەگێک پەیدا بکەی کە بە سەر سەگی مندا زاڵ بێ.»
محەممەد گوتی:« سبەی خەڵکی لە مەیدانی شار کۆ بکەوە تا من سەگی خۆم بێنم.» شەوی لە ماڵی پیرێژن بردە سەر و بەیانی موی پڵنگی هەڵپروزاند و پڵنگ دەم و دەست پەیدا بوو. محەممەد قەڵادەی دە ملی کرد و بردیە مەیدان. خەڵک پێیان سەیر بوو دەیانگوت ئەوە چ جۆرە ئینسانێکە. تەنانەت پڵنگی درندەش بە قسەی دەکات.
کاتێ سەگی پاشا پڵنگی دیت زۆر ترسا دەتگوت پشیلە سەگی دیوە. پڵنگ

سەگی هەڵگرت و بە سەر سەری خەڵکدا فڕێی دا.پیاوەکانی پاشا بە غار خۆیان گەیاندێ، دیتیان نیوە گیان کەوتوە.
پاشا زۆر توڕە بوو گوتی:« من گوتوومە سەگ بێنێ، ئەو پڵنگی هێناوە.»
وەزیر بە پاشای گوت:« قیبلەی عالەم لە خۆڕا هەر او داد مەکە. دەبینی چەندە بە توانایە کە پڵنگی کردۆتە گوێ لە مستی خۆی و هێناویەتی.» پاشا بێدەنگ بوو.
محەممەد گوتی :« باشە، دەبێ چکارێکی تر بکەم.
– لە عەمبار دا هەرزن و گەنم تێکەڵ بوە، دەبێ لێکیان جیا کەیەوە.
محەممەد گوتی: « کلیلی عەمبارم دەیە. شەو لە وێ دەبم وتا بەیانی هەرزنەکان لە گەنم جیا دەکەمەوە.»
پاشا کلیلی دایە. محەممەد دەگیرفانی ناو و چۆوە کن پیرێژنێ و لێی نوست. نیوە شەو کە هەموو خەویان لێکەوتبوو، هەستا وموی مێرولەی هەڵپرووزاند. مێرولە هەموو مێرولەی دنیای لە گەڵ خۆی هێنا و ئامادە بوو. تا سبەینێ هەرزن و گەنمیان لێک جیا کردەوە و ڕۆیشتن. بەیانی محەممەد هاتە کن پاشا و گوتی:« تەواوە، ئەم مەرجەشم بردە سەر.»
پاشا باوەڕی نە کرد و خۆی چوو دیتی بە ڕاستی گەنم و هەرزن لێک جیا کراونەوە. محممەد گوتی :« مەرجەکەی دیکەت چیە؟»
پاشا گوتی: « دەبێ عەمبارێک خوێ بخۆی.»
محەممەد فیکری کردەوە: ئاخر عەمبارێک خوێ ناخورێ. ئەم ماستە بێ موو نیە. بە پاشای گوت:
– ئەی قیبلەی عالەم، دوو مەرجی تۆم ئەنجام دان و تەنیا یەکیان ماوە. ئێستا چل ڕۆژە لە ماڵی خۆم دوور کەوتوومەوە، تا ئێستا دایک و بابم نە دیون. چل ڕۆژم مۆڵەت بدە، تا بچم ئەوان ببینم و بگەڕێمەوە.
پاشا گوتی : « زۆر باشە. کلیلی عەمباری دایە»
محەممەد کلیلی عەمباری وەر گرت و چۆوە ماڵە پیرێژنێ. هێندێ کرێکاری بە کرێ گرتن. لە ماڵە پیرێژنێوە کاناڵێی ژێر عەردی لێدا بۆ حەساری کیژی پاشا

و بە بیست ڕۆژ تەواوی کرد. محەممەد موقەدەمی نارد و گوتی:« خۆ بگەیێنە ماڵی کچی پاشا و بزانە« خواردنی عەمبارێک خوێ» یانی چی.؟

موقەدەم ڕۆی و تا بەیانی لە ماڵی کیژی پاشا بوو. هیچی نە زانی. هەموو شەوێ دەچوو، هیچی وەگیر نەدەکەوت. ڕۆژی چلەم محەممەد دیسان موقەدەمی نارد و خۆشی دەگەڵی چوو لە پشت دارێک خۆی مات کرد و گوێی هەڵخست تا بزانێ موقەدەم پرسیارێک دەکا یانا. موقەدەم لە گەڵ کیژەکە شەوی بردە سەر و هیچی نە پرسی. بەیانی محەممەد لێی پرسی:

- بۆ چی هیچت نە پرسی؟ دەتەوێ ئیمڕۆ پاشا لە سەرم بدا.؟ پاشان محەممەد خۆی چوە کن کیژەکە و لێی پرسی:

کچی پاشا لە پێشدا ڕووی خۆی داپۆشی و هیچی نەگوت. محەممەد دڵنیای کرد و گوتی: « تۆ لە جێی خوشکی منی. پێم بڵێ بزانم خواردنی عەمبارێک خوێ، مانای چیە؟

کیژەکە گوتی :« تۆزێک خۆێ لە دەسرۆکەیەک بکە و کاتێ چوویە کن بابم برێک خۆی دە زارت بنێ و بڵێ:« ئەی پاشا چ عەمبارێک و چ تۆزێک خوێ بخۆی هەر یەکە!»

محەممەد پاشان هاتەوە کن پیرێژن و تۆزە خوێیەکی دە دەسرەی کرد وچوە کۆشکی پاشا. دەسماڵەکەی کردەوە و بڕوکە خوێیەکی دەزاری نا و گوتی:« ئەی پاشا چ عەمبارێک و چ تۆزە خوێیەک.»

پاشا گوتی : بەڵێ هەموو مەرجەکانت بردە سەر. پاشا حەوت شەو وڕۆژ شایی و زەماوەندی ساز کرد. پاش بوک گوێزتنەوە محەممەد بە پاشای گوت:« پاشا سلامەت. ڕێگامان بدە بچینەوە ماڵ دایک و بابم بە تەنیا ماونەوە.

- پاشا ئەشیای سەفەری کیژەکەی ئامادە کرد و چل سواری چەکداری ڕەگەڵ خستن و کەوتنە ڕێ.

محەممەد بە موقەدەمی گوت:« وەرە سواران ئیجازە بدەین بچنەوە ماڵی خۆیان.

- موافیقم، با بڕۆنەوە. سوارەکان گەڕانەوە.

محەممەد و موقەددەم و ژنەکەی مانەوە. محەممەد بە خۆی گوت: من کەمێک پێشتر دەڕۆم، تا موقەددەم و ژنەکەی ئازادتر راز و نیازی خۆیان بکەن. ڕکێفی لە ئەسپی دا و وەپێشیان کەوت. موقەددەم و ژنەکە لە دواوە گەپ و گاڵتەی خۆیان دەکرد. لە نەکاو دیتیان بورجێک لە بەرانبەریانە. موقەددەم گوتی : « وەرە لە ژێر سێبەری ئەو بورجە تۆزێ بحەسێینەوە.

بەڵام ئەو بورجە ئەفسون کرا بوو. سێ کۆتر بە سەر محەممەدی دا سوڕان و یەکیان بەوی دیکەی گوت:

– خوشکێ! ئەو بورجە ئەفسون کراوە، ئەگەر موقەددەم و ژنەکە لە نیزیکی ئەو دابنیشن دە سووتێن. ئەگەر محەممەد ئەم ڕازە بە وان بڵێ، خۆی دەبێتە بەرد.

محەممەد بە غار چوو برجەکەی وێران کرد. موقەددەم لە دڵدا گوتی:« سەیری کە. خۆی هەوڵی دا ئەم ژنەم بە نسیب بێ، ئێستا ئیرەییم پێ دەبات. ڕێگایان گرتە بەر و ڕۆیشتن. دیتیان کانیەک لە وێیە وداره قەیسییەکی لە سەره.

موقەددەم گوتی: با لە ژێر سێبەری ئەم داره دابنیشین. کۆترەکان جارێکی دیکە لە سەر سەری محەممەد فڕین و یەکیان بە وی دیکەی گوت:« ئەگەر موقەددەم و ژنەکەی لە ژێر ئەم داره دانیشن، دەبەن بە گورگ. ئەگەر محەممەد ئەم ڕازەیان پێ بڵێ، خۆی دەبێ بە بەرد.

محەممەد چوە سەر کانیەکە. ئاوەکەی قوڕاوی کرد و دارەکەی بڕی و هەر سێکیان کەوتنە ڕێ. موەقەددەم جارێکی دیکەش فیکری کردەوە کە :« سەیری کە، بورجەکەی وێران کرد، ئاوی کانی قوڕاوی کرد ، دارەکەی بڕی، چ ئیرەییەک»؟ بەڵام هیچی بە سەر زماندا نەهات و کەوتنە ڕێ. بەڵام پاشا، ژنی کوڕەکەی لە خەو هات و ئاشقی بوو. خەبەری زانی کە کوڕ و باوکی دێنەوە. کەوتە فیکر کە چۆن کوڕەکەی لە بەین بەرێت و ژنەکەی وەگیر خات. ئەمری کرد ئەسپێک بێنن، زین و لغاوی ژاراوی وێخەن و تەلەسمی کەن تا هەر کەسێکی سواری بێت، بسووتێ. پاشان ئەو ئەسپەی بە وەزیر ئەسپارد و گوتی:

– بە پێشوازی کوڕەکەمەوە بچوو، ڕەنگە ئەسبەکەی ماندوو بێت، بڵێ سواری

ئەم ئەسپە بێت. وەزیر ئەسپی یەدەک کرد و ڕۆی. کۆترەکان جارێکی دیکە لە بان سەری محەممەد فڕین و یەکیان بە ویتری گوت:
- خوشکێ گیان! زین و لغاوی ئەم ئەسپە تەلسم کراوە. ئەگەر موقەدەم پێ دە ڕکێفێ بنێ دەسووتێ و دەبێتە مشکێ. بەڵام ئەگەر محەممەد ئەسپەکە بکوژێ، موقەدەم نەجاتی دەبێ. بەڵام ئەگەر محەممەد موقەدەم ئاگادار بکا، خۆی دەبێتە بەرد.
وەزیر لێیان وەنیزیک کەوت و سڵاوی کرد. موقەدەم بانگی کرد: چەند ئەسپێکی جوانە با تەماشای بکەم. وەزیر ئەسپی بردە نیزیک، بەڵام محەممەد شیری هەڵکێشا و ئەسبەکەی کوشت.
وەزیر هاواری کرد: کوڕم ئەو ئەسپەت بۆ کوشت؟ ئێستا پاشا من دەکوژێ.
محەممەد جوابی داوە:« کوشتم چ دەبێ بلا ببێ.»
موقەدەم چوە دەفیکرەوە و بە خۆی گوت:« محەممەد بۆ چی ئەو کارانە دەکات؟»
خۆی هەوڵی داوە ئەم ژنەم وەگیر کەوێ، پاشان بورجەکەی وێران کرد، ئاوی کانیەکەی قوڕاوی کرد، دارەکەی بڕی و ئێستاش ئەسپەکەی کوشت. ئاخر نرخی ئەم ئەسپە سەت تمەن بوو. باشە، بگەینەوە ماڵێ تۆڵەی دەکەمەوە.
تا ئەوان گەیشتنە کۆشک، پاشا لە ئیشقی دووری خۆی پێ ڕانەگیرا و مرد. موقەدەم دیتی کە بابی مردوە قینی محەممەدی لە بیر بردەوە. بابی موقەدەمیان ناشت و خێراتیان دا بە خەڵک. ئەو شەوە محممەد لە خەودا دیتی کە سێ کۆتر لە بان سەری دەفڕن. یەکیان دەیگوت:« خوشکێ! ئەگەر محەممەد لەخەو دایە دەبێ وەخەبەر بێت و ئەگەر بەخەبەرە گوێ بداتە قسەکانمان. عەزیایەک بۆ ئەم لایە دێت و دەیەوێ موقەدەم بخوا. محممەد لە جێ هەستا و شیری هەڵکێشا و لە ماڵێ وەدەر کەوت. دیتی عەزیا نیزیک دەبێتەوە. محەممەد لە پەنا دەروازەی کۆشک دانیشت. عەزیای دیت و هاواری کرد:
- لە سەر ڕێگای من دوور کەوە.
محەممەد پرسی: « لێرە چدەکەی؟
- دەبێ موقەدەمی بکوژم.

- ناهێڵم

- کە وایە خۆت دەکوژم. محەممەد بە هەر تک دەستان شیری گرت و دەزاری عەزیای ڕاکرد بە جۆرێ کە نووکی شیر کەیشتە کلکی عەزیا و دوو لەتی کرد. پاشان محەممەد بە شیری خوێناوی لە کۆشک وەژوور کەوت. لەو دەمەدا موقەدەم بەخەبەر بوو.- - ئەی مەلعون وات لێهاتوە کە دەتەوێ من و خێزانم بکوژی.

- من قەستی کوشتنی تۆم نیە.

- قەستت نیە؟ ئەم قسانە چیە؟ ئەدی بە شەو دەست بە شیرلێرە چدەکەی؟ بورجت وێران کرد، هیچم نە کوت. کانیت قوڕاو کرد، دارت بڕی، بێدەنگ بووم. ئەسپی سەت تمەنیت کوشت دیسان بێدەنگ بووم. بلێ بزانم بەو شەوە لێرە چدەکەی؟

محەممەد گوتی:« ئەی موقەدەم گوێ بدەیە. ئەگەر هەموو شتت بۆ باس بکەم، ئیتر من نابینیەوە.

- درۆ مەکە، نامەوێ هەر بتبینم.

- باشە ئێستا هەموو شت ئاشکرا دەکەم. ئەو بورجە تەلەسم کرا بوو، ئەگەر لە پەنای دانیشتبان دەسووتان و دەبوون بە خۆڵە مێش. کاتێ محەممەد ئەوەی کوت، تا ئەژنۆیان بوو بە بەرد.

موقەدەم بانگی کرد:« باوەڕم کرد. ئیتر باسی مەکە. مەیڵێ»

محەممەد گوتی: نا، ئیتر دەبێ هەموو شت بڵێم. ئەو کانیەی ئاوەکەم قوڕاوی کرد و دارەکەی بڕیم تەلەسم کرا بوون. ئەگەر لە ژێری دانیشتبان، دەبوون بە گورگ. بەڵام ئەسپم بۆ کوشت.؟ بابت ئاشقی ژنەکەت ببوو. زین و لغاوی ئەسپەکەی تەلەسم کرد بوون، ئەگەر تۆ سوار ی بای، دە سوتای، بۆیە کوشتم.

کە قسەی محەممەد گەیشتە ئێرە، تا سنگی بوو بەرد. پاشان گوتی:« بەڵام لە کاری ئەمشۆی من، سبەی ئاگادار دەبیت.

محەممەد ئەوەی گوت و سەر تاپێ بوو بەرد.

موقەدەم و ژنەکەی تازیەیان داگرت و دەگریان. کاتێ بوو بە ڕۆژ، دیتیان عەزیا

لە دەرکی کۆشک کوژراوە و دوو لەت بوە..
موقەدەم چۆوە ژوور و لە سەر و سنگی خۆی دەدا و دەگریا و دەیگوت:« ئەو لە بابم لە من نیزیکتر بوو، بۆچی وامکرد. نەمزانیبوو بابم ئاشقی ژنەکەم ببوو، دەویست بمکوژێ. موقەدەم شەو ورۆژ دەگریا. ئاخرەکەی نیانتوانی لەم خانوەدا بمێننەوە، چوونە خانوێکی تر. ئەو خانوەی موقەدەم- یان بە فەرش و شتەوە قفڵ دا هەر کاتێ ویستبایان دەرگایان دەکردەوە و دەچوون چاویان بە محەمەد دەکەوت و دەگریان.
بەڵێ، ژنی موقەدەم کوڕێکی بوو. شەوێک لە خەودا دیتی سێ کۆتر بۆ لای وی دەفڕن. یەک لە کۆترەکان بە ویدی دەگوت:
- خوشکێ، ئەگەر موقەدەم و ژنەکەی کوڕی خۆیان بۆ محەمەد بکەنە قوربانی، محەمەد زیندوو دەبێتەوە. ئەگەر ژنی موقەدەم خەونی خۆی بۆ کەسێک بگێڕێتەوە، دەبێتە بەرد.
بەیانی ژن وەخەبەر هات و چوە دە فیکرەوە« کە چۆن دەتوانم خەونەکەم بۆ مێردەکەم بگێڕمەوە و نە بم بە بەرد. موقەدەم وەخەبەر هات، دەست و چاوی شوشت. خێزانی پێی گوت:
- ئەی موقەدەم! بۆ محەمەد زۆر نارەحەتم. ئەو فەقیرە لە ڕێگای ئێمەدا چەندە زەحمەتی کێشا. وەرە کورەکەمان لە پای ئەودا بکەینە قوربانی. بەڵکوو زیندوو بێتەوە.
موقەدەم گوتی:« بەڵێ، بەڵێ، دەزانم زیندوو دەبێتەوە. هەر تکیان کوڕەکەیان گرت و لە ژێر پێی محەمەد کردیانە قوربانی.
محەمەد چاوی هەڵێنان و گوتی :« لە خەوێکی خۆش دابووم، بۆچی وەخەبەرتان هێنام
موقەدەم گوتی :« ڕاستی عەجەب خەونێک. ئاخر تۆ ببوویە بەرد. من کوڕەکەم کردە قوربانی، تۆ زیندوو بوویەوە.
جارێکی دیکە سێ کۆتر لە بان سەری محەمەد سوڕانەوە و یەکیان گوتی:« خوشکم! کاتێ ئێمە لێرە فڕین بەرێکمان دەکەوێ، ئەگەر محەمەد ئەو پەڕە بە

ملی کوڕی موقەدەم دا بکێشێ، کوڕەکە زیندوو دەبێتەوە.

کۆترەکان فڕین. محەممەد پەڕەکەی هەڵگرتەوە و بە سەر برینی ملی کوڕەکەی داهێنا و کوڕ زیندوو بۆوە.

موقەدەم بە بۆنەی زیندوو بوونەوەی محەممەد و کوڕەکەی مەجلیسێکی شایی و خۆشی ساز کرد و حەوت شەو و ڕۆژ بەزم زەماوەند بوو، هەموویان بە خۆشی و شادی ژیان.

# کوڕی ماسیگر ٥٩

ماسیگرێک هه بوو له قەراخ دەریا تۆڕی داویشت و ماسی دەگرت. ڕۆژێ له گەڵ کوڕەکەی خەریکی ماسیگرتن بوو، دیتی ماسییەکی گەورە بە تۆڕەکەیەوە بوە. بە دوو کەس نەیانتوانی بیهێننە دەرێ. بە کوڕەکەی گوت:
– تۆڕەکەی توند بگرە تا من دەچم چەند کەسان دێنم یارمەتیمان بکەن. باب ڕۆی. کوڕەکە فیکری کردەوە کە « بابم هیچ خێرێکی لە ماسیگرتن نەدیوە، با ئەوەش نەبێ! » فیکر کردنەوە و ماسی بەرەڵا کردنی لە دەریادا یەک بوو.
باب گەڕاوە دیتی کوڕ ماسی بەرەڵا کردوە. پرسی: « بۆچی بەرت داوە ؟
– دەستم تاقەتی نە بوو، نەمتوانی تۆڕەکە ڕابگرم و ماسی چوە دەرێ.
باب توڕە بوو کوڕەکەی دەر کرد و گوتی :« بڕۆ وەدوای کاری خۆت کەوە. هیچ کارم بە تۆ نیە.»
عەلی( ناوی کوڕەکە بوو) ڕۆی، ڕۆی تا گەیشتە شارێک و دیتی خەڵک لە کوچە دانیشتوون. یەک بانگی کرد:
– لە چی دەگەڕێی ؟
عەلی گوتی:« لە کار دەگەڕێم.»
– من کرێکارم گەرەکە. مەرجی منیش وایە کە چل ڕۆژ بە کرێت دەگرم. لەو چل ڕۆژە ، ڕۆژێک بۆ من کار بکە و سی و نۆ ڕۆژ بۆ خۆت بگەڕێ. سەت تمەنیشت دەدەمێ.
عەلی ڕازی بوو. کابرا عەلی بردە ماڵ. سی و نۆ ڕۆژ گەڕا و کەیفی کرد. ڕۆژی سی و نۆیەم خاوەن ماڵ گایەکی کوشتەوە و کەوڵی کرد و لە پێستەکەی

کیسەیەکی دروست کرد . ڕۆژی دوایی ئەو کیسە و چەند خورجێنی هەڵگرت و لە حوشترێکی بار کردن و دەگەڵ عەلی لە شار وەدەر کەوت. ڕۆیشتن تا گەیشتنە بەردێکی بەرز.

ئەرباب بە عەلی گوت: « بچۆ نێو کیسەکە و تەماشای بکە کونی تێدا نەبێ.»

عەلی چوە نێو کیسە. کابرا گورج زاری کیسەی توند بەست و لەسەر لوتکەی بەردەکەی دانا و خۆی شاردەوە.

هێندەی پێنەچوو سیمرغ هاتە وێ، کیسەی هەڵگرت و وە حەوا کەوت. لە سەر لوتکەی بەردێک نیشت و کیسەی دڕاند. لە نێو کیسە زەلامێک هاتە دەر. سیمرغ کاری پێ نە دا فڕی و ڕۆی. عەلی هەستا تەماشای خوارێی کرد دیتی ئەربابەکەی لە بن بەردەکە ڕاوەستاوە. عەلی هاواری کرد:

– ئەو کارە چ بوو لە گەڵ منت کرد؟. کابرا بە دەنگی بەرز گوتی:

– لەو بەردانەی ژێر لاقت هەر چەندی دەتوانی بیان ڕێژە خوار تا ڕێگای گەڕانەوەت پێ نیشان بدەم.

عەلی بەردەکانی خستە خوار کە هەموو ئەڵماس بوون. کابرا خورجێنی لێ پڕ کرد و بانگی کرد:« لەوێوە بۆ هیچ شوێنێ ڕێگا نیە. یا لەوێ بمێنە و لە برسان بمرە تا ئێسکانت دەڕزن، یا خۆت دە بەحرێ باوێ ماسی بتخۆن. ئەوەی گوت وڕۆی.

عەلی فیکری کردەوە چبکا. ئاخری بڕیاری دا کە خۆ دە دەریا بوێ. لە سەر بەردەکەوە خۆی فڕێدا نێو دەریا. ئەو ماسییەی کە ڕۆژێ ئازادی کرد بو، دیتی ، گرتیەوە و بردیە قەراغ دەریا. عەلی دەستی کرد بە گەڕان و سووڕانەوە بە شاراندا.

ساڵێک تێپەڕی. جارێکی تر ڕێی کەوتە ئەو شارە کە لە کن کابرا کاری دەکرد. دووبارە هەمان کەس بانگی کرد:

– لە چی دەگەڕێی؟

عەلی گوتی– لە کار دەگەڕێم.

– من کرێکارم دەوێ، عەلی بە هەمان مەرجی پێشوو بوو بە کرێگرتەی. سی و

نۆ ڕۆژ تێپەڕی. کابرا جارێکی دیکە گایەکی کوشتەوە، کەوڵی کرد و لە پێستەکەی کیسەیەکی دروست کرد لە گەڵ چەند خورجێن لە حوشترێکی بار کرد و دەگەڵ عەلی لە شار  وەدەر کەوتن بۆ کن هەمان بەرد.
ئەرباب بە عەلی گوت:« بچۆ نێو کیسە بزانە کون نیە.
عەلی گوتی : « ئەرباب نازانم چبکەم. تۆ خۆت جارێک بچۆ نااوی تا من فێر بم. کابرا سەری بردە نێو کیسە، عەلی قاچی گرت و پاڵی پێوە ناو چوە نێو کیسە. توند زاری کیسەی گرت و خۆی شاردەوە. سیمرغ جارێکی دیکەش هات و کیسەی هەڵگرت و بردی لە سەر لوتکەی بەردی دانا و کونی کرد، دیتی زەلامێک لە کیسە هاتە دەر. سیمرغ فڕی و ڕۆی. ئەرباب لە کیسە هاتە دەر و لە سەر لوتکەوە تەماشای خوارێی کرد، دیتی عەلی لە بن بەردەکە وێستاوە. بانگی کرد و گوتی:« ئەو کارە چ بوو کردت.؟»
عەلی وەڵامی داوە گوتی:« من هەمان کەسم کە پارەکە لە سەر ئەو بەردە بەرەڵات کردم. ئێستا چەندی پێت دەکرێ لەو بەردانە بەردەوە خوارێ، تا پێت بڵێم بە کوێدا دەتوانی بێیە خوار.»
کابرا دەستی کرد بە  خزاندنی بەردەکان، کاتێ عەلی خورجێنی پڕ کرد، بە خاوەن کاری پێشووی گوت:
– ئێستا نامە بۆ ژنەکەت بنووسە، کچەکەت بدە بە من. دەچم دەی گوێزمەوە و پاشان دێمەوە دەت هێنمە خوارێ
– تۆ بمهێنە خوار تا خۆم کیژەکەمت بدەمێ.
– نا ، دەبێشدا چیم پێ گوتی دەبێ وابکەی. ئەرباب نامەی نووسی و هاویشتیە خوار. عەلی نامەی دەگیرفانێ نا و بانگی کرد:« ئێستا یا لە وێ دەمری و ئێسکەکانت  دەڕزن، یا لە دەریا دا ماسی دەتخۆن.» عەلی چوە کن ژنی ئەرباب و نامەکەی دایە. جێژنی شایی بوکیان ساز کرد و عەلی بوو بە خاوەنی سەروت و سامانی ئەربابی.
زۆری پێنەچوو کە لە سەخاوەت و دەست واڵاییدا لە شار ناو بانگی دەر کرد. ڕۆژێک دەروێشێک میوانی بوو. بەر لە ڕۆیشتنی گوتی:« من ژنێک دەناسم لە تۆ

دەست واڵا تر و جوامێر ترە.
عەلی پرسی: لە چ بارێکەوە لە من جوامێر ترە.؟
– بۆ هەر میوانێک لە قاپی ئاڵتوندا خواردن دادەنێ و پاشان قاپەکەش دەدا بە میوان.
عەلی کە ئەو قسەی بیست کورج باری سەفەری ئامادە کرد و بۆ دیتنەوەی ئەو ژنە کەوتە رێ. دیتیەوە و میوانی بوو. عەلی چەند رۆژ لە ماڵی ئەو ژنە بردیە سەر. رۆژێ چەند جار خواردنیان هێنا و قاپە ئاڵتونەکانیان لە وەتاغی ئەو کۆ کردەوە.
رۆژێ کە ژنی خاوەن ماڵ خۆی خواردنی بۆ هێنا، عەلی گوتی:« هەتا پێم نەڵێی ئەو هەموو قاپە ئاڵتونانە بۆ لە وەتاغی من کۆ دەکەیەوە، دەست لە خواردن نادەم.
ژن گوتی: ئەوانە ماڵی تۆن و لە گەڵ خۆتیان بەرە. عەلی گوتی:« من بۆ قاپی ئاڵتون نە هاتوومە ماڵی تۆ. بەڵکوو دەمەوێ مێرد بە من بکەی.»
– بە یەک مەرج ئامادەم شوت پێبکەم.
– مەرجەکەت بێژە پێم،
– لە شاری بەغدا وەستایەکی زین درو و ئاخوندێک دەژین. زین درو زین دروست دەکا و پاشان چەکوچ هەڵدەگرێ و پەرت و بڵاوی دەکا. بەڵام ئاخوند لە بەیانیەوە تا رۆژ ئاوا لە حەسارێ دانیشتوە و تەماشای دارێک دەکا کە لەوێ شین بوە، دەگری. برۆ روونی کەوە کە ئەوانە بۆ وادەکەن. تا پاشان شوت پێ بکەم.
عەلی رووی کردە بەغدا و زین درووی دیتەوە و چوە ماڵی. خاوەن ماڵ میوانداری کرد و خواردنی بۆ هێنا. عەلی گوتی:
– تا داستانی خۆتم بۆ باس نەکەی، دەست لە خواردن نادەم.
– تۆ خەریکی نانخواردنی خۆت بە و من داستانی خۆمت بۆ دەگێڕمەوە:
– بابم مرد، زۆر دەوڵەمەند بوو. تەواوی هاو تەمەنەکانم لە بەغدا دۆستی من بوون، چونکە گیرفانم پڕ بوو، پاردیەکی زۆرم بۆ وان خەرج دەکرد. بابم بەر لە

مردنی بە دایکمی گوت:
- کاتێکی من مردم کورەکەم تەواوی پارەکان بۆ دۆستانی خەرج دەکا. گۆزەیەک سکەی زێڕ هەڵگرە و لێی بشارەوە. کاتێ کوڕەکەمان بێ پارە بوو، کەم کەم لە گۆزە بێنە دەر و بۆی خەرج کە. بەڵام بە مەرجێک بێکار دانەنیشێ و خۆی بە کارێکەوە خەریک بکات.- هەر کارێک بێ قەی ناکا» دایکم بە گوێرەی قسەی بام بزووتەوە. بابم مرد. هێندەی پێ نەچوو کە من سامانەکەم بە با دادا. وای لێهات کە من و دایکم بۆ نانی شەو موحتاج بووین. دایکم بە منی گوت:« تۆ دۆستی زۆرت هەن، وەرە با بچینە ماڵی وان تا نانێکمان بدەنێ.» کەوتینە رێ، چووینە هەر شوێنێ گوتیان: « رەفیقت لە ماڵ نیە.» بەم جۆرە لە گەڵ دایکم چل ماڵمان بە سەر کردەوە و هاتینەوە ماڵێ. دایکم بە منی گوت:« بابت دۆستێکی هەبوو، با بچینە وێ.»
چووین. ئەو گورج ئێمەی وەر گرت. خواردنی بۆ هێناین، خواردمان و تێر بووین. چەند رۆژان لە وێ بووین. رۆژێک دایکم پێی گوتم:« بزانە ئەو هەموو پارەت بۆ دۆستانت خەرج کرد و هیچیان تۆیان رێ نەدا. بەڵام ئەو دۆستەی بابت چەند رۆژە خواردنمان دەداتێ و ئێمەی ڕاگرتوە. بابت لە سەرە مەرگدا بە منی گوتوە کە هێندێ پارە بشارمەوە. ئەو پارە دەدەم بە تۆ، بەو مەرجە کە هەمیشە خەریکی کارێک بی» ئێستا من خەریکی فێر بوونی زین درونم. بەڵام هێشتا فێر نەبووم. ئەوەندە چەرمەی هەمە کەمە. بۆیە زین دروست دەکەم، خەرای دەکەم و دوو بارە سازی دەکەمەوە.
پاشان عەلی وەدوای ئاخوند کەوت تا بزانێ بۆ چی سەیری ئەو دارە دەکا و دەگری. ئاخوندی دیتەوە.
ئاخوند گوتی:« من دوو ژنم هەبوون یەکیان لە پەریان بوو. بەر لەوەی بیهێنمە ماڵێ، مار بوو، هەر جارەی لە پێستی خۆی دەهاتە دەر، دەبوو بە پەری. هێندێ جاریش دەبوو بە دایک. ئەو دوو کوڕی بوون. بەڵام ژنی دووەم ئێرەیی پێ دەبرد. ڕۆژێک پێستی ماری وی سوتاند. ژنە پەری سای من بوو بە کۆتر و فڕی. دوو کوڕەکانی لە گەڵ من مانەوە. پاش ماوەیەک وەک کۆتر گەڕایەوە و لە

سەر ئەم دارە نیشت کە دەیبینی. کورەکان ئەویان دەبینی، ئەوانیش بوون بە کۆتر و لە گەڵ دایکیان فڕین. هەموو ڕۆژێ لە گەڵ دایکیان دەهاتن لە سەر ئەم دارە دەنیشتن و لەم لقە دەچوونە سەر ئەو لقە. من تەماشام دەکردن و بە بینینیان دڵخۆش دەبووم. بەڵام ئێستا ماوەیەکە ئیتر نایەنەوە ئەم لایە و لە سەر ئەم دارە نا نیشن. من تەماشای ئەو دارە دەکەم و دەگریم و فیکر دەکەمەوە کە بەڵکو لە پڕ پەیدا ببنەوە.

عەلی هاتەوە کن ئەو ژنە و داستانی لە نوکەوە بۆ گێڕاوە. ژنی خاوەن ماڵ گوتی:

- باشە، ئێستا داستانی من گوێ بدەیە. سەر دەمێکی کە هێشتا من کچ بووم لە گوندی خۆم بارم کرد و هاتمە ئەم دۆڵە.لێرە خانوێکی بچوک هەبوو ژن و مێردێکی پیری تێدا دەژیان. ئەو ژن و مێردە منیان لە دایک و بابم کڕی. من لای ئەوان مامەوە و لەو خانوەدا دەژیام. کاتێ گەورە بووم ئەو ژن و پیاوە بە زۆر منیان دا بە دێوێکی جەنگەڵی. من تەنیا شەوێک لە گەڵ ئەو بووم. ڕۆژی دوایی بەیانی پیرە مێرد دێوی کوشت. من پاش نۆ مانگ پارچە گۆشتێکم لێ بوو. پیرێژن ئەو گۆشتەی هەڵگرت و وردی کرد و لەسەر ئاگری دانا تا چەوراییەکەی دەر چوو. پاشان کەمێکی لەو چەوریە دە قاپەکان هەڵسوو، قاپەکان بوون بە زێڕ. پاش مردن هەموویان دا بە من و منیش ئەوەتا هەموان بەم و بەو دەبەخشم.

عەلی ژنەکەی بردە ماڵ شاییان کرد و هەموو بە خێر و خۆشی ژیانیان بەسەر برد.

# پاشا و وەزیر ٦٠

هە بوو، نە بوو، جگە لە خوا هیچ کەس نە بوو. پیرێژنێک بوو ،کوڕێکی هەبوو. کوڕ دەچوە چیا و داری کۆدەکردنەوە دەیهێنا لە بازار دەیفرۆشت و نان و قەند و چای دەکڕی و پێکەوە دەژیان.

ڕۆژێ بە دایکی گوت:« دایە، بچۆ کن پاشا وپێی بڵێ کیژەکەی بدا بەمن.

دایک گوتی :« ڕۆڵە ئەم قسە چیە. ئێمە فەقیرین، ئە و کچی پاشایە. پاشا هەر گیز کچ نادا بە تۆ»

– تۆ بڕۆ داوای لێبکە. کارت بەو شتانە نە دابێ.

دایک گوتی: « باشە، من دەچم.» بەلام نەچوو. کوڕی فریو دابوو. ئێوارە کوڕەکە لە سەحرا گەڕاوە و پرسی:

– باشە، دایە. چبوو، چووی ؟

– نا، کوڕم نەچووم.

– بۆ چی نە چووی . بڕۆ بڕۆ. پیرێژن بە ترس و لەرزەوە کەوتە ڕێ و لە دەرگای کۆشکی پاشای دا. دەرگایان لێ کردەوە و پرسیان: چکارێکت هەیە.؟

– لەگەڵ خودی پاشا کارم هەیە. پیرێژن چوە کن پاشا. پاشا لێی پرسی؟» دایە گیان کارت چیە؟

– پاشا سلامەت بێ! هاتووم تکات لێبکەم کیژەکەت بدەی بە کوڕی من. ئێستا هەرچی دەکەی بیکە. دەمکوژی یا دەمبەخشی.

– کوڕەکەت چکارەیە و کاری چیە ؟

– هیچ پیشەیەک نازانێ. دەچێتە چیا داران کۆ دەکاتەوە و دەیان فرۆشێ. بەو

پارەیە بەرێدەچین.
- کە وابوو چۆن هاتوویە خوازبێنی کیژی من.؟
پیرێژن گوتی:« قوربان، پێی نەوەستام. چەند ڕۆژ فریوم دا و گوتم: دەچم، نە هاتم، بەلام لە ئاخردا ناچار بووم.»
- لە شاردا پیاوێکی حەکیم و ساحیر دەژی. بە کوڕەکەت بێژە بچێتە کن وی، سیحر و حیکمەت فێر بێ و پاشان بێت فێری منی بکات تا کیژەکەمی بدەمێ.
پیرێژن چوو قسەکانی پاشای بۆ کوڕەکەی گێڕاوە. ڕۆژی دوایی کوڕ خوا حافیزی لە دایکی کرد و کەوتە ڕێ تا گەیشتە ئەو شارە. بە پرس و خواس ماڵی کابرای حەکیم و ساحیری دیتەوە. چوە ماڵەکە و کابرا لە ماڵ نە بوو. کیژی کابرای ساحیر دەرگای لێکردەوە و بە دیتنی ئاشقی بو. پرسی: « ئەی لاو بۆ هاتوویە ئێرە.؟»
- بیستوومە باوکت سیحر و حیکمەت دەزانێ، هاتووم لێی فێر بم. کیژە بردیە حەسار و بە خێر هاتنی کرد.
لە نێوە ڕاستی وەتاغی بابی قولکەیەک هەلکەنرا بوو. هێندێ کێرد و شیر و نێزە یان لێ دانا بوو نوکیشیان دە لای سەروو دابوو. سەری قولکەکەیان بە لبادێک داپۆشیبوو. هەر کەس لە سەری دادەنیشت دە قولکێ دەکەوت. کێرد وشیر ونێزە برینداریان دەکرد و دەمرد. کیژەکە کێرد و شیرەکانی هێنا دەر وپەتۆیەکی لە گەڵ چەند باڵنج لە وێ دانا.
بابی هاتەوە. لاوەکە سلاوی لێکرد. کابرا پرسی: « لە چی دەگەڕێی؟ چیت دەوێ ؟
- هاتووم لە تۆ سیحر و حیکمەت فێر بم.
کابرای حەکیم گوتی: وەرە بچینە ماڵ و دەرسی هەوڵت پێ بلێم. برۆ لەسەر ئەو لبادە دانیشە. کە چوو دانیشت، دە قولکێ کەوت. حەکیم بە کیژەکەی گوت: « بە نۆکەران بێژە مەیتەکەی بەرن بینێژن.» کیژ گوتی:: باشە.
کاتێ بابی ڕۆی، کوڕەکەی لە قولکێ هێنا دەر و لە سارداو شاردیەوە، هەموو جار کە حەکیم لە ماڵ وەدەر دەکەوت، کیژەکە دەچوە سارداو وسیحر و

حیکمەتی فێر دەکرد تا هەموو شتێک فێر بوو. کیژەکە گوتی:« ئێستا دەبێ بمهێنی.»

: چۆن دەتوانم بتهێنم.؟ من لە بەر کیژی پاشا هاتووم فێری ئەم بەزمە بم.

– قەی ناکا. ئەویش بێنە و منیش بێنە. من ئاشقی تۆ بووم. کوڕەکە ڕازی بوو چۆوە ماڵ و بە دایکی گوت:

– من دێمە سەر شکڵی ئەسپێک و تۆ بەرە بمفرۆشە. بەڵام ئاگات لێبێت، هەوسارەکەم نەفرۆشی. هەر چەندی بتدەنێ، هەوسارەکەی نەدەی. ئەگەر ئەوی بفرۆشی، ئیتر نامبینیەوە.

دایک ئەسپی بردە بازار و فرۆشتی، هەوسارەکەی ڕاگرت و گەڕاوە. کوڕەکەشی بە دوایدا هاتەوە و گوتی:

– ئێستا دەێمە سەر شکڵی حوشتر. بەرە بمفرۆشە. بەڵام هەوسارەکە ڕابگرە و نەیفرۆشی. دایک حوشتری فرۆشت و ئەمجاریش کوڕەکەی بە دوایدا هاتەوە و گوتی:

– ئێستا دێمە سەر شکڵی هێستر و بەرە لە بازار بمفرۆشە. بە لام زۆر وریا بە هەوسارەکە نەفرۆشی!

پیرێژن هێستری بردە بازار کە بیفرۆشێ. حەکیمی ساحیر زانی کە ئەوە هێسترێکی ئاسایی نیە و لە دڵدا گوتی:« بێگومان حیکمەت و سیحر لە من فێر بوە»

بە پیرێژنێی گوت: « هەوسارەکەشم پێ بفرۆشە.»

– نایفرۆشم.

– سەت تمەنت دەدەمێ!

– نایدەم!

– دوو سەت تمەنت دەدەمێ!

– نایدەم. ئاخرەکەی ئەوەندە تەماعی وەبەر پیرێژنێ نا، ڕازی کرد بە هەوسارەوە پێی بفرۆشێ.

حەکیمی ساحیر سواری هێستر بوو کە گەیشتەوە ماڵێ بە کیژەکەی گوت:«

کێردێکی بێنە تا سەری ئەم هێسترە ببڕم»
کیژەکە چوو کێردی شاردەوە و گوتی: «کێردم نە دیتەوە.»
– بچوو بیور بێنە.! کیژەکە بیوریشی شاردەوە و هاواری کرد: «هەر چی کردم بیورم نە دیتەوە»
– باشە. شیرەکە بێنە. کچ شیرەکەشی شاردەوە و گوتی: «نایبینمەوە..»
باب بە سەریدا گوڕاندی و گوتی: «ئەی مەلعون، تەواوی ئەم کەڵەکانە لە ژێر سەری تۆ دان.»
پاشان هێسترەکەی لە دارێ بەست و خۆی چوو کە کێرد بێنێ. کیژەکە هەوساری لە سەر هێستر دارنی و هاویشتیە سەر بانی. هەوسار بوو بە کۆترێک و لە شەقەی باڵانیدا و ڕۆیشت. خۆشی هاتە سەر شکڵی باز و بە دوایدا فڕی.
کۆتر بە کۆشکی پاشادا فڕی و بوو بە دەستە گوڵێک و لە وەتاغیێدا کەوت. پاشا گوڵەکەی هەڵگرت و بۆنی کرد و گوتی:
– چەندە گوڵێکی بۆن خۆشە.
بەڵام حەکیمی ساحیر هاتە سەر شکڵی دەروێشێک و هاتە کۆشکی پاشا و دوعای خوێند. پاشا سکەیەکی زێری دایە. دەروێش وەری نەگرت و پێی داگرت و گوتی: «لەو دەسکە گوڵە بەدەر هیچی دیکەم ناوێ.»
– دەتەوێ چیان لێبکەی.؟ ئەم دەسکە گوڵە خوا بۆی ناردووم.!
– چ قەیدییە. من تەنیا ئەم گوڵانەم گەرەکە و هیچیتر.
پاشا توڕە بوو، دەسکە گوڵی بۆ دەروێش هاویشت. دەروێش تا ویستی دەسکە گوڵ هەڵبگرێ، گوڵەکان بوونە هەرزن و بە زەویدا بڵاو بوون. دەنکێک چوە نێو کەوشی پاشا. دەروێش هاتە سەر شکڵی مامرێک بە جوجەڵەوە. دەستیکرد بە هەڵگرتنەوەی هەرزن. بەڵام ئەو دەنکەی کەوتبوە نێو کەوشی پاشا، بوو بە ڕێوی و مریشک و جوجکەی خواردن.
پاشا لە بینینی ئەم روو داوەیە واقی وڕ ما کە لە پڕ ڕێوی بوو بە لاوێک و گوتی:

– ئەی پاشا من هەر ئەو کەسەم کە داوای کیژەکەتم کرد بوو. پاشا گوتی : « ئەم سیحرانە فێری منیش بکە. تا کیژەکەمت بدەمێ. کورەکە ئەوانەی فێری پاشا کرد. رۆژێک پاشا و وەزیر چوونە گەرانێ. وەزیر پێشنیاری کرد کە :

– ئەی قیبلەی عالەم وەرە با بێینە سەر شکڵی ئاسک. پاشا رازی بوو، هەر تکیان بوون بە ئاسک. وەزیر گورج هاتە سەر شکڵی پاشا و بۆ کۆشک گەراوە و رایگەیاند کە: « پاشا مرد!»

پاشا حەوت ژنی هەبوون وەزیر لە گەڵ شەشیان نوست. ژنی حەوتەمین زانی کە ئەم ماستە بێ موو نیە. نەیویست لە گەڵی بنوێ. وەزیر کەوتە فیکرەوە کە چبکا تا ئەو بە پاشا بزانێ. چوو لە سەحرا داوی داناوە و گوتی:« رەنگە حەیوانێک بگرم و بۆی بە دیاری بەرم و لە گەڵم رێک کەوێ.

داوی هاویشت و چۆوە ماڵێ. ئەو شەوە کەوی زۆر بە داوێوە بوون پاشای راستە قینەش هاتە سەر شکڵی کەو و ئەویش پێوە بوو. وەزیر بەیانی هەستا و چوو بزانێ چی بە داوێوە بوە. پاشا کە دیتی وەزیر دێت بە کەوەکانی تری گوت:

– وەرن هەموو لە سەر پشت لاق دە حەوا بکەین، تا پێی وابێ مردووین و ئێمە لە داو بکاتەوە.

وەزیر هاتە پەنا داوەکە و دیتی کەوەکان مردون. یەک یەک لاقی گرتن و فرێی دان. کە ویستی ئەو کەوە کە پاشای راستی بوو بگرێ، لاقی راوەشاند. وەزیر کەیف خۆش بوو گوتی:« سوپاس بۆ خوا کە ئەمەیان زیندوە، بۆ ژنەکەمی دەبەمەوە.»

کەوی بردەوە ماڵ و لە قەفەسێکی نا و قەفەسی لە وەتاغ هەڵاوەسی. لە دڵدا گوتی:« با بخوێنێ و ژنم خۆشییەکی هەبێ. »

کاتێ وەزیر وەدەر کەوت. کەوەکە وەزمان هات و لە ژنی پاشای پرسی:

– ئەو پیاوە مێردی تۆیە یان نا.؟

– نا، مێردی من نیە. نازانم چبکەم.؟

– داوای لێبکە ببێتە مریشکێک کە جوجەڵە دەوریاندا بێت. من دەبمە رێوی و

هەموان دەخۆم. پاشان گوتی: من مێردی ڕاستە قینەی تۆم. ژنەکە ڕازی بوو.
وەزیر هاتەوە، ژنی پاشا دەستی کرد بە پێکەنین و ناز و قسەی خۆش. وەزیر فرە شاد بوو و بە خۆی گوت:« چەندە میهرەبان بوە. لە ژنی پاشای پرسی:« چۆنە وا بە کەیف و شادی.؟»
– باشە تۆ ئەم کەوەت هێناوەتە ماڵ. بۆیە وا شادم. تۆ سیحر و فێڵی زۆر فێر بووی، وا نیە ؟
– بەڵێ وایە. ئێستا دەتەوێ بێمە سەر شکڵی چێ، دێم
– دەمەوێ بێیە سەر شکڵی مریشکێک جوجەڵە دەوریان گرتبی.
وەزیر گورج هاتە سەر شکڵی مامر و جوجەڵە دەوریان دا. کەویش بوو بە ڕێوی و هەمووی خواردن. پاشان هاتەوە سەر شکڵی ئەسڵی خۆی و بۆوە بە پاشا.
لەو کاتەدا ئەو لاوەی داوای کیژی پاشای کردبوو ، ناردیە کن پاشا کە بەڵێنی خۆی بەرێتە سەر و کیژەکەم بداتێ.
پاشا حەوت شەو و ڕۆژ شایی و زەماوەندی بۆ ساز کرد و کچەکەی دایە. لاو کیژی پاشای بردە ماڵ و چوو کچە ساحیرەکەشی هێنا و بە ئارەزووی خۆیان گەیشتن. هیوادارم ئێوەش پێبگەن.

# هیند باد ٦١

هیند باد شوان بوو. حەیوانەکانی خەڵکی گوندی دەلەوەڕاند. خەڵک نانیان دەدایە و نانەکانی دە دەریا داویشت. ڕۆژێ بە خۆی گوت:« شوانیم زۆر کرد و بەسمە، نامەوێ ئیتر، دەچم لە مەزرایە کار دەکەم.» شرە و بڕەی خۆی کۆ کردەوە و لە ماڵێ وەدەر کەوت. لە ڕێگا تووشی دوو کەسی دیکە بوو، ئەوانیش گوتیان :« ئێمەش دەچین کار پەیدا بکەین.»

ئەو سێ کەسە ڕێکەوتن. لە ڕێگا کردییە باو وباران، ڕۆیشتن تا گەیشتنە ئەشکەوتێک، لەوێ ئاگریان کردەوە و لە پەنا ئاگر دانیشتن. لای ڕۆژ ئاوا شوانێک مەڕەکەی هێنا کن ئاگرەکە. لەو مێگەلە دا جگە لە بزن حەیوانی دیکەی تێدا نەبوو. شوانەکە ناوی « تەپە تاش» بوو. تەنیا یەکچاوی هەبوو، ئەویش لە تەپڵی سەریدا بوو. ئەو سێ کەسە چاویان دە شوانەکە بڕیبوو.

شوان دیزەیەکی گەورەی هێنا، بزنەکانی دۆشی . نانێکی گەورەی تێکوشی و هەمووی یەک جێ خوارد. پاشان ئاسنێکی گەورەی دە ئاگری نا، سوور بۆوە. تەپە تاش بۆ لای ئەو سێ کەسە چوو، یەکێکی گرت و بە ئاسنەکە وە کردیە کەباب و خواردی.

ڕۆژی دووەم لاوێکی دیکەی هەربەم شێوەیە خوارد و پاشان لێی نوست. ڕۆژی سێیەم دەرگای ئەشکەوتەکەی گرت و تەپە تاش ڕۆی. لای ڕۆژ ئاوا گەڕاوە بۆ کن ئەشکەوت. وەرزی بەهار دەست پێکرا بوو. بەفرەکان دەتوانەوە. تەپە تاش لاقی تەڕ ببوون. چوە دە ئەشکەوت لاقی بە ئاوری ڕاداشت کە وشک بنەوە. خەوی لێکەوت.

هیند باد ئاسنەکەی هەڵگرت و دە ئاگری نا تا سوور بۆوە. پاشان دە چاوی تەپە تاشی ڕاکرد. تەپە تاش دەستی بە هاوار کرد. هیند باد چوو دە نێو بزنەکاندا خۆی شاردەوە. تەپە تاش بە کوێرە کوێرە دەستی بەملاو لادا دەگێڕا کە هیند باد بدۆزێتەوە. نەیتوانی، زۆر تووڕە بوو، گوتی :« ڕاوەستە، سبەی دەت بینمەوە.»

بەڵام هیند باد چی کرد؟ بزنی پێش مەڕی دیتەوە، سەری بڕی، کەوڵی کرد و چوو دە پێستی بزنەکە و سەری بزنەکەی بە شێوەیەک لە سەر سەری خۆی ڕاگرت و لە سەر دەست و لاقان وەک حەیوان ڕاوەستا. کە بوو بە ڕۆژ، تەپە تاش لە پێش دەرگای ئەشکەوت ڕاوەستا و لاقی لە بەر یەک بلاو کردن. هەموو بزنەکان بە نێو لاقانیدا تێپەڕین و بە باشی دەستی لێدەدان کە هیند باد لە نێویاندا نە بێت و ڕانەکات. هیند باد زەنگوڵەی پێشڕەوی دە ملی خۆی کرد بوو. بە چوار دەست و پێ بۆ لای تەپە تاش چوو. تەپە تاش دەنگی زەنگوڵەی بیست و گوتی: « ها پێشبڕەو، ئەوە تۆی، وەرە بڕۆ» هیند باد بە نێو دوو لاقی تەپە پاش دا تێپەڕی و هاواری کرد: « ئەی تەپە تاش. من لە دەستانت هەڵاتم.»

تەپە تاش وەدوای کەوت، هیند باد هاواری دەکرد:« وا لێرەم»

تەپە تاش بە دەنگییەوە دەچوو. بەردێکی گەورەی لە سەر ڕێگا بوو. تەپە تاش کە ڕایدەکرد، خۆی لە بەردەکە دا ، وەها کەوت و بریندار بوو، لە جێوە مرد.

هیند باد لەوێ ڕۆیشت، توشی سوارێک بوو. سوار پرسی:

– بۆ کوێ دەچی؟

– من دەچمە گوندی، تۆ بۆ کوێ دەچی؟

سوار وەڵامی داوە:« تەپە تاش کە سواری من بوو مردوە، دەڕۆم تا شوانێکی دیکە پەیدا کەم بزنەکانم بلەوەڕێنێ. وەرە بچینە ماڵی من، تا ڕێی کورت و سەر بڕت نیشان بدەم. ئەو ڕێیەی تۆ گرتووتە. زۆر درێژە.

هیند باد بە دوای سوار دا کەوتە ڕێ و لێی پرسی:

– ناوی تۆ چیە؟

سوار جوابی داوە و گوتی :« ئەحمەد بەفرم پێ دەڵێن. چوونە ماڵ و هیند باد

تەماشای کرد سەری ئینسانێک لە زێڕ و زێو دە گەردنی خانمی ماڵ دایە. منداڵێکی دوو ڕۆژە دە بەفرێدا نوستوە و لە قوژبنێکی ماڵە کە پیرە مێردێک دانیشتوە کە هەر تک لاقی تا ئەژنۆ بڕاونەوە. پەنجەی هەموو مریشکەکانیش بڕاونەوە.

ئەحمەد بەفری خواردنی بۆ هیند باد هێنا. هیند باد گوتی : « هیچ نا خۆم »

– بۆ ناخۆی ؟

– لە پێشدا بێژە لەم خانوەدا چ ڕادەبرێ؟ ئەو سەرە ئینسانەی دە گەردنی ژنەکەت دایە چیە؟ ئەم منداڵە بۆ دە بەفرێدا نوستوە.؟ لاقی پیرە مێرد بۆ بڕاونەوە و پەنجەی مریشکان بۆ بڕاونەوە.؟

تائەمڕۆ کەس غیرەتی ئەوەی نە بوە ئەم پرسیارانەم لێ بکات. ئێستا کە تۆ هێندە ئازای، منیش وەڵامت دەدەمەوە.

– هەر نۆکەرێکی دەیهێنمە ماڵێ، خێزانم دەستی دەگەڵ تێکەڵ دەکا. بەم بۆنەوە پیاوێکی کەچەڵ و پیس و بۆگەنم هێنا ماڵێ کە ژنەکەم ناخۆشی بوێ و لێی بێزار بێ. بەڵام دیتم لە گەڵ ئەویش دەستی پێکردوە. ڕۆژێ بەو نۆکەرە پیسەم گوت:« تەنافێک هەڵگرە بچین قامیش بێنین.» بۆ قامیشەڵان چووین. لە وێ نۆکەرم کوشت و لاشەکەم فڕێدا. دە پازدە ڕۆژ ڕابرد. ڕۆژێ چوومە کن ژنەکەم دیتم بۆنێکی پیسی لێ دێت. بە خۆم گوت: « ئەم بۆنە پیسە لە کوێ دێت؟» ئەو کە هەمیشە خاوێنە. دەستی ژنەکەم گرت و کێشام، سەری کەچەڵەی لە بن هەنگڵی بەر بۆوە. هەمووی ڕزیبوو. کرمی تێدا بوو. بە ژنەکەم گوت:« ئەو سەرە دە زێڕ و زێو بگرێ و دەئەستۆی خۆی بکات.

باشە. ئەم منداڵەی دە بەفرێدا نوستوە کێیە ؟

– ئەو کوڕی منە. سێ ڕۆژە دە بەفردا خەواندوومە تا بزانم بە ڕاستی کوڕی منە یا نا. ئەگەر کوڕی من بێت زیانی پێ ناکات، بەڵام ئەگەر کوڕی کابرای کەچەڵ و پیس بێ، بلا گیانی دەر بچێ. ئەمڕۆ سێیەمین ڕۆژە، دیارە کوڕی خۆمە.

هیند باد چوە کن منداڵەکە و هەڵیگرت و دای بە دایکی. پاشان زنجیرەکەی لە

ملی ژنەکە پساند و سەری مردوەکەی گرێدا و بە ئەحمەد بەفری گوت:
– شەرم بکە، ئەوە چکارێکە؟ ئێستا پێم بڵێ بزانم ئەو پیرە مێردە چیە ؟
– ئەو پیرە مێردە بابی منە. ئەگەر ڕۆژێک پاروە نانێکم دابا بە فەقیرێک، بابم دەچوەماڵی کابرای فەقیر و زۆر زیاتری لەوە دەخوارد کە من پێم دابوو. ئەمنی ریسوای چاک و خەراب کرد. ئەوەتا لاقم بڕیونەوە.
هیندباد پرسی: « پەنجەی ئەو مریشاکانەت بۆ بڕیوەتەوە.؟
– چونکە هەر جارەی گەنمم دابا بە جیرانان، مریشکەکانم دەچوون گەنمەکەیان دەخوارد. ئێستا پەنجەم بڕیونەوە، چەندی دەخۆن گەنمیان لە پێش ڕۆ دەکەم و ناتوانن جیرانەکان ئازار بدەن.
هیند باد گوتی : « ئافەرین کارێکی چاکت کردوە.
ئەحمەد بەفری ڕێگایەکی سەر بڕی بە هیند باد نیشاندا، ئەویش خوا حافیزی کرد و کەوتە ڕێ. تا گەیشتە جوتیارێک کە حیسان خۆر بوو. کابرای حیسان خۆر هاواری کرد:« باش بوو ، گایەکم هەبوو، ئێستا یەکی دیکەشم بۆ پەیدا بوو. ئەوەی گوت و هیند بادی گرت و بردی دەجوتی کرد. هیند باد لە گایەکەی دی پرسی کە ئەویش هەر زەلام بوو: « ئەو پیاوە کێیە؟»
– پیاوێکی حیسان خۆرە. ئێستا تا گیانمان لە بەدەن دایە دەبێ ئامورر بکێشین و زەوی بۆ بکێڵین.
– باشە، کەنگێ کارمان تەواو دەبێ.؟
– کاتێ باران باری کابرای حیسان خۆر تەڕ دەبێ و دەچێتەوە ماڵ. ئێمە لە نیر وئامور دەکاتەوە. ڕۆژێکی تر دەمانبەستێتەوە.
هیند باد گوتی: « کە وایە وەرە دوعا بکەین باران بباریێ. دوعایان کرد و باران دایدایە. کابرای حیسان خۆر ئاموری لێکردنەوە و خۆی چۆوە ماڵ. هیند باد هەلات. دەبوایە بە سەر پردێکدا بپەڕێتەوە. کە ئاردیان بە سەر وەر کرد بوو تا شوێن پێ دیار بێ. هیند باد خۆی پێخواس کرد و پاشە و پاش پەڕیەوە و هەلات. خاوەن جوت هات دیتی هیند باد دیار نیە. بۆ لای پردێ چوو. دیتی شوێن پێ دیارە بەلام ئەگ بۆ دەردوە. بە دەستی خاڵی گەڕایەوە.

هیند باد دەڕۆی تا گەیشتە شارێک و لە ماڵێکی بوو بە کرێکار. خاوەن ماڵ کیژێکی وەک مانگ جوانی هەبوو. ڕۆژێ خاوەن ماڵ بە هیند بادی گوت:« وەرە کیژەکەی من بێنە و ببە کوڕی من و لە ماڵی من بژی.

هیند باد ڕازی بوو، کچەکەی هێنا و لەو ماڵە دەژیا. ڕۆژێک دەنگی دەهۆڵ و زوڕنا دەهات. پرسی: ئەوە چیە ؟ بووکە ؟

- نا، بوک نیە. لێرە ئەگەر مێرد بمرێ. ژنەکەی لە گەڵ دە قەبری دەنێن. ئەگەر ژنیش بمرێ پیاوەکەی لەگەڵ دەخەنە قەبر. ئێمە ئەشکەوتێکی قوڵمان هەیە، مردوەکان دەخەینە وێ.

هیند باد پرسی: ئەوە دابی ئێوەیە ؟

- بەڵێ. ئەوە دابمانە . پاش ماوەیەک ژنی هیند باد نەخۆش بوو. مرد. مەیتەکەیان شوشت و کفنیان کرد و لە سەر تابوتێکیان دانا. دەست و پێی هیندباد یشیان بەست لە کن مەیتی ژنەکەی درێژیان کرد. خواردنی چل ڕۆژیشیان لە کن دانا وبۆلای ئەشکەوت چوون. هیند بادیان لە گەل مەیتەکە بەرداوە قولایی ئەشکەوتەکە. لەوێ ئیتر رێگای هاتنەدەرێ نەبوو.

مانگێک پێچوو دەنگی دەهۆڵ و زوڕنای گوێ لێبوو. هیند باد دوعای کرد: خودایە مردوو بێت.

دوعای قبوڵ بوو. کاتێکی پیاو و ژن و خواردەمەنیان دە ئەشکەوتێ هاویشت، دەر کەوت کە مێردە مردوە. هیند باد هەر لەوێ ژنەکەی هێنا. هیند باد لێی پرسی:« تۆ کێی ؟»

- من بوکی پاشام . فتیلەیەکیان هەبوو لە پڕ کوژایەوە. لە تاریکی تەماشایان کرد لە دوورەوەی ئەشکەوت ڕوناکیەک دیارە و کونێکیشی لێیە. لەو کونە نیزیک بوونەوە دیتیان بۆ لای دەریا دەکرێتەوە.

هیند باد گوتی؛« وەرە خۆمان بخەینە دەریا.» دەستی یەکتریان گرت و خۆیان دە دەریا هاویشت، تەختە دارێکیان دیتەوە، لەسەری دانیشتن و لە دەریادا ڕۆیشتن.

ژنەکە پرسی : « لەم دنیایە وەزعی کەس لە ئێمە دژوار تر هەیە.؟

– وەزعی ئێمە خەراب نیە. لە سەر ئەم تەختە دارە دانیشتووین، بە سەر ئاو دا دەڕۆین. ئاو لە سەر خێزە و سوپاس بۆ خوا خێزیش نابزوێ. وەزعی ئەو نەخۆشە خەرابە کە لە شارێکی چۆڵ و وێران ماوەتەوە. گیان لە بەری تێدا نیە نەخۆش و کەوتوو چاوە ڕوانە بەڵکوو کەسێک پەیدا بێ و قومە ئاوێکی بداتێ. وەزعی نەخۆشێکی ئاوا زۆر لە ئێمە خەرابترە.

پاش ماوەیەک ژنەکە جارێکی دیکەش گوتی:« بە ڕاستی بڵێی وەزعی هیچ کەس لەم دنیایە لە هی ئێمە خەرابتر بێ.؟

– وەزعی ئێمە کە خەراب نیە. وەزعی ئەو لاوانە دژوارە کە پێکەوە کۆ بوونەوە کەیف بکەن و جێژنێک بگرن و لە نەکاو چرایان دەکوژێتەوە و سیمی سازەکەشیان دەپسێ. وەزعی ئەوانە دژوارە. دەنا وەزعی من و تۆ هێندە دژوار نیە.

لەو کاتەدا ماسییەک هاتە ژێر تەختەکە و ئەوانی بردە ڕۆخی دەریا. هێند باد ژنەکەی بردە ماڵ و بە خۆشی و شادی ژیان.

## ئینسانێکی شکڵ گورگ ٦٢

پیاوێکی فەقیر کیژێکی جوانی هەبوو. لە وڵاتێکی دیکەش لاوێک دەژیا، کوڕێ کابرایەکی دەوڵەمەند بوو. لاوەکە شەوێک کچی کابرای فەقیری هاتە خەو ئاشقی بوو. ئەم لاوە هەموو ڕۆژێ بەیانی دەبوو بە گورگ و کاتی ڕۆژ ئاوا پێستی گورگی دادەکەند وجارێکی دیکە دەهاتەوە سەر شکڵی ئینسان. کاتێ کیژەکەی لە خەو هات ، خۆی بۆ سەفەر ساز کرد و وەدوای کەوت.
ئاخرەکەی گەیشتە دەرکی ماڵی کابرای فەقیر و بانگی کرد:« یا کیژەکەتانم بدەنێ و یا دەتان خۆم،»
دایکو بابی پیری کیژەکە سەریان لێ شێوا و نەیاندەزانی چ بکەن. هەم نەیاندەویست کیژەکەی بدەنێ و هەم لە گورگ دەترسان. لە ئاخردا بە ناچاری کیژەکەیان دایە.
بابی کچەکە گریا و گوتی: ئێستا کیژەکەمان لە کوێ بدۆزینەوە؟ لە دەستمان چوو.
گورگ گوتی:« چل ڕۆژ بۆ هیچ کوێ مەچن. پاش چل ڕۆژ بە لای ڕاست دا ڕێگا داگرن و بڕۆن و بڕۆن تا لە شەش مێگەلە مەڕ تێپەڕ دەبن، کە لە وان تێدە پەڕن، من دەبیننەوە.ژن و مێردی پیر باوەڕیان بە قسەی ئەو نە کرد و لە دڵدا فیکریان کردەوە کە : « ئاخر گورگە و کیژەکەمان دەبا و دەیخوا!»
پیرە مێرد بە پیرێژنێی گوت:« حیسابی چل ڕۆژە ڕابگرە و بیژمێرە.»
پیرێژن گریا و جوابی داوە:« کچەکەمان لە کیس چوو، گورگ خواردی . »
پیرە مێرد گوتی :« خەمێ مەخۆ. ئەوە بە ڕاستی گورگ نیە. ئەگەر گورگ بایە

به زمانی ئادەمیزاد قسەی نەدەکرد.»
کاتێ چل ڕۆژ ڕابرد کەوتنە ڕێ. ڕۆیشتن لە نەکاو مێگەلە مەڕیان دێت و پرسیان :
- ئەو مەڕانە هی کێن ؟ وەلامیان دانەوە و گوتیان :« هی گورگە شەلەن»
کەیف خۆش بوون و ڕێگایان درێژە پێدا. مێگەلێکی دیکەیان بینی. پیرە مێرد گوتی:« باشە، ئیتر هومێدێک هەیە. من پێتم گوتی خەمێ مەخۆ.»
کەمێکی تر ڕۆیشتن دیتیان گایەک لە مێرگێکدا دەلەوەڕێ. گیا و لەوەڕێکی زۆرە. بەلام گایەکە کزە. برێکی تر ڕۆیشتن گایەکی دیکە لە شوێنێکی قاقڕ و وشک و بێ گیا ڕاوەستاوە. دەور و بەری هیچ گیا و لەوەڕی لێ نیە. بەلام گایەکە قەلەو و بە کەیفە. پیرە مێرد و پیرێژن سەریان سوڕ ما و گوتیان سەیرە لە نێو ئەو مێرگ و لەوەڕە دا گای لاواز وێستاوە و لە زەوی قاقڕ و وشکارۆدا گای قەلەو وێستاوە.
برێکی تر ڕۆیشتن. دوو داریان دیتن کە بلبلێک لە سەر دارێکەوە دەچێتە سەر دارێکی دیکە. لە سەر هەر دارێک دەنیشێ، دارەکە سەوز دەبێ. کە لە سەر دارەکە فڕی، دارەکە وشک دەبێ.
دیسان کەوتنە ڕێ و ڕۆیشتن. لە شەش مێگەلە مەڕەکە تێپەڕین و دیتیان سێ کوپە لە ژێر دلۆپە ئاوێک ڕێز کراون دلۆپە ئاودکە دەکەوێتە نێو کوپەی یەکەم، لە و کوپە دەپەڕێتەوە بە سەر کوپەی نێوە ڕاست دا دەکەوێتەوە نێو کوپە سێیەم. کوپەی نێوە ڕاست بێ ئاو دەبێ.
دیسان کەوتنە ڕێ. لە شەش مێگەلە مەڕ تێپەڕین و لە نێوە ڕاستی سەحرایەکی سەوز دا، کۆشکێک هەیە و ژنێک لە کۆشک هاتە دەر گەنم بۆ ئاش دەبات،
پیرە مێرد و پیرێژن لێیان پرسی:« ئەم کۆشکە هی کێیە. ؟
ژنەکە جوابی داوە: « هی گورگە شەلەیە.»!
پیرێژن و پیرە مێرد زۆر کەیف خۆش بوون و بە خۆیان گوت: دیارە گورگ کیژەکەمانی نەخواردود و ڕاستی بە ئێمە گوتود.»!

بەڵام کیژەکە چاوەڕوانی دایک و بابی بوو و دیتی وا دێن. لیباسیان کۆن و شڕ و دڕاو بوو. بە خزمەتکاری خۆیاندا لیباسی تازەیان بۆ ناردن، دەبەریان کرد و چوونە کۆشک. کچەکە بە پێشوازیانەوە چوو. یەکتریان لە ئامێز گرت و یەکتریان ماچ کرد. چل ڕۆژ لە کۆشک دا ژیانیان بردە سەر. لە ئاخر دا ویستیان بگەڕێنەوە. کچ و زاوا بەریان نەدەدان. دایک و بابی کیژەکە پێیان داگرت و دەیانگوت:« دەبێ بچینەوە »

زاواکەیان ئەسپێکی ئاوی هەبوو. ئەو ئەسپەی لە زێڕ و زێو بار کرد، پیرێژن و پیرە مێردیان سوار کرد و خستیاننە ڕێ.

زاوەکەیان گوتی:« ئاگاتان لە خۆ بێ ئاوڕ نەدەنەوە و هەوساری ئەسپەکەش بەر نەدەن و نەیخەنە سەر ملی ئەسپەکە. ئەسپ خۆی ئێوە دەگەیێنێتەوە ماڵی خۆتان.

سواری ئەسپ بوون و قسەکانی زاوایان لە بیر چوو. ئاوڕیان داوە. ئەسپ لە عەردی دان و لێیان دوور کەوتەوە. پیرەکان ڕاست بوونەوە و خورجێنی زێڕ و زێویان هەڵگرت و بە پێ کەوتنە ڕێ.

لە ڕێگا توشی مەلایەک بوون و ئەوی دیتبوویان لە داستانی گایەکانەوە بگرە تا مەسەلەی دارەکە و کویەکانیان بۆ گێڕایەوە و ماناکەیان لێ پرسی.

مەلا بیری کردەوە و گوتی:« ئەو گایەی کە لە نێو مێرگ و لەوەڕگادا بینیتان و کز بوو، ئەوە کابرای دەوڵەمەندە کە هەمیشە دە خەمی ئەوە دایە پارەکەی لە کیس بچێ. هەمیشە نیگەرانی ئەوەیە. هیچ نا خوا و نا خواتەوە، بۆیە کز و لاوازە. بەڵام گای دووەم کابرای فەقیرە. لە فیکری هیچ شتێ دانیە. هەر چی دەیبێ دەیخوا وناسودەیە.

بلبل و دوو دارەکە. پیاوێکە دوو ژنی هەیە. کە دەچێتە کن ژنێک ئەو ژنە بە کەیف و خۆشحاڵ دەبێ، ژنەکەی دیکە خەمگین دەبێ. بەڵام سێ کویەکە: سێ دراوسێن. ئەوەی نیوە ڕاست جیرانێکی خەرابە. لە گەڵ هیچ کەس سەلام وعەلێکی نیە و قسە ناکا. بەڵام دووەکەی دیکە پێکەوە دۆست و میهرەبانن.

پیرە مێرد و پیرێژن لە مەلایان ویست:« چبکەین و چ شتێکت بدەینێ کە ڕازی

و خۆشحاڵبی.»

مەلا کیسەیەکی بچوکی بۆ درێژ کردن و گوتی :« ئەو کیسەیەم بۆ پڕ کەن،بەسمە.

پیرە مێرد زێڕ و زێوی دە کیسە کرد، دیتی هەر تێی دەکا و پڕ نابێ. مەلا کیسەی سەر نخون کردەوە و هەر چی زێڕ و زێوی تێدا بوو ڕشتیە خوارێ، تەنیا یەک سکەی تێدا هێشتەوە و خۆڵی بە سەر داکرد و کیسە پڕ بوو.

مەلا گوتی:« ئەو کیسەیە حوکمی چاوی ئادەمیزادی هەیە. هیچ سەروەت و سامانێک پڕی ناکا، جگە لە خاکی گۆڕ.

پیرەکان خوا حافیزییان لێکرد و بۆماڵێ گەڕانەوە و بە خۆشی و ئاسودەیی ژیانیان بردە سەر.

پێرستی سەر چاوەکان و ناوی ئەو کەسانەی کە ئەفسانەکانیان گێڕاوەتەوە.(
بە گوێرەی ژمارەی ئەفسانەکان.)

١- ئەفسانەکانی ژمارە ١ و ١٧ و ٤٤ و ٤٥ و ٤٧ و ٤٨ و ٥١ و ٥٧ لە مەمۆ
ئیشخانە سادۆ» وەر گیراون. ناو براو ساڵی ١٩٢٤لە گوندی مێرگ لە
ئەرمەنستانی شورەوی لە دایک بوە. دایک و بابی لە کوردەکانی تورکیا بوون.
خۆی لە تقلیس دەژی. کولتوری گشتی کورد باش شارەزایە. گەلێک ئەفسانە
وحکایەت و قسەی خۆشی عامیانەی لە بەرە. دوو کلاس دەرسی خوێندوە و
دەرکەوانە.
٢- ئەفسانەکانی ژمارە ٢ و ٨ و ١٠ و ١١ و ١٢ و ١٨ و ١٩ و ٢٣ لە « خامۆ
حەسەن» وەر گیراون. ناو براو ساڵی ١٩٢٩ لە گوندی جرجریس لە
ئەرمەنستانی شورەوی لە دایک بوە. دایک و بابی کوردی تورکیا بوون، ئێستا
لە تفلیس دەژی. خامۆ حەسەن شایەرێکی هونەرمەند و گۆرانی بێژە. موسیقا
لێدەدا و حکایەتیش دەڵێ. گۆرانی و چیرۆک و ئەفسانەی زۆر دەزانێ.
خوێندەوار و کرێکاری کارخانەیە.
٣- ئافسانەکانی ژمارە ٣ و ٢٤ و ٢٦ لە « زادە وەسمان» وەر گیراون. ناو
براو ساڵی ١٩٣٣ لە گوندی مێرگ لە ئەرمەنستانی شورەوی لە دایک بووە .
دایک و بابی کوردی تورکیا بوون. ئێستا لە تفلیس دەژی. ئەفسانە و حکایەت
ونەقلی زۆر دەزانێ. خوێندەوارە و کرێکارە.
٤- ئەفسانەکانی ژمارە ٤ و ٥ لە « عەتار شاهۆ» شاعیری بە ناو بانگی کورد
وەر گیراون. ساڵی ١٩٠١ لە تورکیا لە گوندی سورمالی لە دایک بوە. ئێستا لە
ئێرەوان دەژی
٥- « ژنی ئاقڵ» لە قسەکانی « مۆرۆیە خواجۆ» یاد داشت کراوە. ئەو ساڵی
١٨٩٢ لە گوندی سەعیدی بەگ لە تورکیا ویلایەتی« وان» لە دایک بوە. ئێستا لە
تفلیس دەژی. نەخوێندەوارە.

٦ « ژنی خەراب » لە قسەکانی « کرمانە وەسمان» یاد داشت کراوە. ئەو ساڵی ١٨٨٧ لە ناوچەی قارس لە دایک بوە. ئێستا لە تفلیس دەژی، نە خوێندەوارە.
٧ - « ژن و مێرد » لە قسەکانی « شا میرزا موسا رەزا » یاد داشت کراوە. ئەو ساڵی ١٩٠٧ لە خوراسان ( ئێران) لە دایک بوە. ئێستا لە ئیشقاباد دەژی. نە خـوێندەوارە. یەکێ لە باشـتـرین وێژەری داسـتـانی مـیللی وگـۆرانی بێـژە. شیعرەکانی جەفەر قولی شاعیری کورد زۆر باش دەخوێنێ.
٨- ئەفسانەکانی ژمارە: ١٣ و ٣٢ و ٣٣ و ٥٢ و ٦١ لە « باباسی چاچان» وەر گـیـراون. ئەو سـاڵی ١٨٨٨ لە ناوچەی قـارس لە دایک بوە. سـاڵی ١٩١٤ لە ئەرمەنستانی شوروەوی لە گوندی« چویان قرمز» ژیاوە، پاشان چۆتە تفلیس و نە خوێندەوارە.
٩ - « کیژی ئاقڵی پاشا » لە قسەکانی « سولتان ئاغا هەمزە» وەر گیراوە. ئەو ساڵی ١٩٠٩ لە گوندی ملیان ( ئێران) لە دایک بوە. ئێستا لە گوندی باغر لە ناوچەی ئیشقاباد دەژی، خوێندەوارە و لە مەزرای دەوڵەتی کار دەکات.
١٠ - ئەفسانەکانی ژمارە ١٥ و ٣٤ و ٣٦ لە « عەتارد شارۆی» وەر گیراوەن
١١- ئەفسـانەکـانی ژمـارە :١٦ و ٢٠ و ٢١ و ٢٧ و ٣٧ و ٣٨ و ٣٩ و ٤٠ لە « شەمیل عەسکەر» وەر گیراون. ناو براو ساڵی ١٩٢٩ لە گوندی ئاخچە کەند( کۆماری ئازربایجانی شورەوی) لە دایک بوە ئێستا لە گوندی کێل بجار( ئازەر بایجـانی شـورەوی) دەژی . دایک و بابی ئەو لە ئێـران بوون. ئەو پیـاوێکی لێهاتوو، بە زەوق و خوێندەواریی ڕیازی و وشە ناسی هەیە. شاعیر و وەرگێڕ و هونەر مەندە، لە گەڵ کلتور و کەلە پوری کورد شارەزایی هەیە.
١٢ - ئەفسانەکانی ژمارە: ٢٢ و ٢٥ و ٢٩ و ٣٠ و ٣٣ و ٥٤ لە « سمایل سادق » وەر گـیراون. ناو براو سـاڵی ١٨٨٩ لە ناوچەی قـارس لە دایک بـوە. سـاڵی ١٩١٥ لە تفلیس دەژیا. شارەزای ئەفسانە کوردییەکان بوە.
-١٣ « نۆکەری ئاقڵ » لە « قوربانەلی شیروانی»( پەهلەوی) وەر گیراوە. ئەو ساڵی ١٨٩٥ لە شیروان ( ئێران) لە دایک بوە. لە درماری دەژی . مامۆستا بوە. کتێبی دەرسی بە زمانی کوردی داناوە.

١٤ - « چۆن بالولی زانا فێڵی لە حاجی بە تەماع کرد » « مەڕالی مەهدی ئۆف» وەر گیراوە. ئەو ساڵی ١٩٠١ لە گوندی ئاخچە کەند ( ئازەربایجانی شورەوی) لە دایک بوە. هەر لەوێ دەژی . ئەو لە ئێرانبوە. خوێندەواری کەمە. لە مەزارای هەرەوەزی کار دەکا.

١٥- « یوسوپ » لە « ریز گویە ئاغا » وەر گیراوە. ناو براو ساڵی ١٩٠١ لە ناوچەی قارس لە دایک بوە. ئێستا لە تفلیس دەژی. ئەفسانەی زۆری لە بەرە. شارەزایە بە داب و نەریتی کوردی.

١٦ - ئەفسانەکانی ژمارە: ٤٢ و ٥٨ و ٦٠ « لە خانم « دلبەر قوربانۆا » وەرگیراون. ناو براو ساڵی ١٩٢٥ لە خوراسان ( ئێران) لە دایک بوە. ئێستا لە فیروزە دەژی، دوو کلاسی دەرسی خوێندوە. داستانی زۆر و گۆرانی و ئاوازی پرسەی لە بەرە.

١٧ - ئەفسانەکانی ژمارە: ٤٦ و ٥٩ لە « نەزەر ئەحمەد » وەر گیراون. ناو براو ساڵی ١٩٠٧ لە گوندی زەنگلان ( ئێران/ لە دایک بوە. ئێستا لە شاری ماری دەژی، نە خوێندەوارە، ئەفسانە و نە قڵ و نەزیرەی زۆر دەزانێ

١٨- « دوو دەستە برا » لە قسەکانی « شەمیل حەمید » وەر گیراوە. ئەو ساڵی ١٩٢٥ لە گوندی مێرگ( ئەرمەنستانی شورەوی) لە دایک بوە. دایک و بابی خەڵکی ناوچەی قارس بوون. ئێستا لە تفلیس دەژی. خوێندەوارە و حەمباڵی دەکا.

١٩ - « میرزا مەحمود و هەزاران بلبل » لە قسەکانی « یوسوپ خواجالو» وەر گیراوە. ئەو ساڵی ١٩١٦ لە ناوچەی قارس لە دایک بوە. ئێستا لە گوندی کریخ بوغاز لە ناوچەی ئبران دەژی و خوێندەوارە.

٢٠ - « تلی هەزار » لە قسەکانی « عەلی جنگۆ » ودر گیراوە. ناو براو لە ساڵی ١٩٢٧ لە گوندی جرجریس( ئەرمەنستانی شوروی) لە دایک بوە. دایک و بابی لە تورکیان ئێستا لە تفلیس دەژی. خوێندەوار و شۆفیرە، ئەفسانە و داستانی زۆر دەزانێ.

٢١ - « دەروێش » « شاروی خودو» وەر گیراوە. ناو براو لە ساڵی ١٩٣٠ لە

گوندی سنگر( ئەرمەنستانی شورەوی) لە دایک بوە. لە تفلیس دەژی. دایک و بابی لە تورکیان. خوێندەوارە.

٢٢- « حەوت برایان » لە « زبێدە خان قولی یوڤا » وەر گیراوە. ناو براو لە ساڵی ١٨٩٦ لە خوراسان ( ئێران) لە دایک بوە. ئێستا لە فیروزە دەژی. نە خوێندەوارە.

٢٣- « ئینسانی شکڵ گورگ » لە خانم « میگل موسا رەزا یۆڤا » وەر گیراوە. ناو براو ساڵی ١٩١٨ لە باغر( ناوچەی ئیشقاباد) لە دایک بوە. ئێستا لە ئیشقاباد دەژی. دایک و بابی لە خوراسانی ئێران بوون، نە خوێندەوارە.

# بەرهەمە نووسراوەکانی نووسەر

١- کاروانێک لە شەهیدانی کوردستانی ئێران
٢- وەڵامێک کوردیِ و فارسی
٣- ڕێنوێنی شەڕی پارتیزانی
٤- لە دەوری ڕێکخراوی لاواني حیزبي دێموکرات کۆ بینەوە
٥- ڕەخنە و لێکۆڵینەوە لە سەر کتێبی حوسێنی مەدەنی
٦- چەند قسەیەک لە گەڵ خەبات
٧- کورد و فەرهەنگی بێگانە
٨- لێکۆڵینەوەی (کورتە باسێک لە سەر سۆسیالیزم) کوردی و فارسی
٩- تایبەتی کۆنگرەی شەشەم
١٠- کۆماری دێموکراتی کوردستان یا خود موختاری
١١- یادی هێمن
١٢- لە پێناو چی دا ؟
١٣- بادانەوە
١٤- کرِ و کاش
١٥- سەفەر بۆ کوردستان
١٦- لە بیرەوەرییەکانم بەرگی: ١-٢-٣-٤-٥-٦-٧-٨-٩-١٠-١١
١٧- پێدا چوونەوە،بەرگی یەکەم:(بزووتنەوەی نیشتمانی لە کوردستانی ئێران)
١٨- حیکایەت کردن یا نووسینی مێژوو ی عەبدوڵای حەسەن زادە
١٩- پێدا چوونەوە، بەرگی دووەم:(بزووتنەوەی نیشتمانی لە کوردستانی ئێران
٢٠- گەشتێک بە نێو بیرەوەرییاندا
٢١- کورد لە گەمەی دەوڵەتانی زلهێز و حکوومەتانی ناوچە دا

## ئەو بەرهەمانەی نووسەر کردوونی بە کوردی:

١- دایک - ماکسیم گۆرکی

٢- ژیان و کردەوەکانی لینین

٣- ئەفسانە کوردییەکان - ڕۆدینکۆ

٤- زەوی بچووک - برێژنێف

٥- کۆمەڵە چیرۆکی هەڵبژاردە لە ئەدەبی بێگانە

٦- مەسەلەی کورد لە پارلمانی سوید

٧- پاسای بنچینەیی ئابووری سۆسیالیستی - چاپ نەکراوە

٨- حەمە چکۆڵ - ئینجە مەمەدی یاشار کەماڵ- چاپ نە کراوە

٩- ئوسولی سەرەتاییەکانی فەلسەفە - ژۆرژ پۆلستێر - چاپ نە کراوە

١٠- نامەی گوللە بارانکراوەکان - چاپ نە کراوە

١١- ڕەوشی کوردان - مێژووی ئەردەڵان و بابان

١٢- ئازادی یا مەرگ - کازانتزاکیس

١٣- مەسەلە و زار گۆتنی لوڕی

١٤- ڕۆژەکانی ئێران - ئارچی باڵد ڕۆزڤێلت

١٥- لە کوردستانی عیراقەوە تا ئەو بەری ئاراز( ڕێ بڕینی مێژوویی بارزانیەکان)